# کچەی پرتەقاڵ

نوسینی؛ یۆستاین گاردەر
وەرگێڕانی لە دانیمارکیەوە؛ بەهرۆز حەسەن

دەقە کوردیەکە پێشکەشە بە هەموو خوێنەرانی گاردەر و بەتایبەتیش پێشکەشی هەموو عاشقێکی دەکەم... بەهرۆز حەسەن

یانزە ساڵ لەمەوبەر باوکم مرد. من ئەو کاتە تەمەنم چوار ساڵبوو و لەو بڕوایەشدانەبووم چیتر هیچ هەواڵێکی ببیستمەوە، کەچی وا ئێستاکە پێکەوە کتێبێک دەنوسین.
ئا ئەم دێڕانە سەرەتای ئەو کتێبەیە و من دەیاننوسمەوە، بەڵام هێدی هێدی باوکیشم دێتە قسە. لەڕاستیدا ئەو زیاترێک دەگێڕێتەوە.
بەدڵنیاییەوە نازانم تا چ ڕادەیەک باوکمم بەوردی دێتەوە یاد... لەڕاستیدا من چەندەها کەڕەت تەماشای ئەو وێنانەم کردووە کە ئەوی تێدان، ڕەنگە هەرلەبەر ئەوەش بێت کە وا هەستدەکەم لەبیرم بێت.
بەڵام تەنها یادوەریەک کە هیچ گومانێکم لێی نیە و چەسپاوە لە مێشکمدا، ئەوەیە کە کەڕەتێکیان لە بەرهەیوانەکە دانیشتبووین و تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمانمان دەکرد.

لە یەکێک لە وێنەکاندا من و باوکم لە ژوری دانیشتنەکەماندا لەسەر قەنەفەیەکی چەرمی زەرد دانیشتووین. لەوە دەچێت باسی شتێکی خۆشم بۆ بکات. ئێستاکەش ئەو قەنەفەیەمان هەر ماوە، بەڵام چیتر باوکمی لەسەر دانانیشێت.
لە وێنەیەکی تردا لە هەیوانەکەماندا لەسەر جۆلانە سەوزەکە دانیشتووین. تا ئێستاکەش ئەو وێنەیە هەر لەوێدا هەڵواسراوە. ئێستاکە من لەسەر ئەو جۆلانە سەوزە دانیشتووم. هەوڵدەدەم جۆلانەکە نەجوڵێنمەوە، چونکە لە مەلەفێکی گەورەدا شت دەنوسم. دواتریش نیازم هەیە هەمووی لەناو کۆمپیوتەرە کۆنەکەی باوکمدا بنوسمەوە.
هەڵبەتە دەبێت باسی ئەو کۆمپیوتەرەش بکەم، بەڵام دواترێک دێمەوە سەر ئەو باسە.

من هەمیشە هێشتنەوەی ئەو هەموو وێنەیەم بەلاوە سەیربووە، چونکە وێنەکان هی سەردەمێکی ترن و سەر بەم کاتەی ئێستا نین.
لە ژورەکەمدا ئەلبومێکی پڕ لەوێنەی باوکمم پاراستووە، بەڵام لەسەرێکەوە پێم خۆش نیە ئەو هەموو وێنەیەی کەسێکم هەبێت کە چیتر لە ژیاندا نیە. لەسەر کاسێتی فیدیۆش وێنەی باوکمان هەیە. من کەمێک بەلامەوە سەیرە کە گوێم لە دەنگی دەبێت. باوکم دەنگێکی زۆر گڕی پێوەبووە.
نەنکم دەڵێت 'ڕەنگە واباشتربێت کە ڕێگەنەدرێت تەماشای کاسێتی فیدیۆی کەسێک بکرێت کە چیتر لە ژیاندا نیە، کەسێک کە چیتر لەناوماندا نازی، چونکە سیخوڕیکردنی مردووەکان شتێکی ناشیرین و هەڵەیە'.
لەسەر هەندێک لە کاسێتەکاندا دەنگی خۆشمی تێدایە. دەنگێکی ناسک و زیکنم پێوەبووە، هەر لە دەنگی بەچکەی باڵندەیەک دەچێت. ئەو کاتە بەم شێوەیە بووە؛ دەنگی باوکم گڕبووە و وەک "باس"بووە و منیش بە پێچەوانەوە تۆنێکی بەرزم هەبووە.

لەیەکێک لە فیدیۆکاندا جەژنی لەدایکبوونی مەسیحە، من لەسەر شانی باوکم دانیشتووم و دەمەوێت ئەستێرەی سەر دارەکە لێبکەمەوە. لەوێدا من تەمەنم تەنها یەک ساڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەریکە بتوانم لێیبکەمەوە و بۆ خۆمی بەرم.
هەندێ جار کە دایکم تەماشای فیدیۆکان دەکات، پاڵدەداتەوە و قاقای پێکەنین لێدەدات، هەرچەندە کاتی خۆی کامێرای فیدیۆکە بەدەستی خۆیەوەبووە و خۆی فیلمەکەی گرتووە. من بەجوانی نازانم کە تەماشای فیلمێکی باوکم دەکات و پێدەکەنێت. پێشم وانیە

باوکیشم حەزی لەوە بێت، ڕەنگە بڵێت ئەوە شتێکی نائاساییە و شکاندی یاساکانە.
لە کاسێتێکی تردا ڕۆژی جەژنی "پاک"ە و من و باوکم لەبەر خۆردا لەدەرەوەی خانوە هاوینەکەی "فێلستیۆلن"دا دانیشتووین، هەریەکەمان لەتێک پرتەقاڵمان بەدەستەوەیە. من بەبێ ئەوەی پرتەقاڵەکە پاک بکەم، خەریکم ئاوەکەی هەڵبلوشم. وابزانم باوکم دانیشتووە و بیر لە جۆرە پرتەقاڵێکی تەواو جیاواز دەکاتەوە. من هیچ گومانێکم نیە لەوە.

ڕێک لەدوای پشوی ئەو جەژنی پاکەوەبوو کە باوکم نەخۆشکەوت. بۆ ماوەی زیاتر لە شەش مانگ نەخۆشبووە و لەوە ترساوە بمرێت. وابزانم خۆی دەیزانی کە دەمرێت.
دایکم چەندەها کەڕەت بۆیگێڕاومەتەوە کە باوکم بەتایبەتی ئەوەی پێناخۆشبووە بمرێت و فریای ئەوەنەکەوێت بەتەواوەتی من بناسێت. نەنکیشم شتێکی لەو بابەتەی پێوتم، بەڵام ئەو بەشێوەیەکی نهێنیتر بۆی گێڕامەوە.
نەنکم هەمیشە کە باسی باوکمی دەکرد، بە دەنگێکی کەمێک سەیرەوە قسەی لەگەڵدا دەکردم، بەڵام وابزانم ئەوەش شتێکی هێندە سەیروسەمەرە نیە. نەنکم و باپیرەم کوڕێکی گەورەیان لەدەستچووبوو. من نازانم مردنی کوڕێکی گەورە چ هەستێک بەدایک و باوک دەبەخشێت. خۆشبەختانە هێشتا کوڕێکی تریان لە ژیاندایە. بەڵام نەنکم قەت لەکاتی تەماشاکردنی وێنە کۆنەکانی باوکمدا پێناکەنێت، بەڵکو هەروەک خۆی دەڵێت "دەمەوێت تەنها بەڕێز و سەرنجێکی زۆرەوە دانیشم و تەماشایان بکەم".

پێموابێت باوکم لەلای خۆیەوە گەیشتبووە ئەوەی کە مەحاڵە بتوانیت بەشێوەیەکی جدی لەگەڵ کوڕێکی تەمەن سێ ساڵ و نیودا قسەبکەیت. ئەمڕۆکە بەتەواوەتی لە مەبەستی تێدەگەم، تۆش کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، پاش ماوەیەکی کەم لەوە تێدەگەیت.
وێنەیەکی باوکمم لەلایە کە لەسەر جێگای خەستەخانە پاڵکەوتووە. لە وێنەکەدا دەموچاوی زۆر لاوازە. منیش لەسەر ئەژنۆی دانیشتووم، دەستی گرتووم بۆئەوەی نەکەوم بەسەریدا. دەیەوێت بۆم پێبکەنێت. ئەو کاتە تەنها چەند حەفتەیەک بەرلە مردنی بوو. خۆزگە ئەو وێنەیەم هەر نەبوایە، بەڵام چی بکەم، تازە خاوەنی ئەو وێنەیەم و ناتوانم فڕێی بدەم. تەنانەت ناشتوانم لەشوێنێکدا داینێم و تەماشای نەکەم.

ئێستاکە من تەمەنم پانزە ساڵانە، وردترێک بیڵێم پانزە ساڵ و سێ حەفتەی تەواوم. من ناوم "جۆرج ڕیودە"یە و لە گەڕەکی "هوملەفای" ئۆسلۆدا لەگەڵ دایکم و "یۆرگن" و "مەریەم"دا دەژیم. یۆرگن زڕباوکمە، بەڵام هەر بەناوی خۆیەوە بانگی دەکەم. مەریەم خوشکە بچکۆلەکەمە. تەمەنی تەنها ساڵ و نیوێکە، زۆر منداڵە و لەبەرئەوە ناکرێت بەشێوەیەکی جدی قسەی لەگەڵدا بکرێت.
بێگومان هیچ وێنە یان کاسێتێکی فیدیۆی کۆنی باوکم و مەریەممان پێکەوە نیە. یۆرگن باوکی مەریەمە و من تاقانەی باوکمم.
لەکۆتایی ئەم کتێبەدا هەندێ زانیاری سەرنجڕاکێش دەربارەی یۆرگن دێتە پێشەوە. ئێستاکە ناتوانم بیانخەمە ڕوو، بەڵام ئەو کەسەی کە کتێبەکە بخوێنێتەوە دەیانبینێت.

ئەو کاتەی کە باوکم مردوە، نەنکم و باپیرەم بەمەبەستی یاریدەدانی دایکم هاتوونەتە لامان و هەموو شتەکانیان کۆکردۆتەوە. بەڵام شتێکی گرنگی تێدابووە کە هیچیان لەو کاتەدا نەیان بینیووە. ئەو شتەش چیرۆکێکی دوورودرێژبووە و باوکم بەرلەوەی لە خەستەخانەدا بکەوێت نوسیویەتی.
کاتی خۆی هیچ کەسێک نەیزانیوە کە باوکم چیرۆکێکی نوسیوە. چیرۆکی "کچەی پرتەقاڵ" هەتا ڕۆژی دوشەممەی پێشوو چاوی بەدونیا نەکەوت. ئەو ڕۆژە نەنکم خۆی کردبوو بە ژوری ئامێرەکاندا و لەوێدا لەناو ماشێنێکی پێشبڕکێی سوری سەردەمی منداڵیمدا چیرۆکێکی تەواوی دۆزیبووەوە.
بەڵام چی گەیاندبوویە ئەوێ؟ ئەوەیان کەمێک نهێنی تێدایە. بەڵام من لەوبڕوایەدا نیم هەروا بەڕێکەوت بووبێت، چونکە ئەو چیرۆکەی کە باوکم لەو کاتەدا نوسیبووی کە من سێ ساڵ و نیو بووبووم، پەیوەندیەکی بە ماشێنی یاریەوە هەیە. مەبەستم لەوە نیە کە چیرۆکەکەی چیرۆکێکی ئاسایی ماشێنی پێشبڕکێیە.. نا، باوکم ئەو چیرۆکە دوورودرێژەی بۆ من نوسیووە. باوکم چیرۆکی کچەی پرتەقاڵی بۆ ئەوە نوسیوە کە من لەکاتی گەورەبوونمدا بیخوێنمەوە، ئەو کاتەی کە توانای تێگەیشتنیم هەبێت. ئەو نامەیەکی بۆ دوارۆژ نوسیوە.

ئەگەر بەڕاستی باوکم کاتی خۆی ئەو هەموو کاغەزەی، کە چیرۆکە دوورودرێژەکەی لەسەر نوسیوونەتەوە، خنیبێتە ناو ماشێنێکی کۆنی یاریەوە، ئەوا دەبێت بەتەواوەتی دڵنیابووبێت کە نامەکەی دەگاتە دەستی خاوەنەکەی. بەبڕوای من کارێکی باشە گەر هەروا بۆ دڵنیایی هەموو شتە کۆنەکانمان بەوردی بپشکنین و ئەوجا بیانبەخشین بە کۆنەفرۆشێک، یان فڕێیاندەینە تەنەکەی خۆڵەوە.

کەس نازانێت چ جۆرە نامەیەکی کۆن و شتی لەو بابەتە لە شتە کۆنەکاندا حەشاردراون.
من لەم چەند ڕۆژەی پێشودا زۆر بیرم لەوە کردەوە. دڵنیام لەوەی کە شێوەیەکی ئاسانتر هەبێت بۆ ئەوەی لەڕێگەیەوە نامەیەک بۆ پاشەڕۆژ بنێرین و پێویست نەکات لەناو ماشێنێکی یاریدا بیشارینەوە.
بەڵام جارجارێک ڕوودەدات شتێک دەنوسین و حەزدەکەین دواتر لەپاش چوار کاتژمێر بخوێنرێتەوە، یان چواردە ڕۆژ یان چل ساڵ تێپەڕێت و ئەوجا بخوێنرێتەوە. چیرۆکی 'کچەی پرتەقاڵ' نامەیەکی لەو بابەتەبووە. بۆ "جۆرج"ی نوسیووە، کوڕەی دوانزە یان چواردە ساڵ، مەبەستم لەوەیە کە باوکم نامەیەکی بۆ ئەو کوڕەی نوسیووە کە نە قەت بەگەورەیی بینیبووی وە نە پێشیدەچوو لەداهاتودا بیبینێت.
بەهەرحاڵ ئێستاکە ئیدی کاتی ئەوەیە کە ئەو چیرۆکە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک دەستپێبکات.

حەفتەیەک لەمەوبەر لە وانەی مۆسیقاوە هاتمەوە بۆ ماڵەوە و بینیم نەنکم و باپیرەم بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هاتبوونە میوانیمان. لە "تیونسبێرگ"ەوە بە ماشێن هاتبوون و وابەتەمابوون شەوێک لەلامان بمێننەوە.
دایکم و یۆرگنیش لە ماڵەوەبوون، لەڕاڕەوەکەدا پێڵاوەکانم داکەند و وا دەهاتە بەرچاوم کە هەر چواریان بەپەرۆشەوە چاوەڕوانم بن. پێڵاوەکانم تەڕ و پیسبوون، بەڵام هیچ شتێکیان لەو بارەیەوە پێنەوتم. هەستمکرد شتێک لەئارادایە، هەر چواریان دانیشتبوون و

خەیاڵیان ڕۆیشتبوو و دیاربوو بیریان لە شتێکی تەواو جیاوازدەکردەوە.
دایکم وتی "مەریەم"مان خەواندووە'، لەوەدەچوو کارێکی هەر زۆر باشیان کردبێت، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی کە نەنکم و باپیرەم لەوێبوون. خۆ ئەوان نەنک و باپیرەی مەریەم نین. مەریەم نەنک و باپیرەی خۆی هەیە. ئەوانیش میهرەبانن و جارجارێک سەردانمان دەکەن، بەڵام وەک دەڵێن خوێن خوێنە و قەت نابێت بەئاو.
چوومە ژورەوە و لەسەر فەرشەکە دانیشتم، هەر چواریان بەشێوەیەکی زۆر سەیر تەماشایاندەکردم، وای بۆ چووم شتێکی گرنگ قەومابێت. هەرچەند بیرمکردەوە لە ماوەی چەند ڕۆژی پێشوودا هیچ شتێکی قۆڕم لە قوتابخانەدا نەکردبوو، ئەمڕۆش لەکاتی خۆیدا لەدوای وانەی مۆسیقای پیانۆوە ڕێک هاتمەوە بۆ ماڵەوە، ئێ چەند مانگێکیش بەسەر دواهەمین جاردا ڕۆیشتبوو کە بەدزیەوە دە کرۆنیەکم لەسەر مێزی نانخواردنەکە لولکرد و خنیمە گیرفانمەوە. لەبەرئەوە وتم؛ «چیە.. هیچ شتێک قەوماوە؟»
ئەوجا نەنکم کەوتە قسە و وتی نامەیەکی باوکتمان دۆزیوەتەوە کە بەر لە مردنی بۆ تۆی نوسیووە. دڵم ڕاچڵەکی و هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا. ئاخر ئەو یانزە ساڵ لەمەوبەر مردبوو. تەنانەت دڵنیا نەبووم کە سیمایم بیردەکەوێتەوە یان نا. "نامەیەک لە باوکمەوە" هەروەک شتێکی زۆر گرنگ دەهاتە بەرچاوم، خەیاڵم بۆ وەسێتنامەیەک دەچوو.
نامەیەکی گەورەم لەسەر کۆشی نەنکم بینی، پاش کەمێک بەرەو ڕوی من ڕایگرت. نامەکە نەکرابووەوە، لەسەری نوسرابوو؛ "بۆ جۆرج"، هیچی تری پێوە نەبوو. نە دەستوخەتی نەنکم بوو و نە هی دایکم و

یۆرگنیش بوو. بەپەلە نامەکەم کردەوە و تۆپەڵێک کاغەزم دەرهێنا، داچڵەکیم کە بینیم لەسەر یەکەمین لاپەڕە نوسرابوو؛

**باش دانیشتوویت جۆرج؟ هەرچۆنێک بێت کەمێک گرنگە کە بە باشی دانیشتبیت، چونکە ئێستاکە دەمەوێت چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشت بۆ بگێڕمەوە...**

سەرم گێژی خوارد. ئەمە چیە؟ نامەیەک لە باوکمەوە؟ بڵێیت بەڕاستی ئەو نوسیبێتی؟
«باش دانیشتوویت جۆرج؟» لەوە دەچوو گوێم لە دەنگە گڕەکەی باوکم بێت، لەوێدا هەروەک دەنگی سەر کاسێتی فیدۆکان نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەک گوێم لێبوو هەردەتوت لەناکاودا زیندوو بۆتەوە و لەناوماندا لە ژوری دانیشتنەکەدایە.
ڕاستە زەرفەکەیان بەداخراوی دایە دەستم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەخۆم نەبوو پرسیارم لە گەورەکان کرد و ویستم بزانم ئەوانیش نامەکەیان خوێندۆتەوە یان نا، بەڵام هەر چواریان سەریان بۆ ڕاوەشاندم و وتیان تەنانەت دێڕێکیشمان نەخوێندۆتەوە.
یۆرگن وتی «تەنانەت پیتێکی نامەکەشم نەدیوە». بەدەنگیدا هەستمکرد کەمێک شەرم دەکات، لە دەنگی ئەو نەدەچوو. ئینجا وتی "ئەگەر ڕێگە بدەیت لەپاش ئەوەی کە خۆت خوێندتەوە، ئێمەش دەیخوێنینەوە". وابزانم زۆر پەرۆشی ئەوەبوو کە ناوەڕۆکی نامەکە بزانێت. هەستمکرد شتێک ئازاری ویژدانی دەدات.
ئەوجا نەنکم هۆی سەردانی ئەو پاش نیوەڕۆیەی ڕونکردەوە. وتی "بۆیە هاتینە ئۆسلۆ بۆ لاتان، چونکە پێموابێت نهێنیەکی کۆنم بۆ

دەرکەوتووە". قسەکەی زۆر نادیار و پڕنهێنی هاتە بەرگوێم، هەرواشبوو.
ئەو کاتەی باوکم نەخۆش کەوتبوو، بەدایکمی وتبوو کە خەریکی نوسینی شتێکە بۆ من. نامەیەکبوو و دەبوایە لەکاتی گەورەبوونمدا بمخوێندایەتەوە. بەڵام وا تەمەنم بووە پانزە ساڵ و نامەیەکی ئاوها قەت دەرنەکەوت.
ئەو شتە نوێیەی کە لەم دواییەدا ڕویدا ئەوەبوو کە نەنکم لەپڕێکدا قسەیەکی تری باوکمی بیرکەوتبووەوە کە کاتی خۆی وتبووی. ئەو داوایکردبوو کە هیچ کەسێک ماشێنە سورەکە فرێنەدات. نەنکم دەیوت تاڕادەیەک وشە بە وشەی قسەکانیم لەیادە_لەو کاتەدا بووە کە لە خەستەخانەدا کەوتبوو، باوکم بەنەنکمی وتبوو «خۆ نیازتان نیە ئەو ماشێنە سورە فرێبدەن؟ بەهەرحاڵ ئەگەر دەتانەوێت کەسێکی میهرەبان بن، ئەوا فرێی مەدەن. ئەو ماشێنە لەم چەند مانگەی دوایدا بەلای من و "جۆرج"ەوە زۆر گرنگ بووە. من دەمەوێت ئەو ماشێنە لەلای جۆرج بمێنێتەوە. تکایە ئەوەندەی پێ بڵێن. ئەو کاتەی کە گەورە دەبێت و تێدەگات پێی بڵێن کە من بەڕاستی حەزمدەکرد ئەو ماشێنەی بۆ بپارێزم»
لەبەرئەوە ئەو ماشێنە کۆنە مابووەوە، نە فرێیاندابوو و نە بە هیچ کۆنە فرۆشێکیشیان بەخشیبوو. تەنانەت یۆرگنیشیان ئاگادارکردبووەوە. هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کە گواستبوویەوە بۆ هوملەفای زانیبووی شتێک هەیە کە بۆی نیە دەستکاری بکات، ئەو شتەش ماشێنە سورەکە بوو. یۆرگن ئەو ماشێنەی زۆر بەلاوە گرنگبوو و وەک شتێکی تایبەت دەیبینی، هەربۆیە لەتاوا ماشێنێکی یاری نوێی بۆ مەریەم کڕی. وابزانم پێی خۆشنەبوو کچەکەی لەناو هەمان ئەو ماشێنەدا دانیێت کە کاتی خۆی باوکم منی تێخستبوو و پاڵی

پێوەنابووم، بەڵام خۆ ڕێشی تێدەچێت کە هەروا حەزی لە ماشێنێکی نوێتر و مۆدێرێنتر کردبێت. خۆ ئەو زۆر لەسەر مۆدە دەڕوات، دەتوانم بڵێم تاڕادەیەک پێی خۆشە خۆشی دەربخات.
بەهەرحاڵ نامەیەک و ماشێنێکی یاری. بەڵام نەنکم پاش یانزە ساڵ ئەو نهێنیەی بۆ دەرکەوتبوو. تەنها لەم دوا دواییەدا بە خەیاڵیدا هاتبوو و وتبوی 'دەبێت کەسێک زات بکات و بڕواتە ئەو ئەمبارەوە و وردتریێک تەماشای ئەو ماشێنە کۆنە بکات'. نەنکم هەر زۆر باشی بۆ چوبوو، ماشێنەکە تەنها ماشێن نەبوو، بەڵکو هاوکات سندوقی پۆستیش بوو.
بەتەواوەتی نەمدەزانی باوەڕ بەو بەسەرهاتە بکەم یان نا، چونکە هەرگیز بە دڵنیاییەوە نازانین کە دایک و باوک و باپیرانمان ڕاستمان لەگەڵدا دەڵێن یان نا، بەتایبەتیش لەو بارانەدا بڕوایان پێناکرێت کە باس دێتە سەر باسی ئەو شتانەی کە پێیان دەوترێت 'بابەتە هەستیارەکان'، نەنکم خۆی زوو زوو ئەو وشەیە بەکاردەهێنێت.
ئەمڕۆکە گەورەترین نهێنی لە خاڵێکدا دەبینم؛ بۆچی هیچ کەسێکیان لە ماوەی یانزە ساڵی ڕابوردودا نەیانتوانیووە کۆمپیوتەرە کۆنەکەی باوکم بخەنە ئیش؟ خۆ ئاشکرایە باوکم کاتی خۆی ئەو نامەیەی بەو کۆمپیوتەرە نوسیووە! بێگومان دایانگیرساندووە، بەڵام هیچ کەسێکیان فەنتاسیای هێندە نەبووە کە کۆدی کردنەوەی کۆمپیوتەرەکەی بە خەیاڵدا بێت. کۆمپیوتەرە کۆنەکان کۆدێکی هەبووە کە لە هەشت پیت تێنەدەپەڕی. بەڵام تەنانەت دایکیشم نەیتوانیووە ئەو کۆدە بشکێنێت. من بەڕاستی ئەوەم بەلاوە سەیرە. دواتریش کۆڵیاندابوو و کۆمپیوتەرەکەیان بردبووە هەورەبانەکە!

بەڵام هەروەک لەوەوپێش وتم دواتر دێمەوە سەر باسی کۆمپیوتەرەکەی باوکم.

ئێستاکە کاتی ئەوەیە کە باوکم دەست بە قسەکانی بکات، منیش هێدی هێدی کۆمەڵێک تێبینی خۆم لەگەڵ گێڕانەوەکەی ئەودا تێهەڵکێش دەکەم. جگەلەوەش دواتر پاشکۆیەک بۆ نامەکەی دەنوسم. ناچارم پاشکۆیەکی بۆ بنوسم، چونکە باوکم لە نامە دورودرێژەکەیدا پرسیارێکی زۆر گرنگی لێکردووم. بەڕاستی زۆر مەبەستیەتی کە بزانێت من بە چ شێوەیەک وەڵامی ئەو پرسیارەی دەدەمەوە.
کۆلایەکیان دامێ و هەموو کاغەزەکانم لەگەڵ خۆمدا بردە ژورەکەی خۆم. بۆ یەکەمین جار لە دیوی ناوەوە دەرگاکەم کلیلدا و یەکسەر دایکم نارەزایی خۆی دەربڕی، بەڵام هەر زوو بۆی دەرکەوت کە نارەزاییەکەی هیچ سودێکی نیە.
خوێندنەوەی نامەی کەسێک کە لە ژیاندا نەماوە شتێکی پڕ ڕێزبوو بۆم و حەزمدەکرد بەتەنها بم، من پێم خۆشنەبوو لەو کاتەدا خێزانەکەم بەدورمدا بێن و بچن. لەڕاستیشدا نامەکەم لە باوکی خۆمەوە بۆ هاتبوو و یانزە ساڵ بوو بەجێی هێشتبووین، لەبەرئەوە پێویستیم بە ئارامی و هێمنی هەبوو.
چەندە سەیربوو کە ئەو نوسینە کۆنە بەدەستمەوە ببینم، هەر لەوە دەچوو کە لەپڕێکدا ئەلبومێکی نوێی پڕ لە وێنەی خۆم و باوکمم دۆزیبێتەوە. لەدەرەوە بەفرێکی زۆر دەباری. هەر لەو کاتەی کە لە وانەی مۆسیقاوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە کڕێوەی دەکرد. بەڵام پێم وانەبوو ئەو بەفرە بە زەویەوە بمێنێتەوە، چونکە سەرەتای مانگی یانزەبوو.
لەسەر جێگای خەوەکەم دانیشتم و دەستمکرد بە خوێندنەوە.

باش دانیشتوویت جۆرج؟ هەرچۆنێک بێت کەمێک گرنگە کە بە باشی دانیشتبیت، چونکە ئێستاکە دەمەوێت چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشت بۆ بگێڕمەوە. یان لەوانەیە ئێستاکە لەسەر قەنەفە چەرمە زەردەکە دانیشتبیت، هەڵبەتە ئەگەر هێشتا هەر مابێتتان و دانەیەکی نوێتان نەکڕیبێت، من چوزانم؟ مەزەنەی ئەوەش دەکەم کە لەسەر جۆلانە کۆنەکەی بەر هەیوانە سەرگیراوەکەدا دانیشتبیت، خۆ تۆ هەمیشە کەیفت بەو جۆلانەیە دەهات. یان پێدەچێت لە بەرهەیوانەکەدا دانیشتبیت؟ کێ دەزانێت؟ ئێ خۆ من نازانم ئێستاکە چ وەرزێکە. بەڕاست، خۆ لەوانەشە چیتر ماڵتان لە هوملەفای نەمابێت.
من لە کوێوە بزانم؟
من هیچ نازانم. ئێستاکە کێ سەرۆک وەزیرانی نەرویجە؟ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ناوی چیە؟ ئەی تۆ، دەزانیت تەلیسکۆبی هۆبڵ چی بەسەرهات؟ تۆ هیچ شتێک دەربارەی ئەو تەلیسکۆبە دەزانیت؟ ئەستێرە ناسەکان هیچ زانیاریەکی نوێیان لەو بارەیەوە بۆ دەرنەکەوتووە کە تیشک بخاتە سەر مادەی پێکهێنەری گەردوون؟

زۆرجار هەوڵمداوە مەزەنەی چەند ساڵێکی دواتر بکەم، بەڵام هەرگیز نەمتوانی وێنییەکی پڕاوپڕی ئێستاکەی تۆ بهێنمە بەرچاوم، مەبەستم لەم کاتەی ئێستاکەیە کە تێیدا دەژیت. من تەنها ئەوەندە دەزانم کە تۆ کێ بوویت. تەنانەت ئەوەندەش نازانم کە تۆ لە چ تەمەنێکدایت کە ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە. ڕەنگە ئێستاکە دوازە ساڵ یان چواردە ساڵ بیت، منیش.. منی باوکیشت زۆر دەمێکە ماڵئاوایم لەم ژیانە کردووە.

لە ڕاستیدا هەر لە ئێستاوە هەستدەکەم بووم بە خێویک، هەموو کەڕەتێکیش کە ئەوەم بەخەیاڵدا دێت دەکەومە هەناسەبڕکێ. ئێستاکە دەزانم بۆچی خێوەکان زۆرجار هەروەک هەورەگرمە دەناڵێنن و فیشکە فیشکیان دێت. ئەوان مەبەستیان نیە بەو شێوەیە خەڵکانی چواردەوریان بترسێنن، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە زۆر بەلایانەوە سەختە لە کاتێکی جیاوازتردا هەناسە بدەن وەک لەو کاتەی کە جاران تێیدابوون.
خۆ ئێمە تەنها شوێنێکی دیاریکراومان لەناو بووندا نیە، بەڵکو کاتێکی دیاریکراویشمان هەیە.
ژیان بەو شیوەیەیە و منیش هیچ دەسەڵاتێکم نیە، من تەنها دەتوانم لەو خاڵەوە دەست پێبکەم کە لەکاتی ئێستاکەدا لەچواردەورمدایە. ئێستاکە مانگی هەشتی ساڵی 1990ە.

بێگومان ئەمڕۆکە _مەبەستم لەو کاتەیە کە تۆ ئەم نامەیەی تێدا دەخوێنیتەوە_ زۆربەی هەرە زۆری ئەو شتانەت لەیادکردووە کە من و تۆ پێکەوە لەم ڕۆژە گەرمانەی هاویندا پێکەوە کردوومانە، چونکە ئەو کاتە تۆ تەمەنت سێ ساڵ و نیوبوو. بەڵام ڕۆژەکان هێشتا هەر هی خۆمانن و هێشتا چەندەها ساتی خۆشی پێکەوە بوونمان لەبەردەستایە.
پێم خۆشە شتێکت پێبڵێم کە لەم ماوەیەدا زۆر بیری لێدەکەمەوە؛ لەگەڵ هەموو ڕۆژێکدا کە تێدەپەڕێت و لەگەڵ کردنی هەموو شتێکی بچکۆلەدا کە من و تۆ پێکەوە دەیکەین، دواتر بواری یادکردنەوەی منت زیاتر دەبێت. من ئێستاکە ڕۆژەکان و حەفتەکان دەژمێرم. سێشەممەی پێشوو چووینە سەر قەڵای 'تریڤان' و لەوێوە تەماشای نیوەی شانشینمان کرد، بەڵێ، هەتا وڵاتی سویدمان لێوە دیاربوو.

دایکیشت لەگەڵماندا بوو، هەر سێکمان پێکەوە بووین. بەڵام تۆ ئەوەت لە یادە؟
جۆرج، هەر هیچ نەبێت هەوڵێک نادەیت ئەوەت بیر بکەوێتەوە؟ هەوڵێک بدە، چونکە هەموو ئەو شتانە لە شوێنێکی ناوەوەتدا بوونیان هەیە.
ئەی شەمەندەفەرە گەورەکەی 'بریۆت' لەبیرە؟ هەموو ڕۆژێک چەندەها کاتژمێر یاریت پێدەکرد. وا من ئا ئێستاکە تەماشایەکی دەکەم. لەم کاتەدا کە ئەم شتانە دەنوسم شەمەنەفەر و سکە و پاپۆڕی یاری لە ژوری دانیشتنەکەدا پەرش و بڵاوبوونەتەوە، ڕێک هەر وەک ئەو کاتەیە کە کەمێک لەمەوبەر بەجێت هێشتن. دواجار ناچاربووم هەموویان لە چنگت دەربهێنم بۆ ئەوەی فریای کۆبونەوەی باخچەی ساوایان بکەوین. بەڵام هێشتا لەبەرچاومدا دەڵێی دەستە بچکۆلەکانت بەردەوام یاری بەو پارچە تەختانە دەکەن و ناوێرم تەنانەت دەستکاری هیچ سکەیەکیشی بکەم.
ئەی کۆمپیوتەرەکەت لەیادە کە من و تۆ لە پشوی حەفتەکاندا یاری کۆمپیوتەرمان لەسەر دەکرد؟ ئەو کاتەی کە تازە کڕیبوومان لە ژوری کارکردنەکەی خۆمدا لەسەرەوە دامان نابوو، بەڵام چەند حەفتەیەک لەمەوبەر گواستمەوە بۆ ژوری دانیشتنەکەی خوارەوە. ئێستاکە من پێم خۆشە لەو شوێنەدابم کە هەموو شتەکانی تۆی تێدایە. پاشنیوەڕوان تۆ و دایکیشت لێرەن. جگە لەوەش باپیرە و نەنەش لە جاران زیاتر سەردانمان دەکەن. ئەوەش شتێکی خۆشە.
پاسکیلە سێ تاییە سەوزەکەت لە یادە؟ ئێستاکە وا لەسەر زیخەکەی بەردەرگایە و هەر لە پاسکیلێکی نوێ دەچێت. ئەگەر لەبیرت مابێت، ئەوا لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە تا ئێستاکەش هەر لە گەراجەکەدا

یان لە ئەمبارەکەدا پاراستبێتان، وای بۆ دەچم کە ئێستاکە کۆن و پەککەوتەبێت. یان وا نیە و بەخشیوتانە بە کۆنە فرۆشێک؟
ئەی ماشێنە سورەکە جۆرج؟ *ئەو* چی بەسەرهاتووە؟
هەر هیچ نەبێت دەبێت چەند وێنەیەکی یادوەری ئەو هەموو پیاسانەی ناو 'سۆگنسڤان'ت لەبەرچاوبێت. یان دەبێت وێنەی ئەو هەموو پیاسانەی خانوە هاوینەکەت بێتەوە یاد. ئێمە سێ پشووی حەفتەی پێشوو یەک بەدوای یەکدا چووین بۆ 'ڤێلستیۆلن'. بەڵام ئیدی لەوەندە زیاتر ناوێرم پرسیارت لێبکەم، بەڕاستی ناوێرم، چونکە لەوانەیە نەتوانیت هیچ شتێکت لەو سەردەمەی 'جۆرج' بێتەوە یاد، ئەو کاتە کاتی منیش بوو. بەڵام با شتەکان لە شوێنی خۆیاندا بهێڵینەوە.
وەک لەوەوپێش وتم، من دەمەوێت چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە، بەڵام هەروا سانا نیە زمانێک بدۆزمەوە کە لەگەڵ ئەم نامەیەدا بگونجێت. وابزانم هەر لە سەرەتاوە هەڵەیەکم کرد و قسەم بۆ کوڕێکی بچکۆلە دەکرد کە خۆم لەو بڕوایەدام باش بیناسم. بەڵام خۆ تۆ چیتر لەکاتی خوێندنەوەی ئەم دێڕانەدا هێندە چکۆلە نیت. تۆ چیتر ئەو کوڕە بچکۆلە قژ زەردە خاوە نیت.
هەستدەکەم منگەمنگ دەکەم، هەروەک پیرێژنێک دەدوێم کە قسە لەگەڵ منداڵێکی بچکۆلانەدا دەکات. بەڵام ئەوە بێئەقڵیە، چونکە من دەمەوێت قسە لەگەڵ جۆرجی گەورەدا بکەم –ئەو کەسەی کە فریانەکەوتم بیبینم، ئەو کەسەی کە قەت نەمتوانی بە شێوەیەکی جدی بیدوێنم.

ئێستاکە تەماشای کاتژمێرەکەم دەکەم. سەعاتێک لەمەوبەر تۆم بردە باخچەی ساوایان و گەڕامەوە ماڵەوە.

هەمیشە کە بەلای جۆگەکەدا تێدەپەڕین، لە گالیسکەکەتدا دێیتە دەرەوە و بەردێک یان چڵە دارێک فڕێدەدەیتە ناو ئاوەکەوە. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر بتڵێکی ساردی بەتاڵت دۆزیەوە، ئەویشت فڕێدایە ناو ئاوەکەوە. منیش هەر تەماشام دەکردیت، تەنانەت نەمویست ڕێگەشت لێبگرم. لەم ماوەیەدا لەجاران زیاترێک ڕێگەت پێدەدەم بە ئارەزووی خۆت هەڵسوکەوتبکەیت. زۆرینەی ڕۆژەکانیش کە دەگەینە باخچەی ساوایان، بەرلەوەی خواحافیزبوون لەیەکتری بکەین تۆ ڕادەکەیتە ژورەکەی خۆتەوە. لەوەدەچێت تۆ کاتت لە من کەمترێک بێت. سەیرە کە بیر لەوە دەکەمەوە. زۆرجار وادێتە بەرچاومان کە خەڵکانی گەورە کاتێکی زیاتریان لەبەردەستدابێت وەک لە منداڵان کە هەموو ژیانیان لەبەردەمدایە.

خۆ من خۆم هێندە بەتەمەن نیم کە شانازی پێوەبکەم، من هێشتا خۆم هەروەک پیاوێکی گەنج دەبینم. بەلایەنی کەمەوە باوکێکی گەنجم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرم پێخۆشدەبوو گەر بمتوانیبایە کات بوەستێنم. هیچ لاریەکم لەوە نەدەبوو ئەگەر ئا ئەم ڕۆژانەی کە تیایدام بۆ هەتاهەتایە بەردەوامبوایە. بێگومان شەو و ڕۆژ بەدوای یەکتریدا هەر دێن، چونکە ڕۆژگار ڕەوتێکی تایبەتی خۆی هەیە، خاوەنی ڕیتمێکی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام لەلایەکی ترەوە دەخوازم سبەینێم ڕێک بەهەمان شێوەی ڕۆژی پێشووترم سەرلەنوێ دەستی پێبکردایەتەوە.

هەستدەکەم چیتر پێویسم نیە شتی تر ببینم و ئەزموونی تر بکەم، ئەوەندەم بەسە کە بینیومن. لەبەرئەوە زۆر شادمان دەبووم گەر بمتوانیبایە ئەو شتانەی کە بینیومن وەک خۆیان بمهێشتنایەتەوە. بەڵام وا دزەکان دەوروخولیانداوم جۆرج. میوانی قێزەوەن ڕویان

تێکردووم و خەریکن وزەی ژیانم دەمژن. شەرمیان بکردبایە باشتریێکبوو.

لەم کاتەدا لەڕادەبەدەر پێم خۆشە کە دەتبەم بۆ باخچەی ساوایان، بەڵام لەلایەکی ترەوە زۆرم بەلاوە سەختە. ڕاستە هێشتا دەتوانم بەبێ هیچ کێشەیەک ڕێبکەم و پاڵ بە خۆت و ماشێنی یاریەکەتەوە بنێم، بەڵام لەهەمان کاتدا دەزانم کە لەشم زۆر ناساغە.
نەخۆشیە باشەکان یەکسەر لە جێگادا دەتخەن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی نەخۆشیە بەدەکان ماوەیەکی زۆرتر لە لەشدا دەمێنێتەوە و ئەوجا دواتر یەک کەرەت بۆ هەتاهەتایە تەختت دەکەن. هەرچەندە دڵنیام کە دایکت شتێکی دەربارەی من بۆ باسکردوویت، بەڵام لەوانەیە تۆ لەیادت نەمابێت کە من خۆم پزیشکبووم. ئێستاکە پشووم لە کاری خەستەخانە وەرگرتووە، خۆم دەردی خۆم باش دەزانم. من نەخۆشێک نیم کە بە ئاسانی هەڵبخڵەتێم.
کەواتە ئێستاکە دوو کاتمان لەبەردەستایە، یان وردتر بڵێین لەم چاوپێکەوتنەی دواجارماندا دوو کاتمان هەیە. وەک ئەوە وایە هەر یەکەمان لەلایەکەوە لەسەر لوتکەی شاخێکی تەماوی وەستابین و تەماشای یەکتری بکەین. لە نێوانماندا دۆڵێکی قەشەنگی لێیە کە تۆ لەگەڵ تێپەڕبوونی ژیانتا بەجێتهێشتووە، بەڵام من هەرگیز ناتوانم تۆی تێدا ببینم. من دەبێت لەلایەکەوە ڕەچاوی ئەو کاتە بکەم کە ئێستاکە ئەم نوسینەی تێدا دەنوسم _واتە ئەم پاشنیوەڕۆیەی کە تۆ لە باخچەی ساوایانیت_ وە لەلایەکی تریشەوە دەبێت کاتی خوێندنەوەی ئەم نوسینەش بهێنمە بەرچاوم کە تەنها هی تۆیە، ئەوەش ڕێک ئەو کاتەیە کە تۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم نوسراوە دەخوێنیتەوە.

هێندەش بزانە کە نوسینی نامەیەک بۆ کوڕێکت کە بەجێی دێڵێت جەرگت لەتلەت دەکات، تۆش ئەو کاتەی کە ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە کەمێک ئازار دەچێژیت. بەڵام ئێستاکە تۆ پیاوێکی بچکۆلەیت. ئەگەر من بتوانم ئەم چەند دێڕە بخەمە سەر کاغەز، ئەوا دەبێت تۆش توانای خوێندنەوەیانت هەبێت.

وەک دەبینیت من هێندە تێگەیشتووم کە لەوانەیە هەموو شتێک بەجێبهێڵم، خۆر و مانگ و هەموو شتێکی تریش بەجێدێڵم کە بوونیان هەیە، بەتایبەتیش تۆ و دایکت جێدێڵم. ئەوە هەقیقەتە و زۆر تاڵیشە.

شتێکی زۆر گرنگ لە خەیاڵمدایە و ناچارم کە پرسیارت لێبکەم جۆرج، هەر لەبەرئەوەشە کە من ئەم شتانەت بۆ دەنوسم. بەڵام هەتاوەکو ئەو چیرۆکە سەرنجڕاکێشەت بۆ نەگێڕمەوە کە پەیمانم دایتێ، ناتوانم ئەو پرسیارەت ئاڕاستەبکەم.

هەر لەو ڕۆژەوەی لەدایک بوویت پڕبەدڵ حەزمدەکرد باسی 'کچەی پرتەقاڵت' بۆ بکەم. ئەمڕۆکە _مەبەستم لەکاتی ئەم نوسینەیە_ تۆ زور بچکۆلەیت و ناتوانیت لەو چیرۆکە بگەیت. بەڵام دەخوازم ئەم چیرۆکە ببێتە میراتێکی بچکۆلە و بۆت بمینێتەوە. دەبێت لە شوێنێکدا دابنریت و چاوەڕوانی ڕۆژێکی تری ژیانت بێت.

وا ئێستاکە ئەو ڕۆژە هاتۆتە پێشەوە.

کە گەیشتمە ئەم شوێنە، ناچاربووم چاوم لەسەر کاغەزەکان هەڵبگرم. لەوەوپێش زۆر کەڕەت هەوڵمداوە باوکمم بیربکەوێتەوە، لەوێشدا دیسانەوە هەوڵمدایەوە. ئەو خۆی داوای لێکردم. بەڵام

هەموو ئەو یادەوەریانەی کە خۆم پێم وایە لە بیرم بن، لە کاسێتی فیدیۆکان و وێنەکانەوە وەرمگرتوون.

بیرم دێت کە منداڵبووم شەمەنەفەرێکی گەورەی 'بریۆ'م هەبوو، بەڵام سودێکی وای لێنابینم و ناتوانم لە ڕێگەیەوە باوکمم بیربکەوێتەوە. پاسکیلە سەوزە سێ تاییەکە هێشتا هەر لە گەراجەکەماندایە، لەسەردەمی منداڵیمەوە ئەوەشم لەیادە. هەر زۆر دڵنیام کە لە بیرمە. ماشێنە سورەکەش هەمیشە لە بنی بنەوەی ئەمبارەکەدا بووە. هەرچەند دەکەم هیچ وێنەیەکی پیاسەکانی 'سۆگنسڤان'م نایەتەوە بەرچاو. ئەوەشم بیرنایەتەوە کە لەگەڵ باوکمدا لە سەر قەڵای 'تریڤان'بووبم. من زۆر کەڕەت چوومەتە ئەوێ، بەڵام لەگەڵ دایکم و یۆرگندا بووم. یەک کەڕەتیش من و یۆرگن چووینە ئەوێ. ئەو ڕۆژەبوو کە مەریەم لەدایکبوو و دایکم لە خەستەخانە کەوتبوو.

بێگومان یادەوەریەکی زۆری خانوە هاوینەکەی 'فێلستیۆلن'م لەیادە. بەڵام باوکم لەو یادەوەریانەدا ونە. تەنها دایکم و یۆرگن و مەریەمی بچکۆلانەی تێدایە. دەفتەرێکی یاداشتمان لە خانوە هاوینەکادا هەیە و چەندەها جار هەموو ئەو شتانەم خوێندۆتەوە کە باوکم کاتی خۆی نوسیبوونی، بەڵام کێشەکەم لەوەدایە کە ئەو شتانەم بیر نایەتەوە کە ئەو باسیکردوون. تاڕادەیەک بەلامەوە هەروەک وێنەکان و فیدیۆکانی لێهاتووە. "ئێوارەی جەژنی پاک لەگەڵ جۆرجدا کوخێکی بەفرینی گەورەمان دروستکرد، هەر بۆ یاری چرای بەفرینیشمان تێدا دانا..." بێگومان من هەموو ئەو چیرۆکانەم خوێندبۆوە و هەندێکیشیانم لەبەرکردبوو. بەڵام هەرگیز نەمتوانیوە هێندەم بیربکەوێتەوە کە منیش لەناو ئەو چیرۆکانەدابووم. من ئەو کاتە تەمەنم دووساڵ و نیوبووە کە ئەو کوخە بەفرینە گەورەیە و چرای

بەفرینەم لەگەڵ باوکمدا دروستکردووە. وێنەیەکی ئەو کوخەشمان هەیە، بەڵام زۆر ناڕوونە و تەنها ڕوناکی چراکانی تێدا دیارە.

**ئەی تۆ، دەزانیت تەلیسکۆبی هۆبڵ چی بەسەرهات؟ تۆ هیچ شتێک دەربارەی ئەو تەلیسکۆبە دەزانیت؟ ئەستێرە ناسەکان هیچ زانیاریەکی نوێیان لەو بارەیەوە بۆ دەرنەکەوتووە کە تیشک بخاتە سەر مادەی پێکهێنەری گەردوون؟**

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو دێڕەدا موچورکەیەکم پێداهات، چونکە هێندە نابێت پرۆژەیەکی تایبەتیم دەربارەی ئەو تەلیسکۆبە ئاسمانیە نوسیبوو، هەڵبەتە بە زمانی ئینگلیزی پێی دەڵێن 'Hobble Space Telescope'. قوتابیەکانی تری پۆلەکەمان بەڕاشکاوی لەسەر دوگۆڵیان نوسیبوو، یان دەربارەی گۆرانی بێژە بەناوبانگەکانی مۆسیقای 'پۆپ' و کتێبەکانی 'هاری پۆتەر'یان نوسیبوو. بەڵام من خۆم گەیاندە کتێبخانە و هەموو ئەو کتێبانەم داواکرد کە لەسەر تەلیسکۆبی 'هۆبڵ' نوسراون و لێکۆڵینەوەکەم لەسەر ئەو بابەتە نوسی. چەند حەفتەیەک لەمەوبەر لێکۆڵینەوەکەم دایە دەستی مامۆستا و ئەویش لەسەر لاپەڕەی یەکەم نوسیبووی 'بەڕاستی سەرت سوڕمانم کە ئەوها بەشێوەیەکی فراوان و فرەلایەن و زانستیانە لە بابەتێکی ئاوها سەخت نزیک بوویتەتەوە'. لەدوای خوێندنەوەی ئەو دێڕەی مامۆستاوە، شانازیم بە خۆمەوە دەکرد، وابزانم لە ژیانمدا هێندە شانازیم بە خۆمەوە نەکردووە. مامۆستا وەک ناونیشانێک بۆ تێبینیەکانی نوسیبوی 'چەپکێک گوڵ بۆ ئەستێرەناسی ئارەزوومەند' و وێنەی چەپکە گوڵێکی ڕازاوەشی بۆ نەخشاندبووم.

بڵێیت باوکم توانای سەروسروشتی هەبووبێت؟ یان هەروا بەرێکەوتە کە تەنها پاش چەند حەفتەیەک لەدوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکەم لێم دەپرسێ 'تەلیسکۆبی هۆبڵ چی بەسەرهات؟'
یان بڵێیت ئەم نامەیەی باوکم نامەیەکی هەڵبەستراو و درۆ نەبێت؟ بڵێیت هێشتا هەر لە ژیاندا بێت؟ دیسانەوە موچوڕکەیەکی تر بەلەشمدا هاتەوە.
لەسەر جێگاکەم دانیشتم و بەوردی بیرمکردەوە. تەلیسکۆبی هۆبڵ لە ڕۆژی 25ی مانگی 4ی 1990دا لە کەشتی ئاسمانی 'دیسکەفەری'یەوە هەڵدراوە و بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە. ڕێک لەو ماوەیدابووە کە باوکم نەخۆش کەوتووە، چونکە ئەو دوابەدوای پشوی جەژنی پاکی 1990 نەخۆش کەوتووە. من دەمێکە ئەوەم زانیوە، بەڵام قەت بیرم لەوە نەکردبۆوە کە ڕێک لەو کاتەدا بووە کە تەلیسکۆبی 'هۆبڵ'یان بەدوری زەویدا هەڵداوە. بەڵام لەوانەیە باوکم ڕێک لەو ڕۆژەدا زانیبێتی کە نەخۆش کەوتووە کە 'دیسکەفەری' لە بنکەی 'کاپ کەنافیرال'ەوە بە خۆی و تەلیسکۆبی هۆبڵەوە بەرەو ئاسمان هەڵدراوە، ڕەنگە لە هەمان کاتژمێردا بووبێت، ڕەنگە لە هەمان خولەکدا زانیبێتی کە نەخۆشە، کێ دەزانێت..
ئینجا تێدەگەم بۆ پەرۆشی ئەوەیە کە بزانێت ئەو تەلیسکۆبە ئاسمانیە چی بەسەرهاتووە. لەڕاستیدا هەر پاش ماوەیەکی کەم هەڵەیەکی گەورەیان لە بواری سافێتی هاوێنە سەرەکیەکەیدا بۆ دەرکەوت. بەڵام باوکم نازانێت کە ئەو هەڵەیە لەلایەن ئەستێرەناسەکانی کەشتی ئاسمانی 'ئێندیڤۆر'ەوە لە ساڵی 1993دا چاک کرایەوە، چونکە ئەو کاتە نزیکەی سێ ساڵی ڕێک بەسەر مردنی باوکمدا تێپەڕیبوو. بێگومان ئەوەش نازانێت کە کۆمەڵێ پارچەی نایابی تریان لە مانگی دووی ساڵی 1997دا لێبەست.

باوکم مرد و فریا نەکەوت بزانێت کە تەلیسکۆبی هۆبڵ بێوێنەترین و ڕونترین وێنەی گەردوونی گرت. هەرگیز لەوەوبەر وینەی ئاوها وردی گەردوون نەگیراوە. من خۆم بڕێکی زۆری ئەو وێنانەم لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە دۆزیەوە، دواتر چاپمکردن و لە لێکۆڵینەوەکەمدا بەکارمهێنان. جگەلەوەش هەرە جوانترینیانم لە ژورەکەمدا هەڵواسیوە، هەر بۆ نمونە ئەو وێنە ڕونەی ئەستێرەی مەزنی 'ئیتا کارینا' کە زیاتر لە 8000 ساڵی تیشکی لە کۆمەڵەی خۆریی خۆمانەوە دورە. 'ئیتا کارینا' یەکێکە لە ئەستێرە هەرە چڕەکانی گەلەهەسارەی ڕێگای کاکێشان، هێندە نابات کە بتەقێتەوە و ببێتە 'سوپەر نۆڤا'[1] دواتریش بەتەواوەتی لەتوپەت دەبێت و دەبێتە ئەستێرەیەکی 'نیوترۆنی' یان دەبێتە بۆشاییەکی ڕەشی گەردوون. یەکێک لەو وێنانەی تریش کە من زۆرم بەدڵە وێنەی ئەو پایەی گاز و گەردە گەردوونیەیە کە پێی دەوترێت 'M16'. لەوێدا ئەستێرەی نوێ لەدایک دەبن!

ئەمڕۆکە لەچاو ساڵی 1990دا زۆر زیاترێک دەربارەی گەردوون دەزانین، هۆی ئەوەش بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ تەلیسکۆبی هۆبڵ. ئەو تەلیسکۆبە بە هەزاران وێنەی گەلەهەسارە و ئەستێرەی تەماوی گرتووە کە بە ملیۆنەها ساڵی تیشکی لە گەلەهەسارەی کاکێشانی خۆمانەوە دورن. جگەلەوەش هەندێک وێنەی سەرسوڕهێنەری ڕابوردوی گەردوونیشی بۆ گرتووین. ڕەنگە توانای وێنەگرتنی ڕابوردووی گەردوون کەمێک سەیر بێتە بەر گوێ، بەڵام تەماشاکردنی گەردوون وەک ئەوە وایە کە تەماشای ڕابووردووی کات بکەین. چونکە تیشک بە خێرایی 300 هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا

[1] لەگەڵ تەقینەوەی ئەستێرەکاندا لە ڕادەبەدەر ڕوناکیەکەی زیاددەکات، پێیدەچێت 10 ملیارد کەڕەتی تیشکی خۆر زیادبکات و مادە چڕەکەی بە گەردووندا بڵاودەبێتەوە یان بەتەواوەتی لەتوپەت دەبێت.

دەجولێت، لەگەڵ ئەو خێراییە مەزنەشدا ڕوناکی هەندێک لە گەلەهەسارە دورەکان پێویستیان بە ملیارد ساڵ هەیە بۆئەوەی بگەنە لامان، چونگە گەردوون هەر یەکجار گەورە و فراوانە. تەلیسکۆبی هۆبڵ دەتوانێت وێنەی گەلەهاسارەیەک بگرێت کە زیاتر لە دوانزە ملیارد ساڵی تیشکی لێمانەوە دورە، بەڵام هاوکات ئەوە مانای ئەوە دەبەخشێت کە تەلیسکۆبەکە زیاتر لە دوانزە ملیارد ساڵ لەمەوبەری مێژووی گەردوونی بینیووە. بیرکردنەوە لەو بابەتە هەتا بڵێیت سەرسوڕهێنەرە، چونکە ئەو کاتە تەمەنی گەردوون لە یەک ملیارد ساڵ کەمترێک بووە. تاڕادەیەک تەلیسکۆبی هۆبڵ لە توانایدا بووە کە بگەڕێتەوە سەر تەقینەوە گەورەکە، واتە بۆ ئەو کاتەی کە شوێن و کاتی تێدا لەدایکبوو. من زانیاریەکی زۆرم لەو بارەیەوە پێیە، هەر لەبەرئەوەشە کە ئێستاکە دەربارەی دەنوسم. هەوڵدەدەم هەموو ئەو شتانە نەنوسمەوە کە دەیانزانم، چونکە ئەو لێکۆڵینەوەی کە دام بە ماموستا 47 لاپەڕەبووو!

زۆر سەیرە بەلامەوە کە باوکم دەربارەی ئەو تەلیسکۆبەی نوسیبوو. من هەمیشە خولیای لێکۆڵینەوە گەردوونیەکان بووم، ڕەنگە توانای تەماشاکردنی دەرەوەی ئەم زەویە کەم تا زۆر شتێکی بۆماوە بێت. خۆ دەکرا من باسێک دەربارەی پرۆگرامی 'ئەپۆلۆ' و یەکەمین مرۆڤ بنوسم کە پێی نایە سەر مانگ. دەشکرا باسێک لەسەر ئەو گەلەهەسارانە بکەم کە بۆشایی ڕەشیان تێدایە، چونکە لەو بارەیەشەوە زانیاریەکی زۆرم لایە. بێگومان دەشمتوانی لە لێکۆڵینەوەکەمدا باسی کۆمەڵەی خۆری و نۆ ئەستێرەکەی بکەم، باسی ئەڵقە هەسارەییەکانی نێوان مشتەری و مەریخ بکەم. دەشمتوانی بابەتی تەلیسکۆبە گەورەکانی 'هاوای' هەڵبژێرم و لەسەری بنوسم. بەڵام وەک وتم من بابەتی تەلیسکۆبەکەی هۆبڵم

هەڵبژارد و لەسەرم نوسی. ئەدی باوکم بە چ شێوەیەک پێشبینی ئەوەی کردووە؟
ئاسانتریک تێدەگەم کە بۆچی ناوی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دێنێت. بێگومان هەر لەبەرئەوە بووە کە من لە 24ی مانگی 10دا لەدایکبووم، ئەو ڕۆژەش ڕێک ڕۆژی دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکانە. بەهەرحاڵ ئێستاکە 'کۆفی ئەنان' سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانە. سەرۆک وەزیرانی ئێستاکەی نەرویجیش ناوی 'کایل بۆندفیک'ە، هێندە نابێت کە شوێنی 'یانس ستۆلتنبێرگ'ی گرتۆتەوە.
دانیشتبووم و نوقمی ئەندێشەکانی خۆم بووم، لەو کاتەدا دایکم لەدەرگایدا و هەواڵی پرسیم. منیش لەوەڵامدا وتم؛ 'وازم لێبێنە و وەڕسم مەکە'، ئەو کاتە تەنها چوار لاپەڕەم لە نامەکەی باوکم خوێندبووەوە.
لە دڵی خۆمدا وتم؛ بابە دەست بکە بە بابەتەکەت. باسی کچەی پرتەقاڵم بۆ بکە. وا من دانیشتووم، بەڕاستی دانیشتووم. ئێستاکە کاتی خۆیەتی، ئێستاکە کاتی خوێندنەوەیە.

**چیرۆکی کچەی پرتەقاڵ لە پاشنیوەڕۆیەکدا دەستی پێکرد، کە لەبەردەم شانۆی نەتەوایەتیدا وەستابووم و چاوەڕوانی 'ترام'[1]م دەکرد. ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی کۆتایی ساڵەکانی حەفتاکان بوو و پایز بەرەو کۆتایی دەچوو.**
**لەیادمە بیرم لە خوێندنی پزیشکی دەکردەوە، چونکە هێندە نەبوو دەستم پێکردبوو. بەلامەوە سەیربوو مەزەنەی ئەوە بکەم ڕۆژێک لە ڕۆژان خوێندنەکەم تەواودەکەم و دەبمە پزیشک، ئەوسا نەخۆش ڕووم**

---

[1] قیتاری کارەبایی بچکۆلەی ناو شارەکان، زیاتر هەر دوو فارگۆنی بچکۆلەیە.و

تێدەکەن و چارەنوسیان دەخەنە بەردەستم. منیش ئەو کاتە کراسێکی سپی درێژم لەبەردایە و لەسەر مێزێکی پان و پۆڕ دانیشتووم و دەڵێم؛ 'خانمی یۆهانسن، باشترە هەندێک لە خوێنەکەت بنێرینە تاقیگا'، یان دەڵێم؛ 'دەمێکە وات لێهاتووە؟'
دواتر ترامەکە هات. هەر لەدورەوە دەمبینی، لە پێشدا بەلای بینای پەرلەماندا ڕۆیشت، دواتریش هێواش هێواش بە شەقامی پەرلەماندا سەرکەوت. بەڕاستی تا ئێستاکەش بیرم نایەتەوە کە ئەو ڕۆژە بەرەو کوێ دەڕۆیشتم، من ئەوەم کەمێک پێناخۆشە. بەڵام لەیادمە کە ترامێکی 'فرۆگنەر'بوو و ڕەنگەکەی شینێکی بریقەداربوو، کەمێک پاش وەستانی سواربووم و پڕبوو لە خەڵک.
یەکەمین شت کە سەرنجم چووە سەری، کچێکی سەیربوو کە لە ناوەڕاستی فارگۆنەکەدا وەستابوو، زەرفێکی کاغەزی پڕ لە پرتەقاڵی تەڕوبڕی بەدەستەوەبوو. قەمسەڵەیەکی نارنجی کڵاوداری کۆنی لەبەردابوو[1]، بیرم دێت یەکسەر لە دڵی خۆمدا وتم 'ئەو زەرفەی دەستی یەکجار گەورە و قورسە، هاکا تەقی'. بەڵام ئەو شتەی کە زیاتر سەرنجی ڕاکێشام زەرفی پرتەقاڵەکەی نەبوو، بەڵکو ئەو ئافرەتە گەنجەبوو کە زەرفەکەی پێبوو. زۆر کەسێکی تایبەتبوو، هەر یەکسەر لە خۆمەوە شتێکی سەیر و ئەفسوناویم لەو ئافرەتەدا بینی.
بەدەرلەوەش هەستمکرد ئەویش لە من وردەبێتەوە، دەتوت ئەویش لە نێوان ئەو هەموو کەسەی کە سەرکەوتن منی هەڵبژاردبێت. هەموو شتێک لە ماوەی یەک چرکەدا ڕویدا، بەڵام لەوە دەچوو کە هەر لەو چرکەیەوە پەیوەندیەکی نهێنیمان لەگەڵ یەکدا پێکهێنابێت. هەرئەوەندەی کە هاتمە ژورەوە، یەکسەر ڕاستەوخۆ لێم وردبووەوە، وابزانم من یەکەمجار ڕووم وەرچەرخاند. وابزانم وابوو، چونکە ئەو

[1] مەبەستی لە جۆرە قەمسەڵەیەکی تایبەتیە کە پێی دەگوترێت ئانۆراک anorak.و

کاتە من هەر زۆر شەرمن بووم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە باشی بیرمدێت لەو ماوە کەمەدا کە لە ترامەکەدا بووم لەدڵی خۆمدا وتم 'هەرگیزا و هەرگیز ئەو ئافرەتە لەیاد ناکەم'. من نەمدەزانی کە ئەو کێیە، نە ناویشیم دەزانی، بەڵام هەر لە یەکەمین چرکەوە تاڕادەیەک دەسەڵاتێکی سەیری بەسەرمدا هەبوو.

بە باڵا کەمێک لە من کورتربوو، قژێکی درێژی ڕەش و دوو چاوی قاوەیی پێوەبوو، تەمەنیشی لە نزیکەی نۆزدە ساڵ دەچوو. چاوی هەڵبڕی و تەماشایەکی کردم، بەبێ ئەوەی سەری بە ئاستەمیش بجوڵێنێتەوە، لەوەدەچوو سەرێکم بۆ بلەقێنێت، لەو کاتەدا زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێز و مەکراوی خستە سەر لێوەکانی، هەروەک ئەوەی لەوەوپێش یەکتریمان ناسیبێت، یان وەک ئەوەی _دەوێرم بیڵێم_ لەوەوپێش زۆر زۆر لەمێژەوە من و ئەو ژیانێکی تەواومان پێکەوە بەسەربردبێت. بەهەرحاڵ لەوە دەچوو پەیامێکی لەو شێوەیەم لە نێو چاوە قاوەییەکانیەوە بۆ بنێرێت.

خەندەکەی، دوو چاڵی نازداری خستە سەر کوڵمەکانی، بەهۆی خەندەکەیەوە نەبوو، بەڵام لەوێدا سمۆرەیەکەم هاتە بەر خەیاڵ، بەلایەنی کەمەوە هەروەک سمۆرەیەک شیرین و جوان هاتە بەرچاوم. لەدڵی خۆمدا وتم 'بەڵام ئەگەر بەڕاستی ژیانێکمان پێکەوە بەسەربردبێت، ئەوا ڕەنگە دوو سمۆرەی سەر لقی دارێک بووبین، ئەو خەیاڵەشم بەلاوە خۆشبوو، مەبەستم لەوەیە وەک سمۆرەیەک کە ژیانێکی پڕ لەیاریم لەگەڵ کچەی پرتەقاڵی پرلەنهێنیدا بەسەربردبێت'.

بەڵام بۆچی ئاوها بەرەورووم وەستا و بە مەکرەوە خەندەیەکی خستە سەر لێوەکانی؟ بڵێیت بەڕاستی بۆ من پێکەنیبێت؟ ڕەنگە شتێکی خۆشی بیر کەوتبێتەوە، لەوانەیە لەناکاودا شتێکی هاتبێت

بە خەیاڵدا و هیچ پەیوەندیەکی بە منەوە نەبووبێت، کێ دەزانێت؟ خۆ لەوانەشە بۆ من خەندەی کردبێت؟ ئەوەش ڕێی تێدەچوو، ئەوەشم بەدوور نەدەزانی. بەڵام من خۆم لەو بڕوایەدابووم کە کەسێکی هێندە سەیر نەبووم کە سەرنجی ئەو ڕابکێشم. من هەروەک کەسێکی ئاسایی دەهاتمە بەرچاو، بەڵام ئەو کەمێک مایەی سەرنجبوو، چونکە زەرفێکی گەورەی پڕ لە پرتەقاڵی بەسنگیەوە گرتبوو. ڕەنگە هەر بەهۆی ئەو زەرفەوە خۆی پێکەنینی بە خۆی هاتبێت. لەوانەیە بە ئەقڵی خۆی پێکەنیبێت. ئەوەش سیفەتێکە کە هەموو کەسێک تێیدا نیە.
نەموێرا دیسانەوە تەماشای ناو چاوەکانی بکەمەوە. هەر تەماشای زەرفە گەورەکەی دەستیم دەکرد کە پڕ بوو لە پرتەقاڵ. لەدڵی خۆمدا دەموت 'هاکا لەدەستی کەوتە خوارەوە. پێم خۆشنیە لەدەستی بترازێت، بەڵام هێندەی نەماوە لەدەستی بخزێتە خوارەوە'.
بە لایەنی کەمەوە مەزەندەم دەکرد پێنج کیلۆ پرتەقاڵ لەو زەرفەدا بووبێت، لەوانەشە هەشت بۆ دە کیلۆی تێدابووبێت.

ترامەکە بەرەو 'درامانسفای' سەردەکەوت. جۆرج، ئەتوانیت ئەو حاڵەتە بهێنیتە بەرچاوت؟ ترامەکە دەلەرێتەوە و دەجوڵێتەوە، ئینجا لەبەردەم باڵوێزخانەی ئەمریکادا دەوەستێت، دواتر لە گۆڕەپانی 'سۆللی'دا دەوەستێت، لەوێدا، ڕێک لەوێدا کەبەرەو 'فرۆگنەفای' پێچدەکاتەوە و سەردەکەوێت، ئەو شتە ڕوودەدات کە من هەر لەسەرەتاوە لێی دەترسام. لەناکاودا ترامەکە زۆر بەهێز لەریەوە، بەلایەنی کەمەوە من وام هەستکرد، لەو کاتەدا کچەی پرتەقاڵ لەترێکی دا و منیش لەماوەی تروکاندی چاوێکدا هەستمکرد

که دەبێت نەهێڵم زەرفە گەورەکەی دەستی قلْپببێتەوە. لەوکاتەدا.. ئای.. لەوکاتەدا!

وابزانم ڕێک لەوێدابوو کە هەموو حاڵەتەکەم نابەجێ هەڵسەنگاند. بەهەرحاڵ شتێکم کرد کە ئاکامەکەی نادیاربوو. با بۆت بگێڕمەوە؛ زۆر بەئاگایانەوە هەردوو دەستم درێژکرد و زۆر بەپەلە دەستێکم خستە ژێر زەرفە قاوەییەکەوە و بە دەستەکەی تریشم توند ناوقەدی کچە گەنجەگەم گرت. بەبڕوای تۆ چی ڕویدابێت باشە؟ بێگومان ئەو کچەی کە قەمسەڵە نارنجیەکەی لەبەردابوو زەرفە پرتەقاڵەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە، دەتوانم بڵێم من پاڵم پێوەنا و لەباوەشیم دەرهێنا _هەروەک ئەوەی ئیرەییم بە زەرفەکە بردبێت و ویستبێتم لەسەر ڕێگامی لابەرم_ لە ئەنجامیشدا بەداخەوە سی چل پرتەقاڵ کەوتنە باوەشی خەڵکەوە و بەسەر عەردی ترامەکەدا بڵاوبوونەوە، بەڕاستی بە هەموو ترامەکەدا بڵاوبوونەوە. بێگومان لەوەوپێش کۆمەڵێک شتی بیئەقڵیم لە ژیانمدا کردووە، بەڵام ئەو دانەیان لە هەر هەموویان قۆڕتربوو، قەت لە ژیانمدا هێندەی ئەو ساتە هەستم بە شەرمەزاری نەکردووە.

دەی با ئێستا واز لە باسی پرتەقاڵەکان بهێنین، با بۆ خۆیان بۆ چەند ساتێکی تریش بەسەر عەرزی ترامەکەدا بڵاوببنەوە، چونکە بەپلەی یەکەم ئەم چیرۆکی ترامە دەربارەی پرتەقاڵەکان نیە. کچەکە بەپەلە ئاوڕێکی لێدامەوە و چیتر بەدەممەوە نەخەنی. غەمبار هاتە بەرچاوم، بەهەرحاڵ تارماییەکی تاریک دەموچاوی داپۆشی. نەمدەزانی بیر لە چی دەکاتەوە، بێگومان نەمدەتوانی ئەوە بزانم، بەڵام لەوە دەچوو لەپڕێکدا بداتە پرمەی گریان. دەتوت هەر پرتەقاڵێک مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە لەلای. بەڵێ وا بوو جۆرج، لەوەدەچوو کە هەر پرتەقاڵێکی شتێکی بێ وێنەبێت و جێگەی

پڕنەکرێتەوە. هێندەی نەبرد و بە نیگایەکی تورەوە تەماشایەکی کردم، وەک ئەوەی بەڕوونی پێم بڵێت کە من بەرپرسیاری ئەو رووداوەبم. هەستم دەکرد ژیانیم تێکدابێت، بێگومان ژیانی خۆشم. وادەهاتە بەرچاوم کە داهاتووی خۆمم تێکدابێت.
خۆزگە لەو کاتەدا تۆ لەوێدا دەبوویت و رزگارت دەکردم، لەوانەیە شتێکی خۆش و فریادڕەست بوتایە. بەڵام ئەو کاتە دەستی هیچ کەسێکی بچکۆلەم بەدەستەوە نەبوو، چونکە ئەو رووداوە گەلێ ساڵ بەر لە دایکبوونی تۆ روویدا.
زۆر بەشەرمەوە لەسەر عەردەکە بە چوارچنگۆڵە لەنێوان پێڵاو و نیوپووتی قوڕاویدا کەوتمە کۆکردنەوەی پرتەقاڵەکان، بەڵام بەشێکی هەر زۆر کەمم بۆ کۆکرایەوە. هەر زوو بینیم زەرفەکەش دڕاوە، لەبەرئەوە بەکەڵکی هیچ شتێک نەدەهات.
هەروەک نوکتەیەکی ناخۆش دەهاتە بەرچاوم کە لەبەردەم ئەو کچە گەنجەدا کەوتبووم، مەبەستم لەوەیە بەمانای وشە لەبەردەمیدا کەوتبووم. یەک دوو کەسی ناو ترامەکە خنەیان دەهات و پێم پێدەکەنین، بەڵام تەنها ئەوانە دڵیان خۆشبوو، چونکە زۆربەی خەڵکانی ترامەکە ناوچەوانیان گرژبوو. ترامەکە لێوانلێوبوو لە خەڵک و بەسەر یەکدا ترنجابووین، هەستمدەکرد هەموو ئەوانەی کە رووداوەکەیان بینی منیان بە تاوانبار دادەنا، منێک کە لە ڕاستیدا ویستم یارمەتی ئەو ئافرەتە بێدەسەڵاتە بدەم.
دواهەمین شتی ناخۆشی ناو ترامە کە بیرم دێتەوە، ئەم وێنەیەیە؛ بە خۆم و باوەشێک پرتەقاڵەوە هەستامەوە سەرپێ، دوو دانەشم خستبووە گیرفانەکانمەوە، لەو کاتەشدا کە لەبەردەم کچەی قەمسەڵە نارنجی لەبەرەکەدا وەستام، بۆ ماوەیەک تەماشای ناو چاوی کردم و دواتر وتی؛ 'بێ ئەقڵ!'

گلەیی لێکردم، من هیچ گومانێکم لەوەدا نیە، بەڵام پاش کەمێک دڵی هاتەوە بەبەرخۆیدا و بەشێوەیەکی نیوە گلەیی و نیوە ئاشتکردنێکەوە وتی؛ 'پرتەقاڵێکم دەدەیتێ؟'
منیش وتم؛ 'ببورە!.. ببورە!'
دواتر ترامەکە لەلای دوکانی کێک فرۆشەکەی 'میوللهاوسن'ی ناوچەی 'فرۆگنەر' وەستا و دەرگاکان کرانەوە. بەسەرسامیەوە سەرێکم بۆ کچەکە لەقاند، بە بڕوای من کچێکی پرتەقاڵی بێوێنە بوو، چرکەی دوای ئەوە پرتەقاڵێکی لەناو کۆشمدا هەڵگرت و هەروەک پەرییەکی ناو حەکایەتێک لەناو شەقامەکاندا لەبەرچاوم ونبوو.
دیسانەوە ترامەکە لەرییەوە و بە 'فرۆگنفای'دا کەوتە ڕێ.

جۆرج، ئەو وتی 'پرتەقاڵێکم دەدەیتێ؟'، بەڵام خۆ پرتەقاڵەکانی باوەشم هی خۆی بوون، دوو دانەشم خستبووە گیرفانەکانمەوە، ئەوانی تریش لەناو ترامەکەدا پەرش و بڵاوبوونەوە.
من باوەشم پڕبوو لە پرتەقاڵ و هی خۆشم نەبوون، وەک دزێک خۆمم دەبینی. تاکوتەرای خەڵکانی ناو ترامەکەش هەر بۆ خۆشی چەند قسەیەکی ڕەقیان دا بە گوێمدا. نازانم بەتەواوەتی لەوێدا بیرم لە چ شتێک دەکردەوە، بەڵام لەگەڵ وەستانی دواتردا کە گەیشتینە گۆڕەپانی 'فرۆگنەر' بە خشکەیی لە ترامەکە هاتمە خوارەوە.
لەو کاتەدا کە لە ترامەکە هاتمە خوارەوە، تەنها یەک پرسیار بە خەیاڵمدا دەهات و دەچوو؛ لە چ شوێنێکدا ئەو هەموو پرتەقاڵە فڕێ بدەم؟ بۆ ئەوەی پرتەقاڵەکانم لەدەست نەکەونە خوارەوە، ناچاربووم هەروەکو پەتبازێکی سێرک هاوسەنگی خۆم ڕابگرم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرتەقاڵێکم لەدەست ترازا و کەوتە سەر قەراغی پردەکە.
بێگومان نەشمتوانی خۆم بچەمێنمەوە و هەڵیبگرمەوە.

هێندەی نەبرد وچاوم کەوتە سەر ئافرەتێک کە گالیسکەیەکی منداڵی پێبوو و لەلای دوکانی ماسی فرۆشە کۆنەکەوە بەرەوڕوم دەهات، لەلای دوکانی ماسی فرۆشەکەی گۆڕەپانەکەی 'فرۆگنەر'ەوە، خۆ دەزانیت مەبەستم لە چ شوێنێکە؟ (بەڕاست، خۆ من نازانم ئێستاکە ئەو شوێنە ماوە یان نا). زۆر بە هێمنی لە ئافرەتەکە نزیک بوومەوە، ڕێک لەو کاتەدا کە بەلایدا ڕۆیشتم بەفرسەتم زانی هەموو پرتەقاڵەکان بخەمە ناو گالیسکەکەیەوە و لەسەر لێفە پەمەییەکەی ناویدا دایان بنێم، دوانەکەی گیرفانیشم خستە ناوی _هەر هەمووی یەک دوو چرکەی پێچوو.

جۆرج، خۆزگە دەموچاوی ئەو ئافرەتەت دەبینی. هەستمکرد لەجێی خۆیدایە یەک دوو وشەی پێبڵێم، داوام لێکرد پرتەقاڵەکان وەک دیارییەکی بچکۆلە وەرگرێت بۆ منداڵەکەی و وتم 'وا ئێستاکە کۆتایی پایزە و زۆر گرنگە هەموو منداڵێک بەپێی پێویست فیتامینی 'سی' بخۆن. ئەوجا وتم 'من خۆم قوتابی کۆلیژی پزیشکیم، هەر بۆیە ئەو ڕاستیە دەزانم'.

ژنەکە منی وەک کەسێکی بێ چاو و ڕوو بینی، من هیچ گومانێکم لەوەدا نیە. لەوانەیە پێی وابووبێت کە من سەرخۆشبم، بەهەرحاڵ بڕوای پێنەکردم کە قوتابی کۆلیژی پزیشکی بم. هەر چۆنێک بێت من سوکە ڕاکردنێک بە 'فرۆگنەرفای"دا هاتمە خوارەوە و بەجێمهێشت. دیسانەوە لەوێشدا تەنها یەک پرسیار لە مێشکمدا بوو؛ بە چ شێوەیەک کچەی پرتەقاڵ بدۆزمەوە؟ دەمویست بەزووترین کات بیدۆزمەوە و داوای لێبوردنی لێبکەم.

نازانم تۆ تا چ ڕادەیەک ئەو بەشەی شار شارەزایت، بەڵام هێندەی نەبرد و بەهەناسەبڕکێ گەیشتمە سەرسوچەکەی 'فرۆگنەرفای'، ئەوجا گەیشتمە لای 'فریدریک ستانگس گەیت' و دواتریش خۆمم

لەلای ئێلیسنبێرگ فای' و 'لیوفنسکیۆلدس گەیت'دا بینیەوە، ڕێک لەوێدا کە کچە پڕنهێنیەکە لە ترامەکەدا بەخۆی و تاکە پرتەقاڵەکەی دەستیەوە دابەزی. بەڵام دەتوت لە گۆڕەپانی 'ئیتوال'ی پاریسدام، چەندەها ڕێگەم لەبەردەستدابوو و نەمدەزانی کام یەکەیان هەڵبژێرم، بەهیچ شێوەیەکیش شوێنەواری کچەی پرتەقاڵەکە دیارنەبوو.
ئەو پاشنیوەڕۆیە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری 'فرۆگنەر'دا دەهاتم و دەچووم. چوومە سەرەوە و هەتا لای بنکەی ئاگرکوژاندنەوەی 'بریسکەبی' ڕۆیشتم، بۆ خواریشەوە هەتا 'کلینیک'ە کۆنەکەی خاچی سور ڕۆیشتم. هەموو کەرەتێکیش کە شتێکم بەرچاوبکەوتایە و لە قەمسەڵەیەکی کڵاوداری نارنجی بچوایە، ترپەی دڵم بەرزدەبووەوە، بەڵام ئەو ئافرەتەم نەبینی کە بەدوایدا دەگەڕام، هەر دەتوت زەوی قوتی داوە.
پاش تێپەڕبوونی چەند کاتژمێرێک وام بەخەیاڵدا هات کە ئەو ئافرەتە گەنجەی کە من بەخراپی ڕەفتارم لەگەڵیدا کرد، لەوانەیە بەڕاشکاوی بۆ خۆی لە پشتی پەنجەرەیەکی 'ئێلسینبێرگ فای'دا دانیشتبێت و زۆر بەنهێنیەوە چاوێکی لەسەر ئەو قوتابیە گەنجە سەرلێشیواوە دانابێت کە بە نائومێدی لەمسەرەوە بۆ ئەو سەر کەوتبووە هات و چۆ و هەربە پاڵەوانێکی نائومێدی فیلمێکی 'ئەکشن' دەچوو؛ نائومێدە و وێڵی بینینی شازادەیە و بۆی نادۆزرێتەوە. پاڵەوانەکە بەڕاستی دەیویست شازادەکەی بدۆزێتەوە، بەڵام لەهیچ کون و کەلەبەرێکەوە شوێنەواری کچەکەی دیارنەبوو. لەوەدەچوو کە فیلمەکە لەو شوێنەدا چەقیبێت.

پاش نەختێک لەناو تەنەکەیەکی خۆڵدا تویکڵێکی تازە فڕێدراوی پرتەقاڵێکم بینی. دەرمهێنا و بۆنێکم کرد، بەڵام تەنانەت ئەگەر هی کچەی پرتەقاڵیش بێت، ئەوا بێگومان دواهەمین شوێنەواریەتی.

بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە هەر بیرم لەو کچە دەکردەوە کە قەمسەڵە نارنجیە کڵاودارەکەی لەبەردابوو. من سەرتاپای ژیانم لە شاری ئۆسلۆدا بەسەربردووە، بەڵام قەت لەوەوپێش ئەو کچەم نەبینیبوو. من بەتەواوەتی دڵنیابووم لەوە، بەڵام سوریشبووم لەسەر ئەوەی هەموو توانایەکم بخەمەکار بۆئەوەی جارێکی تر بیبینمەوە. هەردەتوت جادوویەکی لێکردووم و زۆر بەئاسانی توانی خۆی لەنێوان من و هەموو شتەکانی تری جیهاندا بچەقێنێت.
دووبارە و سێبارە هەر بیرم لەو هەموو پرتەقاڵە دەکردەوە. ئاخۆ ئەو هەمووەی بۆچی بووبێت؟ بڵێیت ویستبێتی دانە دانە پاکیان بکات و قاژ قاژ بۆ نانی بەیانی و نیوەڕۆ هەموویان بخوات؟ ئەو جۆرە خەیاڵە ترساندمی. لەدڵی خۆمدا وتم یان لەوانەیە نەخۆش بێت و ناچاربێت لەسەر ڕێجیمێکی تایبەتی بڕوات؟ ئەو خەیاڵەش لێیدام و دیسانەوە هەستم بە نائارامی کردەوە.
بەڵام خەیاڵم بۆ چەندەها بواری تریش چوو. ڕەنگە ویستبێتی جۆرە شیرینیەکی تایبەتی بە ئاوی ئەو پرتەقاڵانە بۆ سەد میوانێک دروستبکات. ئەو خەیاڵە یەکسەر توشی ئیرەیی کردم و خۆم بەخۆمم وت 'ئەی بۆ منیان بانگ نەکردووە؟' جگەلەوەش بە خەیاڵی خۆم ڕێژەی پیاوان و ئافرەتانی ئەو کۆبونەوەیە وەک یەک نەبوون. زیاد لە نەوەت لەسەدی ئامادەبوان پیاوی گەنج بوون و تەنها هەشت کچیان بانگ کردبوو. هەر بەخەیاڵ هۆی ئەوەشم دانابوو؛ ئەو شیرینیە تایبەتیەیان بۆ ئاهەنگی کۆتایی ساڵی خوێندنی پەیمانگای

ئابووری بوو، هەرلەبەرئەوەش بوو کە هێندە کچیان لەگەڵدا نەبوو، چونکە ڕێژەی کچ لە پەیمانگای ئابووریدا زۆر کەمە.
هەوڵمدا ئەو خەیاڵە لە مێشکمدا بهێنمە دەرەوە، چونکە بەرگەم نەدەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاڕادەیەک وەک کێشەیەکی نایەکسانی نێوان ڕەگەزەکان دەهاتە بەرچاوم کە پەیمانگای ئابووری تا ئێستاکە ڕژێمێکی یەکسانی بۆ وەرگرتنی کوڕان و کچان دانەناوە. بەڕاست، خۆ ئەوانە هەر هەمووی فەنتاسیای خۆمن و ناتوانم هێندە پشتیان پێببەستم. لەوانەشە کچەی پرتەقاڵ بەڕێگاوە بووبێت بەرەو باڵەخانە بچکۆلەکەی، بۆ ئەوەی پرتەقاڵەکان بگوشێت و چەندەها لیتر شەربەتی لێبەرهەم بهێنێت، ئەوجا شەربەتەکەشی بخاتە یەخچاڵەکەیەوە، چونکە یان ڕقی لە شەربەتی بازاڕە، یان ئەو شەربەتانەی پێناکەوێت کە کارگەکان لە ئاوێکی چڕی میوەی خراپ بەرهەمی دێنن کە لە کالیفۆرنیاوە دەیهێنن.
هیچ یەکێک لەو بوارانە ڕێی تێنەدەچوو کە لەسەرەوەدا باسمکردن، نە شەربەت دروستکردنەکە و نە شیرینیەکەش. بەڵام دەمودەست بیرۆکەیەکی باشترم بە خەیاڵدا هات کە زیاتر جێگەی متمانەبوو؛ کچەی پرتەقاڵ قەمسەڵەیەکی کلاوداری کۆنی لەبەردابوو، ڕێک هەر وەک ئەوانەی کە 'ڕواڵد ئامۆنسن' لەکاتی گەشتە بەناوبانگەکانیدا لەبەریدەکرد کە بۆ جەمسەرەکان دەچوو. ئێ خۆ خەڵکیش هەروا بۆ خۆشی قەمسەڵەیەکی کۆنی ئاوها لەبەرناکات و بە شەقامەکانی ئۆسلۆدا پیاسەبکات ئەگەر مەبەستێکی نەبێت. دیارە مەبەستێکی هەیە، بەتایبەتیش کە زەرفێکی گەورەی پڕ لە پرتەقاڵ لەگەڵ خۆیدا کێشدەکات.

لەدڵی خۆمدا وتم؛ بێگومان کچەی پرتەقاڵ پلانی داناوە کە پێڵاوی تایبەتی سەر بەفری بۆ لەپێبکات و لەم سەرەوە بۆ ئەوسەری 'گرینلاند' بڕوات، یان بەلایەنی کەمەوە نیازیەتی 'هاردەنگەرفیدا' ببڕێت، بەو شێوەیەش بێگومان ئاقڵی دەکات گەر هەشت یان دە کیلۆ پرتەقاڵ بخاتە ناو گالیسکەی سەگەکانیەوە، چونکە گەر وا نەکات ئەوا لەوانەیە لەو بیابانە بەفرینەیەدا توشی نەخۆشی 'ئەسکەرپوت' ببێت.

دیسانەوە ڕێگەم بەخۆمدا کە فەنتاسیاکانم فریوم بدەن، ئایا وشەی 'ئامۆراک' (واتە قەمسەڵەکەی) وشەیەکی ئاسکیمۆیی نیە؟ گومانم نیە کچەکە بیری لەوە کردۆتەوە کە بەرەو گرینلاند بڕوات، بەڵام ئایا لەوێ گەشتەکەی چۆن چۆنی دەبێت؟ دڵنیا نیم کە ئەو کچە پڕنهێنیە هێندە پارەی هەبێت کە بتوانێت هەروا بە ئاسانی کۆمەڵێک پرتەقاڵی تر بکڕێت، چونکە لەو کاتەدا کە زەرفەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە، خەریکبوو دەست بکات بە گریان، هەر لەوێدا وەک کچێکی زۆر هەژار هاتە بەرچاوم.

جگە لەوانەش هێشتا چەند بوارێکی تریش هەبوون، هەر ئەوەندەم لەسەربوو کە ئەندێشەکانم کۆبکەمەوە تا بیانبینم. ڕەنگە کچەی پرتەقاڵ لەناو خێزانێکی گەورەدا ژیان بەسەر بەرێت، بۆ نا؟ ئێ خۆ مەرج نیە سستەر بێت و لە سەرو کلینیکەکەی خاچی سورەوە لە ژورێکی بچکۆلەدا بژی. ڕەنگە کچی خێزانێکی گەورە بێت و هەموویان ئاشقی پرتەقاڵ بن. جۆرج، زۆرم حەزمدەکرد سەردانێکی ئەو خێزانەم بکردایە، مەزەنەی هەموویانم دەکرد کە لەدەوری مێزێکی گەورە خڕبوونەتەوە و لە باڵەخانێکی گەورەی فرۆگنەردا دەژین، ژورەکانیان ڕوناک بوون و سەقفەکان بەرز، بۆ جوانیش بە نەخشی لە گەچ هەڵکەنراو سەقفەکانیان ڕازاندۆتەوە. ئەو خێزانە

لە دایک و باوکێک و حەوت منداڵ پێکهاتبوون، جگە لە کچەی پرتەقاڵ کە گەورەترینیان بوو، چوار کچ و سێ کوڕی تریان هەبوو، ئەو وەک خوشکێکی گەورەی دڵ فراوان و میهرەبان ئاگای لێیان بوو. بەتایبەتیش لەماوەی کەمی داهاتوودا پێویستی بەو سیفاتە باشانە دەبێت، چونکە لەوانەیە چەند ڕۆژێک تێپەڕێت ئەوجا خوشک و برا بچکۆلەکانی بتوانن دیسانەوە پرتەقاڵێک بخەنە ناو کاسەی خواردنەکەیانەوە کە لەگەڵ خۆیاندا بۆ قوتابخانەی دەبەن.

یان _لەگەڵ ئەم خەیاڵەدا موچوڕکەیەکی سارد بە گیانمدا هات_ ڕەنگە هەر خۆی دایک بێت و لەناو خێزانێکی زۆر بچکۆلەدا ژیانی بگوزەرێنێت، خێزانێک کە لە خۆی و پیاوێکی قۆزی تازە دەرچووی پەیمانگای ئابووری و منداڵێکی ساوای چوار پێنج مانگ پێکهاتبێت، خۆشم نازانم بۆ، بەڵام وامدانا منداڵەکەیان ناوی 'ڕانفی' بێت.

ناچاربووم ئەو بوارەیان بەوردی لێکبدەمەوە، نەمتوانی هەروا بە ئاسانی دەستی لێهەڵبگرم. وتم لەلای دوکانی ماسی فرۆشەکەی فرۆگنەرەوە ئافرەتێک بەرەوڕووم هات کە پاڵی بە گالیسکەیەکی منداڵەوە دەنا، کۆرپەیەکی تێدا بوو کە لێفەیەکی پەمەیی پێدا دابوو، بەڵام مەرج نیە ئەو ئافرەتە دایکی منداڵەکە بووبێت. زۆر ڕێی تێدەچێت کە دایەنی منداڵەکەی کچەی پرتەقاڵ بووبێت. پێم ناخۆشە کە بیر لەوە دەکەمەوە. بەڵام بەلایەنی کەمەوە هەندێک لە پرتەقاڵەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کچە گەنجەی کە نیگای وەک نیگای سمۆرە وابوو. لەناکاودا ژیان لەبەرچاومدا هەر زۆر زۆر بچکۆلە بووەوە و هەموو شتێک مانای تایبەتی خۆی هەبوو.

من هەمیشە بێ هیچ گرفتێک توانیومە دوو و دوو کۆبکەمەوە، هەمیشە لە لێکدانەوەی نیشانەکاندا زیرەک بووم، یان لەو شتەدا کە ئێمەی پزیشک پێی دەڵێین دەستنیشانکردن. پێم خۆشە لێرەدا بڵێم

که من ئەو کاتەی نەخۆش کەوتم هەر خۆم نەخۆشیەکەی خۆمم دەستنیشانکرد. کەمێک شانازی بەوەوە دەکەم. چوومە لای هاوەڵێکم و باسی نەخۆشیەکەم بۆ کرد، ئیدی ئەو کەوتە چارەسەرکردنم. دواتریش...
ئێ جۆرج... ناچاربووم پشویەک بدەم و کەمێک دەست لە نوسین هەڵبگرم.

ڕەنگە بەلاتەوە سەیربێت کە من وا بە خۆشیەوە بەسەرهاتی ئەو ئێوارەیە دەنوسمەوە کە دەمێ ساڵ لەمەوبەر ڕویداوە. بەڵام من هەروەک چیرۆکێکی خۆش دێتەوە یادم، تارادەیەک هەر لە فیلمێکی بێدەنگ دەچێت، زۆریشم پێخۆشە کە تۆش هەر بەو شێوەیە بیبینیت. هەڵبەتە ئەوە مانای ئەوە نابەخشێت کە من هەروا بەئاسانی بەزەوق بم، مەبەستم لەوەیە لەم کاتەدا کە ئەم نوسینە دەنوسم. لە هەقیقەتدا هەستدەکەم هەر زۆر بێدەسەڵات و بێ چارەم، یان وردتریک بیڵێم هەستدەکەم هیچ شتێک نیە کە بتوانێت دڵنەواییم بداتەوە. من نامەوێت ئەوە بشارمەوە، بەڵام پێویست ناکات تۆ بیر لەوە بکەیتەوە. تۆ قەت من نابینیت کە بگریم، ئەوە بڕیارە و داومە، تا ئێستاش توانیویمە دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا هەبێت.
دایە وا لەسەر کارەوە بەرەوماڵەوە دێتەوە، من و تۆش بەتەنها لە ماڵەوەین. تۆ ئا ئێستاکە لەسەر زەویەکە دانیشتویت و چەند قەڵەمێکی ڕەنگاوڕەنگت پێیە، خەریکی وێنەی خۆتیت و ناتوانیت دڵنەوایم بدەیتەوە. یان لەوانەشە بتوانیت. جۆرج، تۆ ئەم نامەت لە کەسێکەوە بۆ هاتووە کە کاتی خۆی باوکت بووە، لەوانەیە پاش چەند ساڵێک بیخوێنیتەوە و ئەندێشەیەکی بۆ بنێریت کە دڵنەوایی

بداتەوە. تەنها بیرکردنەوە لەوە هەر لە ئێستاوە دڵنەواییم پێدەبەخشێت.
کات، جۆرج.. کات چیە؟

تەماشای وێنەیەکی 'سوپەر نۆڤا'ی A1987م کرد. تەلیسکۆبی هۆبڵ ئەو وێنەیەی ڕێک لەو کاتەدا گرتووە کە باوکم بە نەخۆشیەکەی خۆی زانیووە.
بێگومان بەزەییم پێدا دەهاتەوە، بەڵام گومانم هەیە و پێم وانیە کە شتێکی ڕاست بێت گەر دڵتەنگیەکەی خۆی بخاتە ئەستۆی من. خۆ لە هەموو بارێکدا من نەمدەتوانی هیچی بۆ بکەم. ئەو سەردەمەی ئەوی تێدا ژیاوە جیاوازە لە سەردەمی من. لەبەرئەوە ناچارم ژیانی خۆم بژیم. ئەگەر نوقمی نامەکانی باوک و باپیرانمان ببوینایە، ئەوا ئەو کاتە نەماندەتوانی ژیانی تایبەتی خۆمان بژین.
هەستمکرد فرمێسک بەری چاوەکانمی گرتووە. فرمێسکی شیرینیش نەبوو، بەڕاستی نازانم گەر شتێک هەبێت کە پێی بگوترێت فرمێسکی شیرین. فرمێسکی ڕەق و تاڵبوو، لەوانەی کە لە چاوان نابنەوە، بەڵکو هەر بە هەڵواسراوی بە پێڵوەکانەوە دەمێننەوە.
هەموو ئەو کەڕەتانەم هاتە یاد کە من و دایکم دەچووینە سەر قەبرەکەی باوکم و پاکمان دەکردەوە. لەدوای ئەوەی دواهەمین کۆپلەی نامەکەم خوێندەوە، بڕیارمدا دەستی لێهەڵبگرم. بەلایەنی کەمەوە ئیدی هەرگیزاو هەرگیز نامەوێت بە تەنها پێ بخەمە ناو قەبرسانەکەوە. قەت قەت.
مەرج نیە گەورەبوون بەبێ باوک شتێکی سەخت و دژواربێت. بەڵام ئەو کاتە دەبێتە شتێکی سەیروسەمەرە کە باوکێکی مردوو لە قەبرەکەوە قسەت لەگەڵدا بکات. باشتر نیە گەر ئەو باوکە واز لە

کوڕەکەی بهێنێت بۆ خۆی بژی؟ هەر خۆی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە وەک خێوێک گەڕاوەتەوە ناو ژیان.
دەستەکانم ئارەقیان کردبۆوە، بەڵام بێگومان دەمویست پاشماوەی نامەکەی باوکم بخوێنمەوە. لەوانەیە شتێکی باشی کردبێت کە نامەیەکی بۆ پاشەڕۆژ نوسیبێت، لەوانەشە وا نەبێت. لەوێدا هەر زۆر زووبوو بۆ ئەوەی حوکم بەسەر ئەوەدا بدەم.
بەبڕوای من کەسێکی سەیر بووە، بەتایبەتیش لەو کاتەدا کە تەمەنی نۆزدە ساڵ بووە، هەڵبەتە مەبەستم لە پایزی ئەو ساڵەی کۆتایی 70 کانە، چونکە من پێم وایە بیبینی ئەو کچەی کەمێک زیاد لەڕادە گەورە کردووە کە زەرفێک پرتەقاڵی گەورەی بەباوەشەوە بووە و لە ترامەکەی فرۆگنەردا چاوی پێکەوتووە. هێندەش بەلامەوە سەیر نیە کە کوڕ و کچ نیگا بگرنە یەکتری، چونکە لەو بڕوایەدام هەر لەسەردەمی ئادەم و حەواوە بەو شێوەیە بووبێت.
بۆ هەر زۆر بە ئاسانی نەینوسیووە کە ئاشقی ئەو کچە بووە؟ بێگومان بەرلەوەی کە خۆی هەڵباتە سەر پرتەقاڵەکانی، کچەکە لەوە تێدەگەیشت. جگە لەوەش دەستێکی خستۆتە سەر ناوقەدی کچەکە. پێدەچێت بە شێوەیەکی نائاگایانە ویستبێتی سەمایەکی لەگەڵدا بکات، سەمایەک لەگەڵ خۆی و پرتەقاڵەکانیدا بکات.
کاتێک کە منداڵان دەکەونە خۆشەویستیەوە لەگەڵ یەکتریدا، یان شەڕ لەگەڵ یەکتردا دەکەن یاخود قژی یەکتری ڕادەکێشن. ڕەنگە تۆپەڵە بەفریش بگرنە یەکتری. بەڵام وامدەزانی گەنجانی نۆزدە ساڵان کەمێک ژیرتر ڕەفتاردەکەن.
بەڵام خۆ لەڕاستیدا تا ئێستاکە هەر سەرەتای چیرۆکەکەم خوێندۆتەوە، خۆ ڕەنگە بەڕاستی شتێکی پڕنهێنی لەو کچەی پرتەقاڵە'دا هەبێت، کێ دەزانێت؟ ئەگەر وا نەبووبێت، ئەوا باوکم

باسی ئەو کچەی بۆ نەدەگێڕامەوە. باوکم نەخۆشبووە و زانیویشیەتی کە دەمرێت. کەواتە دەبێت ئەو نوسینەی زۆر بەلاوە گرنگ بووبێت، لەوانەیە بۆ منیش گرنگ بێت.
هەموو کۆلاکەم خواردەوە و دەستم کردەوە بە خوێندنەوە.

بلێیت کەرەتێکی تر ئەو کچەی پرتەقاڵە ببینمەوە؟ لەوانەیە قەت نەیبینمەوە، چونکە رێی تێدەچێت ماڵیان لە شوێنێکی تری ئەم وڵاتەدا بێت و هەروا بەسەردانێکی بچکۆلە هاتبێتە ئۆسلۆ.
واملێهاتبوو کە لەناو شار چاوم بە ترامی فرۆکنەر دەکەوت، لە پەنجەرەکانیەوە بەوردی تەماشای خەڵکانی ناوەوەیم دەکرد، تەنها بۆ ئەوەی بزانم کچەی پرتەقاڵی تێدایە یان نا. چەندەها جار ئەوەم کرد، بەڵام قەت ئەو کچەم نەبینیەوە. دواتر ئێوارانیش دەچوومە ناوچەی فرۆکنەر، هەموو کەرەتێکیش کە لەو ناوە چاوم بە شتێکی زەرد یان نارنجی دەکەوت، لەدڵی خۆمدا دەموت 'خۆیەتی، ئەوەتا، ئێستاکە دیسانەوە دەیبینمەوە'. بەڵام چاوەڕوانیەکانم زۆربوون، لەبەرئەوە نائومێدیەکانیشم بەهەمان شێوە زیاد لەرادەبوون.
چەند رۆژێک و چەند حەفتەیەک تێپەرین، پێش نیوەرۆی رۆژێکی دووشەممە خۆمکرد بە قاوەخانەی 'کارڵ یۆهان'دا، من و هەندێک لە هاورێکانی کۆلیژەکەم هەمیشە لەو قاوەخانەیەدا کۆدەبووینەوە. هەرئەوەندەی پێم خستە ناو قاوەخانەکەوە یەکسەر لەشوێنی خۆمدا چەقیم و نیو هەنگاوێک هاتمەوە دواوە. کچەی پرتەقاڵ لەوێ دانیشتبوو! ئەو قەت نەهاتبووە ئەو قاوەخانەیە، بەلایەنی کەمەوە هەرگیز لەو کاتانەدا لەوێ نەبووە کە منی لێبووبووم، بەڵام وا لەوێدا دانیشتبوو، کوپێک چای لەبەردەمدابوو و کتێبێکی پڕرەنگی بەدەستەوەبوو تەماشایدەکرد. هەر دەتوت دەستێکی نادیار

هێناویەتی بۆ ئەو قاوەخانەیە و چاوەڕوانی ئەوەیە کە من سەردانێکی بکەم. هێشتا هەر هەمان قەمسەڵە نارنجیە کۆنەکەی لەبەردابوو. دەزانی چیم بینی جۆرج؟ ڕەنگە باوەڕم پێنەکەیت، بەڵام لەسەر کۆشی، لەنێوان خۆی و مێزەکەی بەردەمیدا، زەرفێکی گەورەی کاغەزی دانابوو و پڕبوو لە پرتەقاڵی تەڕوبڕ.
بەتەواوەتی سەری سوڕماندم. سەرلەنوێ بینینەوەی کچەی پرتەقاڵ لە هەمان قەمسەڵە نارنجیەکەیدا و بینینی زەرفێکی پڕ لە پرتەقاڵ لە باوەشیدا وە بە هەمان شێوەی پێشووی، وەک بینینی سەرابێک وابوو بەلامەوە. لەو کاتەوە ئیدی پرتەقاڵەکانی بوونە کرۆکی ئەو بابەتەی کە هەوڵمدەدا ڕوونیبکەمەوە. بەڕاست، چ جۆرە پرتەقاڵێکی لە زەرفەکەیدا دانابوو؟ بینیم پرتەقاڵەکان هەروەک خۆر دەدرەوشێنەوە و لەبەر ڕەنگە ئاڵتونیەکەیان حەزمدەکرد چاوم هەڵبگلۆفم. ڕەنگێکی زەردباوی ئاڵتونییان لێ دەدرەوشایەوە و بەهیچ جۆرێک لەو پرتەقالانە نەدەچوون کە لەوەوپێش بینیبووم. ڕاستە توێکڵیان پێوەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە بۆن دەمزانی چەندە تەڕوبڕن. بەهەرحاڵ سور دەمزانی کە پرتەقاڵی ئاسایی نین!
بە ئەسپایی چوومە ناو قاوەخانەکەوە و لەدوری چوار پێنج مەتر لە کورسی کچەکەوە بۆی دانیشتم. بەرلەوەی بڕیاربدەم کە چی بکەم و چی نەکەم، ویستم هەروا دانیشم و تەماشای بکەم، دانیشم و چێژ لە بینینی ئەو دیمەنە پڕنهێنیە وەرگرم.
پێم وانیە ئاگای لەوە بووبێت کە من لەوێدابووم، بەڵام لەپڕێکدا سەری لەسەر کتێبەکەی هەڵگرت و ڕێک تەماشای ناو چاوی کردم. بەو شێوەیەش لە قافدا گرتمی، چونکە بینیمی کە من هەروا دانیشتبووم و ماوەیەک بوو لێی وردەبوومەوە. زۆر لەدڵەوە خەندەیەکی بۆ کردم. جۆرج، چ خەندەیەک بوو؟ هەر ئەو خەندەیە

دەیتوانی هەموو جیهان بتوێنێتەوە، ئەگەر هەموو جیهان ئەو خەندەیەی بدیبایە، ئەوا هێندە بەهێز دەبوون کە بتوانن هەموو شەڕەکانی دونیا بوەستێنن، هێندە گوڕی دەدانێ کە بتوانن کۆتایی بە هەموو ناکۆکیەکانی سەر ئەم زەویە بهێنن ـیان هەر هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ تەقەیان دەوەستاند.
لەوێدا ئیدی هیچ چارەیەکم نەبوو، بەمانای وشە ناچاربووم بەرەو ڕووی بچم. بەهێواشی هەنگاوم بەرەولای مێزەکەی نا و لەسەر کورسیەکی بەتاڵێ سەر مێزەکەی دانیشتم. لەوە دەچوو بەلایەوە سروشتیبێت کە لەوێدا دانیشتم، لە ڕاستیدا نازانم بۆ، بەڵام هەر لەخۆمەوە دڵنیانەبووم لەوەی کە ڕووداوی ناو ترامەکەی بیرمابێت.
بۆ ماوەی چەند چرکەیەک هەروا بە بێدەنگی دانیشتبووین و تەماشای یەکتریمان دەکرد. وابزانم حەزیدەکرد دەمودەست لەگەڵ یەکتردا قسە نەکەین. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر سەیری ناو چاومی دەکرد، دڵنیام بۆ ماوەی خولەکێک تەماشای چاوی کردم، بەڵام ئەو جارەیان چاوم بۆ نەتروکاند. بیلبیلەی چاوەکانیم بینی هەڵدەلەرزین. لەوەدەچوو چاوەکانی بڵێت؛ 'منت بیر ماوە؟' یان بڵێت؛ 'منت بیر نەماوە؟'
دەبوایە یەکێکمان شتێکی بگوتایە، بەڵام من شڵەژابووم و هەر خەیاڵێکم لای ئەو کاتەبوو کە پێکەوە وەک دوو سمۆرەی پڕ لەژیان بۆ خۆمان بەتەنیا لە دارستانێکی بچکۆلەدا دەژیاین. ئەو شەیدای ئەوەبوو کە خۆیم لێبشارێتەوە و منیش ناچاربووم بەردەوام لقی دارەکان لابدەم بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە. هەرئەوەندەش کە دەمبینیەوە، یەکسەر خۆی هەڵدەدایە سەر لقی دارێکی تر. بەو شێوەیەش هەمیشە بەسەماکردن لەناو دارستانەکەدا بەدوایەوەبووم، هەتا ڕۆژێک لەڕۆژان من خۆمم لێشاردەوە. ئەوجا ئیدی نۆبەی ئەوبوو

بەدواومدا هەڵبقونێت. جارجارێک دەچوومە سەر ترۆپکی درەختێک، یان دەڕۆیشتمە ناو قەوزەکانی خوارەوە و لەپاڵ کۆتەرە دارێکی کۆندا خۆمدەشاردەوە و چێژم لە بینینی ئەو دەبینی کە بەدوامدا دەگەڕا، سەبری لەبەر بڕابوو و لەوە دەترسا ئیدی هەرگیز نەمدۆزێتەوە...

لەناکاودا شتێک ڕوویدا کە هەر لە ڕووداوی ناو حەکایەتەکان دەچوو، نەک لە دارستانە پڕگوێزەکەی کاتی خۆیدا، بەڵکو ڕێک لەوێدا لەناو قاوەخانەی کارڵ یۆهاندا ڕوویدا.

من دەستی چەپم خستبووە سەر مێزەکە، لەپڕێکدا ئەویش دەستی ڕاستی خستە سەر دەستم. کتێبەکەشی خستبووە سەر زەرفی پرتەقاڵەکەی، هێشتا بەدەستی چەپیشی توند توند زەرفە گەورەکەی گرتبوو، وا دەهاتە بەرچاوم لەوە بترسێت کە لێی بسەنم یان پاڵی پێوە بنێم و بکەوێتە سەر زەویەکە.

چیتر هێندە شەرمم نەدەکرد. هەستم بە جۆرە هێزێکی سارد دەکرد کە لەپەنجەکانی ئەوەوە دەهاتە سەر پەنجەکانم. لەدڵی خۆمدا وتم 'دیارە شێوە توانایەکی سەروسروشتی هەیە و هەستیشم دەکرد بە شێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندیەکی بە پرتەقاڵەکانەوە هەیە'.

خۆم بە خۆمم وت 'مەتەڵە، مەتەڵێکی سەیر و سەمەرەیە!'

هێندەی نەبرد و چیتر نەمتوانی بەو شێوەیە بەبێدەنگی دابنیشم، ئاخر دەبوایە یەکێکمان شتێکی بگوتایە. خۆ ڕەنگە قسەکردن شێوە ناپاکیەک بووبێت، لەوانەیە شکاندنی ئەو یاسایانەبووبێت کە کچەی پرتەقاڵ نوێنەرایەتی دەکردن. بەڵام بەهەرحاڵ هێشتا بەردەوام هەر سەیری ناو چاوی یەکتریمان دەکرد و دواتر وتم؛ "تۆ سمۆرەیت!"

لەدوای ئەو قسەیەم خەندەیەکی زۆر بچکۆلە گرتی و توند دەستی گوشیم. ئەوجا دەستی بەردام و وەک شازنێک بەخۆی و زەرفە گەورەکەی دەستیەوە هەستایە سەرپێ، ئیدی بەنازەوە بەرەو شەقامەکەی دەرەوە کەوتەرێ. لەو کاتەدا کە ڕۆشت فرمێسکم بەچاویەوە بینی.

لەشوێنی خۆم وشکبووم. واقمورمابوو. چەند چرکەیەک لەوەوبەر کچەی پرتەقاڵ ڕێک بەرامبەرم دانیشتبوو و دەستی گرتبووم، بەلای منەوە هێشتا بۆنی پرتەقاڵ ناو قاوەخانەکەی تەنیبوو، بەڵام ئەو هەستا و بەجێیهێشتم. ئەگەر ئەو زەرفە پڕ لە پرتەقاڵەی بەدەستەوە نەبوایە، ئەوا لەوانەیە بەدەستی خواحافیزی لێبکردمایە، بەڵام بێگومان ناچاربوو زەرفە گەورەکە بەهەردوو دەستی بگرێت، هەر لەبەرئەوەبوو کە بەدەست خواحافیزی لێ نەکردم. بەڵام گریا.

من دوای نەکەوتم جۆرج. ئەگەر دوای بکەوتمایە، ئەوا یاساکانم دەشکاند. زیاد لەڕادە ونبووبووم، هیلاکبووم و لەوەندە زیاتر بەرگەم نەدەگرت. شتێکی یەکجار سەیر و پڕنهێنیم بینی و دەمتوانی بۆ ماوەی چەندین مانگ لەسەری بژیم. لەدڵی خۆمدا دەموت 'دڵنیام کە جارێکی تریش دەیبینمەوە'. لەوێدا هەستمدەکرد چەند شتێکی بەهێز و هاوکاتیش پڕلەنهێنی جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستەوەبێت.

ئەو کچێکی نامۆبوو. لە حەکایەتێکی ترەوە هاتبوو و لەم یەکەی خۆمان جوانترێکبوو. بەڵام توانیبووی خۆی بخاتە ناو ئەم هەقیقەتەی ئێمەوە، لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە ئەرکێکی گرنگی لەسەر شانبووبێت، ڕەنگە بۆ ئەوە هاتبێت هاتاوەکو لەو شتە ڕزگارمان بکات کە هەندێک کەس پێی دەڵێن 'ژیانی ڕۆژانەی قۆڕ'.

هەتا ئەو کاتەش نەمزانیبوو کە شێوە چالاکیەکی پەیامهێنەری لەو

شێوەیە بوونی هەیە. من هەر وامدەزانی کە تەنها یەک ژیان و یەک هەقیقەت بوونی هەیە و تەواو. بەڵام هێندەم بۆ دەرکەوت کە بەلایەنی کەمەوە دوو جۆر مرۆڤ بوونیان هەیە؛ کچەی پرتەقاڵ و ئێمە.
بەڵام بۆچی فرمێسک چاوانی داگرت؟ بۆچی گریا؟
بیرمدێت لە دڵی خۆمدا وتم 'لەوانەیە توانای سەروسروشتی هەبێت'.
بەڵام بۆچی بینینی پیاوێکی نامۆ خستیە گریان؟ ڕەنگە هێندەی 'بینیبێت' کە من لەداهاتوودا توشی چارەنوسێکی ناهەموار دەبم.
سەیرە بەلامەوە کە کاتی خۆی مەزەنەی ئەو شتانەم کردووە. ڕاستە من هەمیشە زۆر بە ئاسانی خۆم داوەتە دەست فەنتاسیاکانم، بەڵام کاتی خۆشی و ئێستاش مرۆڤێکی ئەقلانی بووم.

ئا لەم خاڵەی چیرۆکەکەدا هەستدەکەم خستنەڕووی پوختەیەکی چیرۆکەکە پێویست بێت، بەڵام پەیمانت دەدەمێ کە هێندە زوو زوو ئەو کارە نەکەم.
پیاوێکی گەنج لەگەڵ کچێکی گەنجدا لەناو ترامی فرۆگنەردا نیگایەکی کتوپڕ دەگرنە یەکتری. چیتر منداڵ نین، بەڵام هێشتا بەتەواوەتی گەورەش نەبوون و هەرگیزیش لەوەوپێش یەکتریان نەدیووە. پاش چەند خولەکێک پیاوە گەنجەکە وا هەستدەکات کچەکە زەرفێکی پڕ لەپرتەقاڵی تەڕوبڕی گەورەی لەدەست دەکەوێتە خوارەوە. بەهانایەوە دێت کە یارمەتیبدات، بەڵام خراپ دەشکێتەوە و هەموو پرتەقاڵەکان دەکەونە سەر عەرزی ترامەکە. کچە گەنجەکە پێی دەڵێت 'بێ ئەقڵ'، لەگەڵ شوێنی وەستانی داهاتوودا لە ترامەکە دادەبەزێت، بەرلەوەی دابەزێت پێی دەڵێت؛ 'پرتەقاڵێکم دەدەیتێ؟'، پیاوە گەنجەکەش دەشڵەژێت و سەرێکی بۆ دەلەقێنێت. پاش چەند

حەفتەیەک لە قاوەخانەیەکدا سەرلەنوێ یەکتر دەبیننەوە. لەوێشدا کچە گەنجەکە زەرفێکی کاغەزی گەورەی بەدەستەوەیە و لێوانلێوە لە پرتەقاڵی تەڕوبڕ. پیاوە گەنجەکە دەچێتە سەر مێزی کچەکە دادەنیشێت، بۆ ماوەی خولەکێک هەر تەماشای چاوی یەکتری دەکەن. وەک شتێکی بێمانا دێتە بەرگوێ، بەڵام لەماوەی ئەو خولەکەدا زۆر بەقوڵی لە چاوی یەکتری ورد دەبنەوە، تا ئەندازەیەک قوڵایی ڕۆحی یەکتر دەبینن. کچەکە دەست دەخاتە سەر دەستی کوڕەکە ئەویش دەڵێت 'تۆ لە سمۆرە دەچیت'، ئەوجا کچەکە بەلارولەنجە هەڵدەسێت و بەخۆی و زەرفە پڕ لە پرتەقاڵەکەی باوەشیەوە قاوەخانەکە بەجێدەهێڵێت، کوڕە گەنجەکە فرمێسک لە چاوی کچەکەدا دەبینێت.
تا ئێستاکە تەنها چوار کورتە ڕستەیان بەیەکتری وتووە. کچەکە؛ 'بێ ئەقڵ'. کچەکە؛ 'پرتەقاڵێکم دەدەیتێ؟'. کوڕەکە؛ 'ببورە، ببورە!'. هەر ئەویش؛ 'تۆ سمۆرەیت!'.
هەموو شتەکانی تر فیلمێکی بێدەنگە. هەموو شتەکانی تر مەتەڵێکە. جۆرج، تۆ دەتوانیت ئەو مەتەڵە هەڵبهێنیت؟ من نەمتوانی، وابزانم بەهۆی ئەوەوەبوو کە خۆم بەشێک بووم لێی.

ئەوجا بەڕاستی چیرۆکەکە گرتبوومی. دوو کەڕەت لەسەریەک کچەی پرتەقاڵەکە خۆی نیشانی باوکمداوە و هەردوو کەڕەتەکە زەرفێکی کاغەزی پڕ لە پرتەقاڵی لە باوەشدابووە. ئەوە زۆر سەیربووە. ئەوجا بەبێ ئەوەی هیچ وشەیەک لەزاری بێتە دەرەوە دەستی خستۆتە سەر دەستی باوکم و زۆر بەقوڵی تەماشای چاوی کردووە، دواتریش لەپڕێکدا هەڵساوە و بە گریانەوە ڕۆشتۆتە دەرەوە. ئەوەش هەڵسوکەوتێکی شازبووە و جێگەی سەرنجیشە.
هەڵبەتە ئەگەر باوکم نەکەوتبێتە دونیای خەیاڵاتەوە!

ڕەنگە کچەی پرتەقاڵ ئەو شتەبێت کە پێی دەوترێت 'بەرهەمی فەنتاسیا'. خۆ زۆر کەس دەڵێن ئەژدیهای دەریایمان لە دەریاچەی 'لوک نیس'دا بینیوە، هەندێکیش دەڵێن لە 'سیلیۆردسڤاند'دا ئەو گیانەوەرەیان دیوە، مەرجیش نیە درۆبکەن، بەلاَم زۆر ڕێی تێدەچێت کە 'بەرهەمێکی فەنتاسیا'یان بینیبێت. ئەگەر باوکم لەپڕێکدا بیگوتایە کە کچەی پرتەقاڵ بە خۆی و گالیسکەیەکی گەورەوە کە چەند سەگێک ڕایدەکێشێت لە 'کارڵ یۆهان'ەوە هاتە خوارەوە، ئەوساکە گومانم نەدەبوو کە چیرۆکی کچەی پرتەقاڵەکەی تەنها خەیاڵێک بووە و وای بۆدەچووم لەو کاتەی ژیانیدا بۆی هاتبێت کە بەرەو شێت بوون چووە. بێگومان ئەوەش شتێکە کە پێدەچێت تەنانەت بەسەر باشترین کەسیشدا ڕوودات و دەرمانی ئەو نەخۆشیەش هەیە.

بەلاَم کچەی پرتەقاڵ چ فەنتاسیا بووبێت یان ئافرەتێکی ڕاستەقینە، ئەوا بە ئاشکرا دیارە کە باوکم لەڕادەبەدەر خولیای بووە. دواتریش کە بواری ئەوەی بۆ ڕەخسا شتێکی پێ بڵێێت وتی 'تۆ سمۆرەیت'، من پێم وایە ئەو ڕستەیە تابڵێێت قسەیەکی بێ سودە. بەلاَم خۆشی ئەو ڕاستیە ناشارێتەوە کە شتێکی ئاوها بێمانای پێگوتووە، قسەکەی بۆتە مایەی سەرسوڕمانی خۆشی. بەلاَم من بەڕاستی تێناگەم بۆچی کتومت ئەو قسەیەی پێوت؟ نا بابە نا، من ناتوانم ئەو مەتەڵە هەڵبهینم.

من نامەوێت بڵێم زۆرزانترم و قسەی لەوە باشتر دەزانم. بەڵکو دەمەوێت یەکەم کەس بم کە دان بەو ڕاستیەدا بنێم و بڵێم ئاسان نیە شتێکی گونجاو بە کچێک بڵێیت کە هەرووەک دەڵێن 'چاوت لەسەری بێت'.

من لەوەوپێش وتم پیانۆ لێدەدەم. ناڵێم پیانۆژەنێکی زۆر کارامەم بەڵام دەتوانم بەشی یەکەمی 'سۆناتەی تریفە'ی بیتهۆفن تارادەیەکی زۆر بەبێ هەڵە لێبدەم. زۆرجار کاتێک کە بەتەنیا دادەنیشم و سۆناتەی یەکەمی ئەو سەمفۆنیایە دەژەنم، وا هەستدەکەم لەبەردەم پیانۆیەکی گەورەدا لەسەر مانگ دانیشتوم و پڕبەدڵی خۆم ئاواز لێدەدەم، هەستدەکەم لەو کاتەدا مانگ و پیانۆکە و خۆشم بەدەوری زەویدا دەخولێینەوە. مەزەنە دەکەم ئەو تۆنانەی کە لێیاندەدەم لە هەموو ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆری خۆماندا دەنگ دەداتەوە، گەر نەشگاتە پلۆتۆ، ئەوا بەلایەنی کەمەوە پێمواپە دەنگی تا مەریخ بڕوات.

هێندە نابێت دەستم کردووە بە بەشی دوهەمی 'سۆناتەی تریفە' (allegretto). ئەو بەشەیانم بەلاوە سەختتریێکە، بەڵام زۆر چێژی لێدەبینم کە مامۆستاکەمان ئەو بەشە لێدەدات. ئەو سۆناتەیە کۆمەڵێک بوکەشوشەی میکانیکیم دەهێنێتە بەرچاو کە لە بازاڕێکی گەورەدا بەسەر پلیکانەکانیدا دەچنە سەرەوە و دێنەوە خوارەوە!

بڕیارم داوە سێهەمین بەشی 'سۆناتەی تریفە' واز لێبهێنم، تەنها لەبەرئەوەش نیە کە زۆر سەختە، بەڵکو بەلامەوە زۆر ترسناکیشە. بەشی یەکەمی ئەو سەمفۆنیایە (Adagio sostenuto)م بەلاوە ناسکە و کەمێکیش ڕەشبینی پێوە دەبینم، بەڵام دواهەمین بەشی (Persto agitato) ڕاستەوخۆ ترس دەخاتە دڵەوە. خۆ ئەگەر بەهۆی کەشتیەکی ئاسمانیەوە سەفەربکەم بۆ ئەستێرەیەکی تر و بوونەوەرێکی نەگبەت لەوێ خەریکی ژەندنی بەشی سێهەمی 'سۆناتەی تریفە' بێت، ئەوا بێ سێ و دوو هەر ڕێک لەدوای دابەزینمەوە سواری کەشتیەکەم دەبمەوە و ئەستێرەکەی بەجێدەهێڵم. بەڵام ئەگەر بەشی یەکەمی لێبدات، ئەوسا ڕەنگە

چەند ڕۆژێک لەلای بمێنمەوە، یان بەلایەنی کەمەوە دەموێرا لەو بوونەوەرە نزیک ببمەوە و پرسیاری دەربارەی ئەو ئەستێرە مۆسیقیە لێبکەم کە لەسەری نیشتبوومەوە.
کەرەتێکیان بە مامۆستای مۆسیقاکەمانم وت 'برِێکی زۆر لە ئاسمان و جەهەنم لەناخی بیتهۆڤندا هەبووە'. لەپێشدا هەندێ منگەمنگی کرد، بەڵام دواتر وتی 'بەتەواوەتی ڕاستدەکەیت'. پاشانیش شتێکی سەرنجڕاکێشی بۆ گێڕامەوە؛ لەڕاستیدا بیتهۆڤن ناوی ئەو سۆناتەیەی نەناوە 'سۆناتەی تریفە'. بەڵکو خۆی پێی وتووە ( Sonate quasi una ) و ناونیشانی (in ciss moll, Op. 27 Nr.2 Fantasia) پێبەخشیووە، واتە 'سۆناتەیەکی شێوە فەنتاسیا'. مامۆستاکەمان لەو بڕوایەدابوو کە ئەو سۆناتەیە زۆر ترسێنەرتربێت لەوەی کە ناوی بنرێت 'سۆناتەی تریفە'. هەروەها وتی 'فرانس لیست'ی ئاوازدانەری هەنگاری ناوی بەشی دوهەمی ئەو سەمفۆنیایەی ناو ناوە 'گوڵێک لە نێوان دوو بۆشایی قوڵدا'. من خۆم پێم خۆشە ناوی بنێم 'شانۆیەکی خۆشی بوکەشوشەکان لە نێوان دوو تراجیدیادا'.
بەهەرحاڵ با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان، کەمێک لەمەوبەر وتم زۆر باش دەزانم کە ئاسان نیە شتێکی گونجاو بە کچێک بڵێیت کە 'چاوت لەسەری بێت'. لێرەدا دەبێت بەڕاستی دان بەوەدا بنێم، دەمەوێت وردتریێک باسی بکەم و بڵێم من خۆم لە قوتابخانەی مۆسیقاکەمدا ئەزموونێکی تایبەتیم لەو بارەیەوە هەیە.
من هەموو ڕۆژانێکی دوو شەممان لە کاتژمێری شەش بۆ حەوتی ئێوارە دەچمە قوتابخانەیەکی مۆسیقی و وانەی پیانۆ دەخوێنم. لە هەمان کاتدا کچێک دێت کە وانەی کەمان دەخوێنێت. وابزانم یەک دوو ساڵێک لەمن منداڵترە، بەڵام دەبێت ئەوە بڵێم کە 'بەڕاستی

چاوم لەسەریەتی'. زۆرجار ڕوودەدات بەر لەدەستپێکردنی وانەکانمان، هەردووکمان پێنج خولەک بۆ دە خولەکێک لە هۆڵی بەردەم پۆلەکاندا پێکەوە دادەنیشین. تاماوەیەک لەمەوبەر هیچ شتێکی وامان بەیەکتری نەوتبوو، بەڵام چەند حەفتەیەک لەمەوبەر ویستی بزانێت کاتژمێر چەندە و لە منی پرسی، حەفتەی دوای ئەوەش هەمان شت ڕویدایەوە. منیش وتم 'باران بەلێزمە دەبارێت'، ئەوجا وتم 'کەمانچەکەت تەڕبووە'. لەوەندە زیاترێک نەڕۆیشتین، هەرئەوەندە بوو و هیچی تر. بەڵام ئەو نەیویست بە شێوەیەکی جدی لەگەڵمدا بکەوێتە قسەکردن، لەبەرئەوە منیش نەموێرا بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بکەومە قسەکردن لەگەڵیدا. ڕەنگە وەک مۆرانەیەک منی ببینێت، بەڵام خۆ ڕێشیتێدەچێت کە ئەویش حەزی لە من بێت و هەروەک من شەرمن بێت. نازانمماڵیان لە کوێیە، بەڵام دەزانم کە ناوی 'ئیزابێللا'یە، چونکە ناوی ئەوم لەناو لیستی ئەو کەسانەدا بینی کە بەشداری وانەی کەمانچە دەکەن.

لەم دوادواییەدا وامان لێهاتووە بەر لەوەی وانەکانمان دەستپێبکات دەڕۆینە ئەوێ. دووشەممەی پێشوو نزیکەی چارەکێک هەروا دانیشتبووین و چاوەڕوانی وانەکانمان دەکرد. هەروەک سەدەفی ناو ئاو بێدەنگین، دواتریش هەر یەکەمان بەرەو پۆلی تایبەتی خۆمان دەچین و لەبەردەم مامۆستاکانماندا مۆسیقا دەژەنین. هەندێ جار لەو کاتەدا کە من 'سۆناتەی تریفە' لێدەدەم، مەزەنەی ئەوە دەکەم لە ناکاودا خۆی بکات بە پۆلەکەمدا، ئەوجا مۆسیقاکەم زۆر کاریتێدەکات و لەتاوا بە کەمانچە لەگەڵمدا دێتەوە. بەڵام هەرگیز ئەوە ڕوونادات، ئەوە تەنها بەرهەمی فەنتاسیای منە و هیچی تر. من هەرگیز کەمانچەکەیم نەدیووە، لەوانەشە هۆی ئەو فەنتاسیایەم هەر بۆ ئەوە بگەڕێتەوە. قەتیش گوێم لێنەبووە کەمانچە لێبدات. خۆ

ڕێشی تێدەچێت لە جانتای کەمانچەکەیدا 'پان فلوت'ێکی تێدا بێت، کێ دەزانێت؟ (بەڵام ئەگەر وابێت، ئەوا نابێت ناوی 'ئیزابێللا' بێت، بەڵکو دەبێت ناوی 'کاری'بێت!)
بەکورتی ئەو شتەی مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە بەڕاستی نازانم چی بکەم ئەگەر لە پڕێکدا دەستی بخاتە سەر دەستم و بەقوڵی تەماشای ناو چاوانم بکات. ناشزانم چی بکەم ئەگەر لە ناکاودا دەست بکات بە گریان. ئەو کاتەی کە باوکم کچەی پرتەقاڵی دیووە، تەمەنی تەنها چوار ساڵ لە ئێستاکەی من گەورەتربووە، هەر لەبەرئەوە تێدەگەم کە شڵەژاوە و لەتاودا پێی وتووە 'تۆ سمۆرەیت!'.
بەهەرحاڵ، وابزانم زۆر باش لێت تێدەگەم بابە. دە کەواتە بەردەوام بە لەسەر چیرۆکەکەت.

لەدوای ئەو پێکگەیشتنە کورتەی قاوەخانەکە، قۆناغی گەڕان بەدوای کچەی پرتەقاڵدا دەستیپێکرد، بەڵام بەشێوەیەکی ئەقڵانی و بە بەرنامەوە دەستمپێکرد، چونکە چەندەها ڕۆژی دورودرێژ تێپەڕین و هیچ هەواڵێکیم نەبیست.
جۆرج، لێرەدا بە پێویستی نازانم باسی سەرتاپای هەموو ئەو هەوڵانەی خۆمت بۆ بکەم کە تێیدا شکستم هێنا و نەمتوانی بیدۆزمەوە، چونکە بەو شێوەیە نوسینەکەم زۆر دورودرێژ دەبێتەوە. بەهەرحاڵ زۆرم بیرکردەوە و زۆریشم لێکدایەوە، هەتا ڕۆژێکیان شتێکی وەک ئەمەی خوارەوەم بەخەیاڵدا هات؛ من دوو جار کچەی پرتەقاڵم بینی، بەڵام هەردوو جارەکە لە ڕۆژێکی دووشەممەدا بوو. سەیرە بەلامەوە کە من لەوەوبەر خەیاڵم بۆ ئەوە نەچووبوو! پرتەقاڵەکانیش تەنها نیشانەی بەردەستمبوون کە بەدویان بکەوم، ئەو پرتەقاڵانەی لە کوێوە هێنابوو؟ دەزانم دوکانەکانی فرۆشگەر

پرتەقاڵ دەفرۆشن، بەڵام چەندە باش و تەڕوبڕن؟ چەندە هەرزانیشن؟ هەر بیرم لە پرتەقاڵەکان دەکردەوە. ئەگەر کەسێکی بەپەلپ و بەهانەگربین، ئەوا دەڕۆینە بازاڕێکی میوەی گەورە و لەوێ پرتەقاڵ دەکڕین، بۆ نمونە دەچینە بازاڕی 'یۆنگستۆرگت' _کە لەو کاتەدا تەنها بازاڕی گەورەی فرۆشتنی میوەبوو لە ئۆسلۆدا_ بەتایبەتیش ئەگەر ڕۆژانە چەند کیلۆیەکمان پێویست بێت. دواتریش سواری ترام دەبین و لە 'ستۆرگاتە'وە دێینەوە بۆ 'فرۆگنەر'، چونکە هەروا بە ئاسانی ناتوانین خۆمان فڕێبدەینە ناو تەکسیەکە و پارەیەکی زۆری پێبدەین. بەڵام شتێکی تریش لەئارادابوو و ئەویش زەرفە کاغەزە قاوەییەکەبوو! بەشێوەیەکی گشتی لە دوکانێکی ئاسایدا شتەکانت بۆ دەخەنە ناو کیسێکی نایلۆنەوە. مەگەر تەنها لە بازاڕی 'یۆنگستۆرگت'دا نەبێت کە هەموو شتێکت بۆ دەخەنە ناو ئەو زەرفە کاغەزە قاوەییانەوە؟ ڕێک وەک ئەو زەرفەی کە کچەی پرتەقاڵ بەباوەشیەوە بوو.

ئەوە تەنها یەکێک بوو لەو تیۆریە زۆرانەی کە بە خەیاڵمدا هاتن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێ دووشەممە لەسەریەک خۆم کرد بە بازاڕی 'یۆنگستۆرگت'دا و هەندێک سەوزە و میوەم کڕی. بەلایەنی کەمەوە وەک قوتابیەک شتێکی خراپ نەبوو کە کەمێک خواردنی بەسود بخۆم، بەتایبەتیش چونکە لەم دوادواییەدا بەیەکجاری سەرم کردبووە سەر خواردنی باستورمەی سورەوەکراو و زەلاتەی ڕۆبیان.

جۆرج، بە پێویستی نازانم وەسفی قەرەباڵغی و ژیانی ناو ئەو بازاڕەت بۆ بکەم، بەڵام تۆش هەروەک من بکە و هیچی تر. هەر زۆر بەئاسانی بەدوای کچێکدا بگەڕێ کە قەمسەڵەیەکی نارنجی کڵاوداری لەبەردابێت، لەلای دوکانێکەوە وەستاوە، دەیەوێت دە کیلۆ پرتەقاڵ بکڕێت و لەسەر نرخەکەی مشتومڕیەتی، یان هەوڵبدە

هەمان ئەو کچە گەنجە ببینیت کە نەختێک لەمەوبەر گۆڕپانەکە جێدەهێڵێت و زەرفێکی کاغەزی قورسی بەباوەشەوەیە. ئیتر هەموو شتێکی تر لەیادبکە، مەبەستم لە هەموو ئەو خەڵکانەی ترە.
جۆرج، دەتوانیت ئەو کچە ببینیت؟
من خۆشم یەکەم جار و دووهەم جاریش کە چوومە ئەویَ نائومێدبووم، بەڵام سێهەمین جار لەو پەڕی گۆڕەپانەکەوە چاوم چووە سەر تارماییەک کە شتێکی نارنجی لەبەردابوو، بەڕاستی کچێک بوو کە قەمسەڵەیەکی نارنجی کڵاوداری لەبەردابوو، وادیاربوو لەبەردەم دوکانێکی میوەدا وەستابێت و خەریکبێت پرتەقاڵ بخاتە ناو زەرفێکی گەورەوە، زۆر دڵنیانەبووم.
بەناو قەرەباڵغیەکەدا خۆم گەیاندە ئەو پەڕی گۆڕەپانەکە، هێندەی نەبرد لە دوری چەند مەترێکەوە لەلایەوە خۆمم بینیەوە. ئمم.. لێرەدا دەیانکڕێت! وامدەزانی بەسەر تاوانێکەوە گرتوومە. هەستمکرد ئەژنۆکانم دەلەرزن و لەوە دەترسام بکەوم بەسەر عەرزەکەدا.
کچەی پرتەقاڵ هێشتا زەرفەکەی پڕ نەکردبوو، چونکە ئەو وەک ئێمەی نەدەکرد و بەشێوەیەکی تەواو جیاواز پرتەقاڵی دەکڕی؛ بۆ ماوەیەکی دورودرێژ هەر وەستابووم و لێی وردەبوومەوە، یەکە یەکە پرتەقاڵەکانی هەڵدەگرت و زۆر بەوردی هەڵیدەسەنگاندن، ئەوجا یان دەیخستە زەرفی کاغەزەکەیەوە یان دەیخستەوە ناو سەبەتە گەورەکەی کە پرتەقاڵەکانی تری تێدابوو. ئەوجا زانیم بۆچی لە یەکێک لە بازاڕە ئاساییەکانی فرۆگنەردا پرتەقاڵ ناکڕێت. کچە گەنجەکە وا ڕاهاتبوو کە کۆمەڵێک پرتەقاڵی زۆری لەبەردەستا بێت و بەئارەزوی خۆی لێی هەڵببژێرێت.
من لە ژیانمدا هیچ کەسێکم نەدیوە کە هێندە بە پەلپ و بیانوو بێت لە کڕینی پرتەقاڵدا، بەڵام لەوێدا زۆر دڵنیابووم لەوەی کە ئەو کچە

پرتەقاڵەکانی بۆ ئەوە نەدەکڕی کە ئاوەکەیان بگوشێت. بەڵام ئەی ئەو هەموو پرتەقاڵەی بۆچی بوو؟ جۆرج، تۆ خەیاڵت بۆ هیچ شتێک دەڕوات؟ بەبڕوای تۆ بۆچی نزیکەی نیو خولەکێکی بۆ هەڵبژاردنی هەموو دانە پرتەقاڵێک بەکاردەهێنا و ئەوجا دەیخستە ناو زەرفەکەیەوە، تۆ لەوە تێدەگەیت؟

من خۆم خەیاڵم تەنها بۆ شتێک دەڕۆشت. ئەو کچە لە چێشتخانەی باخچەیەکی ساوایانی گەورەدا کاردەکات، لەدوای نانخواردنی نیوەڕۆ پرتەقاڵێک دەدەن بە هەموو منداڵێک. بێگومان ئاشکراشە کە زۆربەی منداڵان تاڕادەیەکی زۆر حەز بە یەکسانی دەکەن، هەر لەبەرئەوە ئەرکی سەر شانی کچەی پرتەقاڵە کە هەموو ئەو پرتەقاڵانەی کە دەیکڕێ کتومت وەک یەک وابن، واتە هێندەی یەک گەورەبن، وەک یەک خڕبن و ڕەنگە نارنجیەکەشیان وەک یەک بریقەداربێت. بەدەر لەوەش ناچاربوو بیانژمێرێت.

من خۆم پێم وابوو باشم لێکدابێتەوە، هەر بەخەیاڵ کەمێک خەفەتیشم خوارد، چونکە گەیشتمە ئەوەش کە لە هەمان ئەو باخچەی ساوایانەدا کۆمەڵێک پیاوی زیرەک لەگەڵیدا ئیشدەکەن، لەوانەی کە نایانەوێت سەربازی بکەن. بەڵام جۆرج.. هەر زوو لە دوری یەک دوو مەترەوە بینیم شتێکی تەواو جیاوازدەکات. زۆر بەڕونی دەمبینی کچەی پرتەقاڵ زۆر بەوردی بە دوای ئەو پرتەقاڵانەدا دەگەڕێت کە *لەیەک ناچن*، هەر لە ئەندازە و شێوەیانەوە هەتا ڕەنگەکانیان. جگەلەوەش حەزدەکەم سەرنجت بۆ وردەکاریەکی تر ڕابکێشم؛ هەندێک لەو پرتەقاڵانەی کە هەڵیدەبژاردن هێشتا گەڵای دارەکەی پێوەبوو!

زۆر پێم خۆشبوو کە چیتر بیرم لەو کەسە زیرەکانە نەدەکردەوە کە لەگەڵیدا ئیشدەکەن، مەبەستم لەوانەیە کە نایانەوێت سەربازی

بکەن، بەڵام هاوکات ئەوە تەنها شت بوو کە دڵی خۆشدەکردم، چونکە کچەی پرتەقاڵ بەلامەوە وەک مەتەڵێک وابوو و هەروەک مەتەڵێکیش مایەوە.

سەرئەنجام زەرفەکەی پڕکرد، کچەی پرتەقاڵ پارەکەی دا بەدوکاندارەکە و بەرەو 'ستۆرگاتە' کەوتە ڕێ. منیش دوراودور دوایکەوتم، چونکە بڕیارمدابوو ئەو کاتە خۆمی نیشانبدەم کە دەچینە ناو ترامەکەی فرۆگنەرەوە. بەڵام بەداخەوە ڕێک لەو خاڵە گرنگەدا بەهەڵەدا چووم، چونکە ئەو پاشنیوەڕۆیە بەرەو 'ستۆرگاتە' نەچوو تا سواری ترام بێت. بەرلەوەی بگەینە ئەوێ سواری ماشێنێکی تیۆتای سپی بوو، یەکێکیش لە شوێنی شۆفێرەکەدا دانیشتبوو.. پیاوێک بوو.

بەجوانم نەزانی بەڕاکردن خۆم بگەێنمە لای. پێم خۆشنەبوو سەلام لە پیاوەکە بکەم. لەڕاستیدا هێندەشی پێنەچوو و ماشێنەکە کەوتە جوڵە، لە سوچێکەوە پێچی کردەوە و لەبەرچاوم ونبوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم یەک زانیاری گرنگی ترت پێبڵێم؛ ڕێک لەو کاتەدا کە کچەی پرتەقاڵ بە خۆی و زەرفە پرتەقاڵەکەی باوەشیەوە خۆیکرد بە ماشێنەکەدا، ئاوڕێکی دایەوە و تەماشای کردم، بەڵام نازانم منی ناسیەوە یان نا، بەڕاستی دڵنیا نیم لەوە. من تەنها لەوە دڵنیام کە خۆی کرد بە ماشێنێکی تیۆتای سپیدا کە پیاوێکی تێدا بوو، وە هەروەها لەوەش دڵنیام کە سواربوو ئاوڕێکی دایەوە و سەیری کردم.

ئەو پیاوە بەختەوەرە ئەبێت کێ بووبێت؟ فریا نەکەوتم تەمەنی بخەملێنم، خۆ لەوانەیە باوکی بووبێت، کێ دەزانێ؟ بەڵام ڕێشی تێدەچێت کە ... بەهەرحاڵ من چوزانم کێبوو. بڵێیت یەکێک بووبێت لەوانەی کە نایانەوێت سەربازی بکەن؟ نابێت، ئەوان سواری تیۆتای

سپی نابن. یان لەوانەیە کوڕە قۆزەکە بووبێت، باوکی ئەو منداڵە چوار مانگانەی کە هەرلەخۆمەوە ناوم نابوو 'ڕانفی'؟ بەڵام مەرجیش نیە ئەو بووبێت، هیچ شتێکی وام نەدی کە ئاماژە بۆ ئەوە بکات. خۆ ڕەنگە ئەو پیاوەی ناو تیۆتاکە ئەو کەسە بووبێت کە لەگەڵ کچەی پرتەقاڵدا نیازی هەبوو بە گالیسکەی سەر بەفر گرینلاند ببڕن. دەمێکە شێوەی ئەو پیاوەم لە خەیاڵدایە. لەناو شەپۆلی ئەو وێنانەدا ژمە پرتەقاڵەکان و تەوری سەر بەفرم دەدی، کەتەر و داری زیادەی گالیسکەی سەر بەفر و کیسەی خەوم دەدی، تەباخێکی گازی بچکۆلە و شلەی ئامادەکراوم دەهاتە بەرچاو. چاوی ناوەوەم ئەو خێمەیەی دەدی کە تێیدا دەخەوتن، ڕەنگەکەی زەردبوو و هێندەش دەهاتە بەرچاوم کە هەشت سەگ گالیسکەکەیانی ڕادەکێشا.

هەموو ئەو شتانەم بەڕاستی دەدی! خەیاڵ بەوەوە لێنەدەن کە بتوانن خۆیان لە من بشارنەوە. هەر دەتوت سەرتاپای بەکرەی فیلمێک لە مێشکمدایە؛ کچ و کوڕێکی سەیروسەمەرە بە گالیسکەیەکی سەر بەفر بەسەر پانتاییە پان و بەرینە بەبەفرداپۆشراوەکانی گرینلاندا دەڕۆن. کچەکە هەروەک خواوەندی بەفر جوان و بێگەردە. کوڕەکەش لوتی خوارە و دەموچاوێکی ڕەزا تاڵ و نیگایەکی پڕ لە نیەت پیسی پێوەیە، هەر بەو چاڵە بەفرینە قوڵانە دەچێت کە لەوانەیە لەهەرکاتێکدا بێت کچەکەی تێبکەوێت (ئەگەر کچەکە بکەوێتە چاڵێکی ئاوهاوە، بڵێیت دەریبهێنێتەوە؟ یان بۆ خۆی لێی دەدا دەڕوات و پرتەقاڵەکانی دەخوات؟ هەرچەندە سوریش دەزانێ کە جارێکی تر چاوی پێناکەوێتەوە). کوڕەکە هێزێکی پیاوانەی بێهەست و ساردی هەیە، ئێسک گران و دواکەوتووە. هەروەک چۆن ئێمە مێشولەیەک پان دەکەینەوە، ئاوها ئەویش زۆر

بێخەیاڵانە تەقە لە ورچی ناو بەفر دەکات. شتێکی تریش؛ هیچ بەدوری مەزانە کە دەتوانێت لەناو ئەو شەختە بەفرانەدا دەست درێژی بکاتە سەر، خۆ لە هەموو ئەو شتانەوە دورە کە پێیان دەوترێت یاسا و ماف. کێ دەتوانێت لەوێدا بیبینێت؟ کێ لەو شوێنە دورەدەستەدا چاوی لێیانە؟ بەڕاستیش هەروایە جۆرج، جگە لە من کەسی تر ناتوانێت بیانبینێت. هێدی هێدی وێنەی هەموو گەشتەکەیان لەلام ڕونتر و ڕونتر دەبووەوە. تەواوی هەموو ئەو ئامرازانەم دەبینی کە دەبوایە لەگەڵ خۆیاندا بیانبردایە. بەرلەوەی ڕۆژەکە بەسەربچێت ناوی هەر هەشت سەگەکەشم نا، بۆ ئێوارەش بە لیستەیەک ناوی هەموو ئەو شتانەم نوسی کە پێویستبوو لەگەڵ خۆیاندا بیبەن، کێشی هەموو شتەکان دووسەد و چل کیلۆ دەرچوو، بتڵێک شەمپانیای بچکۆلە و چارەکێک ئارەقیشی تێدابوو، دایان نابوو لەو کاتەدا بیخۆنەوە کە دەگەنە 'سیۆراپالوک' یان 'کاناگ'...

بەڵام هەر بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر مێشکم هێورتر بووەوە. هیچ کەسێک لەمانگی دوانزەدا نایەوێت بە گالیسکە گرینلاند ببڕێت. لە مانگی دوانزەدا ئەو جۆرە گەشتانە بەرەو 'ئەنتراکتیک' دەڕوات، بەهەرحاڵ لە بازاڕی میوەکەی ئۆسلۆوە پرتەقاڵ ناکڕن و بۆ ئەوێی بەرن، ئەو جۆرە شتە پێویستانە یان لە 'تشیلی' یەوە یان لە 'خواروی ئەفریقا'وە دەبەن. لەوانەیە تەنانەت یەک پرتەقاڵیش لەگەڵ خۆیاندا نەبەن. ئەو کەسانەی کە ڕوو لە پۆڵی باشور دەکەن، هێندە کالۆری زیادە وەردەگرن لە ڕۆژێکدا کە پێویستیان بە هیچ جۆرە فیتامینێک نابێت. بێ لەوەش پرتەقاڵ کێشەکەی قورسە، لەسەرو هەموو شتێکیشەوە بە چ شێوەیەک بە دوو دەستکێشی ئەستورەوە پرتەقاڵێکی بەستوو پاک دەکرێت؟ پشتبەستن بە ئاوی پرتەقاڵێک لە پۆڵەکاندا هەروەک ئەوە وایە پشت بە ئەسپەکانی 'سکۆت'

ببەستیت. بەڵام خۆ ئەو ناوە پڕە لە شلەمەنی؛ تەنها چەند دڵۆپە بەنزینێک و تەباخێکی باشت پێویستە و هیچی تر. سەهۆڵ و بەفر، واتە ئاو، تەنها شتە کە لەو ناوە زۆربێت. لەڕاستیدا لە سەدا هەشتا زیاتری پرتەقاڵ ئاوە.
لەدڵی خۆمدا وتم؛ ئازیزم کچەی پرتەقاڵ، تۆ کێیت؟ خەڵکی کوێیت؟ ئێستاکە لە چ شوێنێکدایت؟

دیسانەوە دایکم هاتەوە لای دەرگای ژورەکەم و وتی؛ "جۆرج.. چۆنیت؟ باشیت؟"
منیش وەڵامم دایەوە و وتم؛ "باشم.. بەڵام پێم خۆشە ئیتر وازم لێبهێنیت".
بۆ ماوەی یەک دوو چرکەیەک بێدەنگ بوو و ئەوجا وتی؛ "ئاخر پێم ناخۆشە کە دەرگاکەت بە کلیل داخستووە".
منیش وتم؛ "کلیلی دەرگا چ سودێکی هەیە ئەگەر جارجارێک بەکاری نەهێنین؟ جگەلەوەش شتێک هەیە پێی دەڵێن 'ژیانی تایبەتی'، تۆ ئەوە نازانیت؟"
کەمێک نارەحەت بوو، یان وردترێک بیڵێم وابزانم قسەکەم بریندار کرد، بۆیە وتی؛ "جۆرج، پێمواییێت منداڵانە رەفتاردەکەیت. من هیچ بە پێویستی نازانم دەرگاکەت بە کلیل دابخەیت".
"من تەمەنم پانزە ساڵە دایە، منداڵ نیم"
دیاربوو پەستبوو و لەداخا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا. ئیدی هیچ شتێکی ترمان نەگوت.
بێگومان هیچ شتێکم دەربارەی کچەی پرتەقاڵ پێنەگوت. نازانم بۆ بەڵام زۆر بەقوڵی هەستم دەکرد هەموو ئەو شتانەی کە باوکم دەربارەی کچەی پرتەقاڵ بۆی دەگێڕامەوە، شتێک بوون کە هەرگیز

لەوەوپێش بۆ دایکمی نەگێڕاوەتەوە. چونکە ئەگەر بۆ ئەویشی باسکردبێت، ئەوا بێگومان دایکم باسی ئەو کچەی هەر بۆ دەکردم، بەو شێوەیەش پێویستی نەدەکرد باوکم دواهەمین ساتی ژیانی سەر زەوی بەوەوە بکوژێت کە نامەیەکی دوورودرێژ بۆ من بنوسێت. ڕەنگە ئەزموونێکی لە سەردەمی گەنجیدا بینیبێت و لەڕێگەی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکەوە بیەوێت من ئاگادارکاتەوە کە نەکەومە هەمان شتەوە، هەروەک چۆن دەڵێن پیاو بەرامبەر پیاو قسەی کردووە. بەهەرحاڵ، هەروەک خۆی لەوەوپێش ئاماژەی پێدا، پرسیارێکی گرنگی هەیە و دەیەوێت ئاڕاستەم بکات.

تا ئێستاکە جگەلە تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هیچ پرسیارێکی تری لێ نەکردووم، ئاخ، خۆزگە دەیزانی لەو بارەیەوە چەندە زۆرم پێیە.

لەبنەڕەتدا لێکۆڵینەوەکە ناوی 'لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی' بوو، بەڵام لەوە تایبەتی تر ئەوەبوو کە مامۆستاکەمان وتی 'دەبێت بۆ هەموو پۆلەکەی بخوێنیتەوە'؛ دەبوایە وێنەکانیشم نیشانبدانایە. ئەو مەبەستی خراپ نەبوو، بەڵام هەر لەدوای پشووی ئەو وانەیەوە، هەندێک لە کچەکان بەناوی 'ئەنیشتاینی بچکۆلە'وە بانگیان دەکردم. هەو بەڕێکەوتیش ئەو کچانەبوون کە زیاتر سوراوسپیاویان تاقیدەکردەوە، وابزانم چەندەها شتی تریشیان تاقیدەکردەوە.

من هیچ لاریەکم لە چاو ڕشتن و سوراوسپیاو نیە، بەڵام لەڕاستیدا لەسەر ئەستێرەیەکی گەردوون دەژین. بەبڕوای من بیرکردنەوە لە گەردوون شتێکە ناڕادەیەک ناچێتە ئەقڵەوە. هەر بەشێوەیەکی گشتی شتێکی سەرنجڕاکێشە بیر لەوە بکەینەوە کە گەردوونێک بوونی هەیە. بەڵام هەندێک کچ هەن ناتوانن گەردوون ببینن، تەنها چاوڕشتن دەبینن و هیچی تر. لەوانەیە هەندێ کوڕیش هەبن کە

نەتوانن لەسەرو ئاسۆوە جگە لە فتبۆڵێن هیچ شتێکی تر ببینن. هەرچۆنێک بێت ماوەیەکی زۆری پێدەچێت هەتا بتوانین لە ئاوێنەیەکی بچکۆلەی مکیاجکردنەوە بچینە سەر ئاوێنەیەکی گەورەی تەلیسکۆبێک، وابزانم ئەو شتە ئەوەیە کە پێی دەگوترێت 'گۆڕانی تێڕوانینەکان'. ڕەنگە بتوانین ناوی ئەو گۆڕانکاریە بنێین 'گۆڕانکاریەکی سەرسوڕهێنەر'. هیچ کاتێک درەنگ نیە بۆ ئەوەی 'گۆڕانکاریەکی سەرسوڕهێنەر' ئەزموون بکەین. بەڵام زۆرینەی خەڵکی سەرتاپای هەموو ژیانیان دەژین و هێندە نابینن کە لە بۆشایی ئاسماندا دەخولێنەوە. لەم خوارانەوە چەندەها شتی خۆش سەرقاڵی کردووین. پێم وابێت تەنها هێندەمان لەسەرە کە بیر لەوە بکەینەوە بە چ شێوەیەک خۆمان بهێنینە دەرەوە.

ئێمە سەر بەم زەویەین. من مەبەستم نیە گومان لەو ڕاستیە بکەین. ئێمە بەشێکین لە ژیانی سروشتی سەر ئەم زەویە. لە مەیمون و خشۆکەکانەوە هێندە فێربووین کە ڕەگەزەکەمان بە چ شێوەیەک زاوزێدەکات، من هیچ لاریەکم لەوە نیە. گەر لە سروشتێکی تردا بووینایە، ئەوسا لەوانەیە هەموو شتێک بە شێوەیەکی تەواو جیاواز بوایە، بەڵام ئێمە لێرەدا دەژین. دەمەوێت دیسانەوە دوپاتی بکەمەوە و بڵێم؛ من بەهیچ جۆرێک نکۆڵی لەوە ناکەم. بەڵام مەبەستمە بڵێم ئیدی مەرج نیە ئەوە ڕێگەمان لێبگرێت و نەهێڵێت لەسەری لوتی خۆمان کەمێک دورتر ببینین.

تائەندازەیەک 'تیلی_سکۆب' واتای تەماشاکردنی شتێکی دور دەگرێتەوە. بەڵام بڵێیت بەڕاستی ئەم چیرۆکی 'کچەی پرتەقاڵ'ە بە هیچ شێوەیەک پەیوەندیەکی بە تەلیسکۆبەکەی ئاسمانەوە هەبێت؟

بێگومان ئامانجی دانانی ئەو تەلیسکۆبە لە ئاسماندا ئەوە نیە کە نزیکترێک ببینەوە لەو هەسارە و ئەستێرانەی کە تەلیسکۆبەکە دەتوانێت بیانبینێت. گەر وابوایە، ئەوسا هەروەک ئەوە بێئەقڵی دەبوو کە لەسەر نوکی پێ بوەستاینایە بۆ ئەوەی باشترێک چاڵە بورکانیەکەنی مانگ ببینین. هەموو مەبەستی دانانی ئەو تەلیسکۆبە لە ئاسماندا ئەوەیە کە لە خاڵێکی سەرو ئەتمۆسفیری زەویەوە لە گەردوون بکۆڵینەوە.
خەڵکانێکی زۆر پێیان وایە ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە، بەڵام لەڕاستیدا وا نیە. بەڵکو ناجێگیری ئەتمۆسفیری زەویە کە ئەو دیمەنە دەخوڵقێنێت، ڕێک وەک ئەوە وایە کە تەماشای بەرد و زیخی ژێر ئاوێکی بەخوڕ بکەین، لەوێشدا بەردەکان لەبەرچاوماندا دەلەرنەوە و دەجوڵێنەوە. دەشتوانین بەپێچەوانەوە نمونەیەک بهێنینەوە؛ کاتێک کە لە بنی ئاوی مەلەوانگەیەکەوە تەماشای سەرەوە دەکەین، ناتوانین بەوردی ئەو شتانە ببینین کە لەقەراغی مەلەوانگەکەدا دەجوڵێنەوە.
هیچ تەلیسکۆبێکی سەر زەوی ناتوانێت وێنەی زۆر ڕونی گەردوونمان بۆ بگرێت. تەنها تەلیسکۆبی ئاسمانیی هۆبڵ ئەو توانایەی هەیە. هەر لەبەرئەوەشە کە ئەو تەلیسکۆبە، لەچاو تەلیسکۆبەکانی سەر زەویدا، زۆر زیاترێکی گەردوونمان بۆ دەخاتە ڕوو.
خەڵکانێکی زۆر هێندە کورتبینن کە ناتوانن ئەسپێک و مانگایەک لەیەک جودا بکەنەوە، یان جیاوازی نێوان ئەسپێکی ئاوی و زێبرایەک ناکەن. ئەو جۆرە خەڵکانە پێویستیان بە چاویلکەیە بۆ ئەوەی شتەکان باشترێک ببینن.
من لەوەپێش نوسیم هەر پاش ماوەیەکی کەم هەڵەیەکی گەورەیان لە بواری سافێتی هاوێنە سەرەکیەکەیدا بۆ دەرکەوت و لەساڵی

1993دا لەلایەن ئەستێرەناسەکانی کەشتی ئاسمانی 'ئێندیڤۆر'ەوە ئەو هەڵەیە چاککرایەوە. بەڵام لە ڕاستیدا هیچ دەستکاریەکی هاوێنەکەیان نەکرد، بەڵکو چاویلکەیەکیان بۆ دانا. ئەو چاویلکەیە لە دە ئاوێنەی پچکۆلە پێکهاتووە و پێی دەگوترێت "COSTAR" کە کورتکراوەی ' Corrective Optics Space Telescope Axial 'Replacementە.

بەڵام نەء، تا ئەو کاتەش نەمدەزانی ئەو تەلیسکۆبەی ئاسمان چ پەیوەندیەکی بە 'کچەی پرتەقاڵ'ەوە هەیە. ئێستاکە تێدەگەم، هەڵبەتە لەم کاتەدا کە ئەم دێڕانە دەنوسم، چونکە دەمێکە ئەو نامە دورودرێژەم خوێندەوە کە باوکم بەر لە مردنی بۆ منی نوسیبوو. لەڕاستیدا چوار کەڕەتم خوێندەوە، بەڵام بێگومان نامەوێت هیچ شتێکی بۆ خوێنەرە نوێکان دەربخەم.

دە بیگێڕەوە بابە! ئەو چیرۆکە بۆ ئەو کەسانە باس بکە کە ئێستاکە ئەم کتێبە دەخوێننەوە.

جاری دوای ئەوە کچەی پرتەقاڵم لە ئێوارەی جەژنی لەدایک بوونی مەسیحدا بینیەوە، هەر بەڕاستی لەو ئێوارەیەدا بینیمەوە. ئەو جارەیان بەڕاستی قسەم لەگەڵدا کرد. یان وردترک بڵێم یەک دوو وشەمان بەیەکتری وت.

ئەو کاتە من لەگەڵ خوێنکارێکی برادەرمدا کەناوی 'گۆنار'بوو لە باڵەخانەیەکی بچکۆلەی گەڕەکی 'ئادەمستوون'دا دەژیام. بەڵام وامدانابوو ئێوارەی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح لەگەڵ خێزانەکەماندا لە گەڕەکی 'هوملەفای' بەرمەسەر. هەر تەنها دایک و باوکم و براکەم بوو، مەبەستم لە مامە 'ئاینە'یە. 'ئاینە' سێ ساڵ لە

من بچوکتره و ئەو زستانە لە پۆلی سێی ناوەندی بوو. چەند ساڵێک دواتر نەنە و باپیرەت گواستیانەوە بۆ 'تیوسنبێرگ'.
هیچ ئومێدێکی وام نەمابوو کە کچەی پرتەقاڵ ببینمەوە، بەدەرلەوەش چەندەها گومان و خەیاڵم بە مێشکدا دەهات و نەمدەزانی ئەو پیاوەی ناو تیۆتا سپییەکە کێ بوو. هەر لە خۆیەوە بەرلەوەی بگەڕێمەوە بۆ هوملەفای، وام بەخەیاڵدا هات کە هەروا بۆ خۆشی خۆم بکەم بە کڵێسەیەکدا و ئامادەی نوێژی ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح بم. هێشتا ئەو کچە پڕنهێنییە زۆر مەستی کردبووم، هەستمدەکرد ئەویش بێتە کڵێسە و ئەوجا دواتر بڕواتەوە جەژنەکەی لەگەڵ ئەوانەدا بکات کە دەبوایە لەگەڵیدا بوونایە (ئەی ئەوانە کێ بوون؟ بەڕاست، کێ بوون؟). لەدڵی خۆمدا وتم' باشترین شوێن کە ڕێی تێبچێت کچەکەی تێدا ببینم، کڵێسە گەورەکەی شارە، ڕاستترێک بیڵێم لەو شوێنەدا کەمترین بواری بینینیم هەبوو.
لێرەدا بە پێویستی دەزانم هەروا بۆ دڵنیاییت بڵێم کە من هیچ شتێکم لەم باسەی کچەی پرتەقاڵەدا هەروا بۆ خاتری چیرۆک نەهۆنیوەتەوە. جۆرج، خێوەکان درۆ ناکەن، چونکە لەڕێگەی درۆکەیانەوە هیچ شتێکیان دەست ناکەوێت. بەڵام لەلایەکی تریشەوە هەموو شتێک ناخەمەڕوو. چ کەسێک تا ئێستاکە شتێکی بێ سودی ئاوهای گێڕاوەتەوە کە هەموو شتێک باسبکات؟
من بە پێویستی نازانم هەموو ئەو هەوڵانەی خۆمت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێناوی بینینەوەی کچەی پرتەقاڵدا دام و شکستم تێدا هێنان. چەندەها ڕۆژ و چەندەها حەفتە هەموو گەڕەکی فرۆگنەرم پشکنی، بەڵام من نامەوێت ئەوانە باس بکەم. گەر وا بکەم، ئەوا چیرۆکێکی یەکجار دورودرێژی لێدەردەچێت. بەلایەنی کەمەوە هەموو حەفتەیەک چوار ڕۆژ دەچوومە پارکەکەی فرۆگنەر و پیاسەی

دورودرێژم تێدا دەکرد، زۆر کەڕەتیش چاوم دەچوە سەر کچێک و وامدەزانی خۆیەتی، یان لەسەر پردە گەورەکەی بەردەم قاوەخانەی ناو پارکەکەدا دەهاتە بەرچاوم، یان لەسەرەوە لەلای 'مۆنۆلیتن' دەمبینی، بەڵام لەڕاستیدا هەرگیز ئەوم نەبینی. چەند جارێکیش هەر بەو ئومێدەی کە بەرێکەوت چاوم پێبکەوێتەوە خۆمکرد بە سینەماکاندا، بەڵام تەنانەت هێندە دانەدەنیشتم هەتا هەموو فیلمەکە ببینم، زۆرجار هەر کە ڕیکلامەکان تەواو دەبوون و کچەی پرتەقاڵ دەرنەدەکەوت، هەڵدەسام و دەچوومە دەرەوە، ڕوویدەدا دوای ئەوە بلیتی سینەمایەکی تر ببڕم. نەختە نەختە زۆر زیرەکانە ئەو فیلمانەم هەڵدەبژارد کە بە خەیاڵی خۆم ڕێی تێدەچوو کچەی پرتەقاڵ حەزی لێیان بێت _یەکێک لەوانە ناوی 'خاڵی وەرچەرخان' بوو، دانەیەکی تریان فیلمێکی سویسری بوو و ناوی 'کچەی دەست نەخشین'بوو. بەڵام واز لە هەموو وردەکاری ئەو هەوڵانەم دەهێنم.
جۆرج، لەم چیرۆکەدا تەنها یەک خەتی سور هەیە، ئەویش ئەو چەند جارەیە کە بەڕاستی ئەو کچەی پرتەقاڵی پڕنهێنیەم تێدا بینی. بێمانایە بێم و هەموو ئەو کەڕەتانەی کە *نەمبینی* باسبکەم و بیانکەمە شتێکی گەورە. هەروەک ئەوە وایە چیرۆکێکی بێسود لەسەر هەموو ئەو کاغەزی یانسیبانە بهۆنیتەوە کە دەرنەچوون. تۆ هەرگیز چیرۆکێکی ئاوهات بیستووە؟ قەت لە ڕۆژنامەیەکدا یان لە گۆڤارێکی حەفتانەدا وتارێکت دەربارەی پیاوێک خوێندۆتەوە کە یانسیبی بۆ دەرنەچووبێت؟ ئەم چیرۆکەی منیش کتومت هەر هەمان شێوەیە. چیرۆکی کچەی پرتەقاڵ هەروەک چیرۆکی یانسیبێکی گەورەیە کە تەنها ژمارە براوەکانی تێدا دیارە. هەر بیر لەو هەموو یانسیبانە بکەرەوە کە لە ماوەی حەفتەیەکدا دەفرۆشرێن. وا بیهێنەرە بەرچاوت کە هەر هەموویان لە ژورێکی گەورەدا دانرابن، ڕەنگە

هۆڵێکی گەورەی جومناستیکێک پڕبکاتەوە. ئەوجا هەموو ئەو یانسیبانەی کە لەسەرو ملیۆنێک نابەنەوە، زۆر بەئاسانی بە جادوویەکی قەشەنگ وندەبن. جۆرج، دوای ئەوە لە هۆڵی جومناستیکە گەورەکەدا هێندە یانسیب نامێنێتەوە و ئێمەش ڕێک دەربارەی ئەو چەند دانە کەمە لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە!
بەهەرحاڵ ئێمە لە ئێستاکەدا بەدوای دۆزینەوەی شوێنەواری کچەی پرتەقاڵەوەین، گرنگی بەو دەبەخشین و هەموو ئەم چیرۆکەش تەنها هەر دەربارەی ئەوە. لەبەرئەوە باشترە ئەمجارەیان هەموو شتێکی تر پشتگوێبخەین. خەتێک بەسەر هەموو خەڵکانی تری شارەکەدا دەهێنین. هەموو ئافرەتەکانی تر هەر زۆر بە ئاسانی دەخەینە ناو یەک قەوسی گەورەوە.

چوومە ناو کڵێسەکەوە و ئەوجا چاوم پێکەوت، لەو کاتەدا بینیم کە پیانۆژەنەکە وەک سەرەتایەک دەستیکرد بە لێدانی پارچە مۆسیقایەکی 'باخ'. تاوناتاوێک موچوڕکەم پیادادەهات و جارجارێکیش لەشم گەرم دادەهات.
کچەی پرتەقاڵ لەبەری ئەوبەرەوە لەلای ڕاڕەوە سەرەکیەکەوە دانیشتبوو، گومانم نەبوو کە خۆیبوو، کەڕەتێکیش لە کاتی ئەو سروتەدا سەرێکی هەڵبڕی و تەماشای کۆرسەکەی کرد، ئەوان گۆرانیەکی جەژنی لەدایک بوونیان دەوت. لەوێدا نە قەمسەڵە نارنجیەکەی لەبەردابوو و نە زەرفێکی گەورەی پرتەقاڵیشی لەباوەشدا دانابوو. بێگومان هەر دەبوو بەو شێوەیەش بێت چونکە ڕۆژی جەژنی لەدایکبوونی مەسیحبوو. پاڵتۆیەکی ڕەشی لەبەردابوو، تەوقەیەکی گەورەش هەموو قژی لە پشتی ملیدا کۆکردبۆوە، لەوەدەچوو زیو بێت، بگرە لە زیوێکی پاکی ناو حەکایەتەکان دەچوو،

لەدڵی خۆمدا وتم کێ دەڵێت یەکێک لە حەوت کورتەبنەکە دروستی نەکردووە؟ ئەوانەی کە کاتی خۆی ژیانی 'بەفرە سپی'یان ڕزگارکرد.. بەڵام کەسێکی لەگەڵدابوو و نەمدەزانی کێیە. پیاوێک لەلای ڕاستیەوە دانیشتبوو، بەڵام لە ماوەی ئەو سروتەدا تەنانەت یەک کەرەتیش نەمبینی ئاوڕ لەیەک بدەنەوە. بەپێچەوانەوە، لەدوای تەواوبوونی سروتەکە بینیم ئەو پیاوەی کە لەلای ڕاستی کچەی پرتەقاڵەوە دانیشتبوو، ئاوڕی لە ژنێک دایەوە کە لەلای ڕاستی خۆیەوە دانیشتبوو و شتێکی بە گوێدا چرپاند. ئەو شتەم وەک جوڵەیەکی جوان دێتەوە یاد. هەڵبەتە پیاو بە ئارەزوی خۆیەتی کە بەلای ڕاستدا یان بەلای چەپدا ئاوڕبداتەوە، ئەو پیاوەش وەک هەموو پیاوێکی دی وا بوو، بەڵام وەک وتم بەلای ڕاستیدا ئاوڕیدایەوە، دەتوانین بڵێین خۆشبەختانە بە لا دروستەکەدا ئاوڕیدایەوە. هەستێکی سەیرم هەبوو و هەر دەتوت من بەو پیاوە دەڵێم بە چ لایەکدا ئاوڕ بداتەوە.

لەلای چەپی کچەی پرتەقاڵەوە ئافرەتێکی قەڵەوی پیر دانیشتبوو، بە هیچ شێوەیەک لەوە نادەچوو کە کچەی پرتەقاڵ بناسێت، بەڵام خۆ ڕێشی تێدەچێت لەوەوپێش لە بازاڕی 'یۆنگستۆرگت'دا یەکتریان بینیبێت، چونکە ئەو ئافرەتە بەتەمەنە هەر زۆر لە دوکاندارێکی ئەو ناوە دەچوو و ڕەنگە هەر لەمێژەوە لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبن کە لە بۆنەیەکی خۆشی ئاوهادا پێکەوەبن، بۆ نا، جۆرج؟ هیچ شتێک هەیە ڕێگایان لێبگرێت؟ کچەی پرتەقاڵ یەکێکە لە مشتەریە هەرە باشەکانی ئەو ئافرەتە، هەر هیچ نەبێت باشترین مشتەری پرتەقاڵەکانیەتی. کیلۆیەک پرتەقاڵی مەغریبی بە حەوت کرۆنە، هەڵبەتە زۆر گران نیە، بەڵام بە شەش کرۆن و نیو بە کچەی

پرتەقاڵی دەفرۆشێت، هەرچەندە نیو سەعاتێک زیاتری پێدەچێت هەتا زەرفەکەی پڕدەکات لەو پرتەقاڵانەی کە لە یەکتر ناچن.

گوێم لە قسەکانی قەشەکە نەبوو، بەڵام وابزانم باسی ماریا و یوسف و سەردەمی منداڵی مەسیحی دەکرد، بێگومان لەو بۆنەیەدا هەر باسی ئەو شتانە دەکرێت. ئەوجا باسی منداڵانی کرد، پێم خۆشبوو ئەو باسەی هێنایە پێشەوە، چونکە ڕۆژەکە ڕۆژی ئەوانە. بەڵام من هەر چاوەڕوانبووم سروتەکە تەواوبێت. دواتر مۆسیقای کۆتایی سروتەکە لێدرا، بەشداران هەستانە سەرپێ و منیش هەوڵمدا بە هەر شێوەیەک بێت وابکەم کە کچەی پرتەقاڵ لەپێش منەوە بچێتە دەرەوەی کڵێسەکە. بەلای کورسیکەمدا تێپەڕی. سەرێکی لەقاند و دڵنیا نەبووم لەوەی کە لەگەڵ منی بووبێت. بەڵام بەلایەنی کەمەوە هێندەم بۆ دەرکەوت کە بە تەنهایە. زۆر لەو ئافرەتە جوانتربوو کە من لە خەیاڵمدابوو. هەر لەوە دەچوو هەموو ڕوناکی ئەو جەژنە لەو تەنها ئافرەتدا کۆبووبێتەوە.

هووووها! تەنها من دەمزانی کە ئەو ئافرەتە کچەی پرتەقاڵی ڕاستەقینەیە و لەوەش زیاتر پڕە لە نهێنی نادیار. هەر منیش دەمزانی کە لە حەکایەتێکی ترەوە هاتۆتە ئێرە، ئەو شوێنەش یاسای تایبەتی خۆی هەیە و لە یاسا باوەکانی ئێرە ناچێت. من دەمزانی بۆ سیخوڕی هاتبووە ئێرە، سیخوڕی ئەم هەقیقەتەمانی دەکرد. بەڵام لەوێدا هەروەک کەسێکی ئاسایی لای خۆمان هاتبووە ناو ئەو کڵێسە گەورەیەوە، ئەویش وەک ئێمە دەیویست دڵخۆشی خۆی بەرامبەر لەدایکبوونی *ڕزگارکەرەکەمان* دەرببڕێت. ئەوەش خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپ نەبوو، بگرە بە پێچەوانەوە من پێموابوو ئافرەتێکی میهرەبان بێت.

دوای کەوتمە دەرەوە. چەند کەسێک لەبەردەگای کڵێسەکەدا وەستابوون و ئومێدی جەژنێکی خۆشیان بۆ یەکتری دەخواست، بەڵام من چاوم بڕیبووە تەوقە زیوینە ئەفسوناویەکەی پشتی ملی کچەی پرتەقاڵ. بەلای منەوە لە هەموو جیهاندا تەنها یەک کچی پرتەقاڵ هەبوو، چونکە هەر ئەو لە هەقیقەتێکی ترەوە هاتبووە ئێرە. بەرەو لای 'گرێنسن' هەنگاویدەنا، منیش لەدوری یەک دوو مەترێکەوە هەر بەدوایەوەبووم. بەفر دەباری و کڵۆ بەستوەکان لە ئاسماندا سەمایاندەکرد. بەڵام من تەنها ئەو کڵۆ بەفرانەم دەبینی کە لەسەر قژە تۆخەکەی کچەی پرتەقاڵ دەوەستانەوە. خۆم بەخۆم دەوت 'ئێستا قژی تەڕدەبێت، دەبوایە چەترێکم پێبوایە، یان هەر هیچ نەبێت ڕۆژنامەیەک بۆ ئەوەی نەمهێشتایە سەری تەڕبێت'.

ئەو دیمەنەم وەک شتێکی شێتانە دەهاتە بەرچاو، خۆشم ئەوەم دەزانی، خۆ هەر هیچ نەبێت ئەوەندە خۆمم دەناسی. بەڵام ئەو ئێوارەیە ئێوارەی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح بوو. ئەگەر سەردەمی پەرجووش بەسەرچووبێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە یەک ڕۆژی ئەفسوناویمان ماوە و پێی دەچێت هەموو شتێکی تێدا ڕووبدات. بەڵێ هەموو شتێک! پەریەکان بەدزیەوە لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە و کچەی پرتەقاڵیش هەروا بێباکانە بە شەقامەکاندا دەسوڕێتەوە.
ڕێک لەلای 'ئیوقە سلۆتگاتە'دا پێی گەیشتمەوە، هەنگاوێک پێشی کەوتم، ئینجا ئاوڕێکم لێدایەوە و بەخۆشیەکەوە وتم "جەژنت پیرۆز بێت!"
دیاربوو سەری سوڕمابوو، یان وا خۆی دەردەخست کە سەری سوڕماوە. بەوریاییەوە زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوەکانی. لەوە نەدەچوو

سیخوڕ بێت. لە کچێک دەچوو کە لە پێناوی ناسینیدا ئامادەبووم هەموو شتێک ببەخشم. پێی وتم؛ "جەژنی تۆش پیرۆز!".
ئەوجا بەڕاستی خەندەیەکی گەورەی بۆ کردم. دەیسانەوە کەوتینەوە ڕێ. پێم وانەبوو هیچ لاریەکی لەوە هەبێت کە لە تەنیشتیەوە بڕۆم. زۆر دڵنیا نەبووم لەوە، بەڵام وابزانم پێی خۆشبوو. بەرزایی دوو پرتەقاڵم دەبینی، کە لەژێر پاڵتۆ ڕەشەکەیەوە حەشاریدابوون. هەردووکیان کتومت وەک یەک گەورەبوون و وەک یەکیش خڕبوون. ئەو دیمەنە شڵەژانمی، شەرمم دەکرد. واملێهاتبوو بەرامبەر بە هەموو شێوەیەکی خڕ زیاد لە ڕادە هەستیاربم.
هەستمکرد دەبێت شتێکی تریش بڵێم. گەر وام نەکردایە، ئەوا ناچاربووم لێی جودا ببمەوە و وا خۆم نیشانبدایە کە سەرم قاڵە. بەڵام من لە ژیانمدا هێندەی ئەو ڕۆژە کاتم نەبووە. هەستمدەکرد لەلای سەرچاوەی کاتەوەبووم، لەلای ئامانج و مانای کاتەوە وەستابووم. دێڕێکی 'پییت هاین'ی شاعیرم بیرکەوتەوە کە دەڵێت؛
'ئەو کەسەی کە لە ئێستادا نەژی، قەت ناژی، ئەی تۆ چی دەکەیت؟'
من لەو 'ئێستایەدا' دەژیام و کاتی خۆشی بوو، چونکە هەرگیز لەوەوپێش نەژیابووم. شتێک لەناوەوەمدا ئاهەنگی دەگێڕا. بەر لەوەی فریابکەوم بیربکەمەوە، وتم؛ "کەواتە نارۆیت بۆ گرینلاند؟"
شتێکی بێ مانام وت. کەمێک چاوی نوقاند و وتی؛ "ماڵمان لە گرینلاند نیە"
هێندەم بەخەیاڵدا هات کە گەڕەکێکی ئۆسلۆ ناوی 'گرینلاند'ە. زۆر شەرمەزاربووم، بەڵام وام بەباشزانی لەسەر قسەکەم بەردەوام بم، بۆیە وتم؛ "مەبەستم لە وڵاتی پڕبەفری 'گرینلاند'ە. بە گالیسکەیەک نارۆیت کە هەشت سەگ ڕایدەکێشن و دە کیلۆ پرتەقاڵیشت لەناودا داناوە".

نازانم خەندەیەک کەوتە سەر لێوانی یان نا؟
ڕێک لەو ساتەدا لەوە تێگەیشتم کە پێیدەچوو ڕووداوی ناو ترامەکەی فرۆگنەری بیر نەمابێت. هەستم بە نائومێدی دەکرد و خەریکبوو هاوسەنگی خۆم لەدەستبدەم، بەڵام لە هەمان کاتیشدا شتێکی ئارام بەخشیشبوو. خۆ دوو مانگێک بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیبوو کە زەرفە پڕ پرتەقاڵەکەی دەستیم قلّپکردەوە، جگەلەوەش قەت لەووپێش یەکتریمان نەدیبوو و هەموو ڕوداوەکەش تەنها چەند چرکەیەکی خایاند.
بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت دەبوایە قاوەخانەکەی کارڵ یۆهان'ی لەیادبوایە. یان هەمیشە لە قاوەخانەکاندا دادەنیشێت و دەستی پیاوانی نامۆ دەگرێت؟ ئەو خەیاڵەم بەلاوە خۆش نەبوو، چونکە گومانی دەخستە سەر. تەنانەت کچێکی پرتەقاڵی ڕاستەقینەش دەبێت وریابێت و بەچەپ و ڕاستدا هەروا بێ سەروبەر بەرەکەت نەبەخشێتەوە.
لەدوامەوە گوتیەوە؛ "پرتەقاڵ؟" ئەوجا بەگەرمی زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوانی، خەندەکەی هێندە گەرم و گوڕبوو هەر لە هەڵاوی ڕەشەبای بیابانەکان دەچوو.
منیش وتم "بەڵێ پرتەقاڵ، بەشی دوو کەسیشتان پێ بێت کە بە گالیسکەی سەر بەفر لەمسەرەوە بۆ ئەو سەری گرینلاند بڕۆن"
لەشوێنی خۆیدا وەستا. دڵنیانەبووم کە چیتر بیەوێت لەسەر ئەو باسە بڕۆین. نازانم، ڕەنگە وای بۆ چووبێت کە من بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بمەوێت داوای لێبکەم لەگەڵمدا بەگالیسکەیەکی سەر بەفر، سەفەرێکی پڕمەترسی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری گرینلاند بکەین؟ بەڵام دیسانەوە تەماشایەکی کردمەوە، چاوە تاریکەکانی ئاوێزانی چاوەکانم بوون و پرسی؛ 'ئەوە خۆ تۆیت.. وایە؟"

سەرێکم بۆ لەقاند، هەرچەندە بەڕاستی نەمزانی مەبەستی لەو پرسیارە چیە، چونکە بەهیچ شێوەیەک ڕێی تێنەدەچوو من تەنها کەس بووبم کە بە باوەشێک پرتەقاڵەوە ئەو کچەی بینیبێت. ئەوجا وەک ئەوەی شتێکی کۆنی بیرکەوتبێتەوە وتی؛ "تۆ بوویت کە لەناو ترامەکەی فرۆکنەردا خۆتت پێدا کێشام؟ وا نیە؟"
سەرێکم بۆ لەقاند.
"بەڕاستی شتێکی بێ ئەقڵیت کرد؟"
منیش وتم؛ "هەر ئەو بێ ئەقڵەش دەیەوێت داوای لێبوردنت لێبکات کە ئەو هەموو پرتەقاڵەی لەدەست خستیتە خوارەوە"
لەدڵەوە پێکەنی، لەوەدەچوو پرتەقاڵ دواهەمین شت بێت کە بیری لێبکاتەوە. سەرێکی لار کردەوە و وتی؛ "لەبیری خۆتی بەرەوە! ئەو ڕۆژە وەک کەسێکی خوێن شیرین هاتیتە بەرچاوم"

ببورە جۆرج لێرەدا قسەکان بە خۆم دەبڕم، بەڵام دیسانەوە ناچارم هانات بۆ بەرمەوە و بزانم دەتوانیت مەتەڵێکم بۆ لێکبدەیتەوە یان نا؟ وابزانم تۆش هێندە دەبینیت کە لێرەدا شتێک لە چیرۆکەکەماندا هەیە کە بەهیچ شێوەیەک ڕێک ناکەوێت. هەر یەکەمین جار کە کچەی پرتەقاڵ لەناو ترامەکەدا بینیمی و ڕوداوە ناخۆشەکە ڕوویدا، زۆر ڕاستەوخۆ تەماشای دەکردم، تا ئەندازەیەک خۆممدا بەدەستیەوە. هەر لەوە دەچوو کە منی لەناو ئەو هەموو خەڵکەی تری ناو ترامەکەدا هەڵبژاردبێت، زۆر بەکورتی وا دەهاتە بەرچاوم کە منی لەناو هەموو خەڵکانی تری سەر زەویدا هەڵبژاردبێت. دواتریش پاش حەفتەیەک ڕێگەی پێدام لە قاوەخانەکەدا لە سەر مێزەکەی دابنیشم. بۆ ماوەی خولەکێکی تەواو هەر دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە چاوم، ئینجا دەستی خستە سەر دەستم. دەستی پڕبوو لە

هەستی پڕنەشئەی ئەفسوناوی. دواتر یەک دوو خولەکێک بەر لەوەی زەنگی جەژنی لەدایک بوونی مەسیح لێبدرێت، دیسانەوە یەکتر دەبینینەوە، کەچی لەوێدا لەیادی کردووم و نامناسێتەوە؟
لێرەدا نابێت هێندەمان لەیاد بچێت کە ئەو لە حەکایەتێکی ترەوە هاتۆتە ئێرە، واتە لە حەکایەتێکەوە هاتووە کە کۆمەڵێک یاسای تایبەتی خۆی هەیە و جیاوازە لە یاساکانی لای خۆمان. چونکە دوو هەقیقەتمان هەیە و هاوتەریبی یەکتر دەڕۆن؛ یەکەمیان ئەو دانەیەیە کە مانگ و خۆری تێدایە و دووهەمیشیان ئەو حەکایەتە پڕنهێنیەیە کە کچەی پرتەقاڵ لە پڕێکدا دەرگاکەی کردەوە. بەڵام جۆرج، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها دوو شت ڕێیتێدەچوو؛ گومانم نیە کە ئەو دوو ڕووداوەی لە بیرە و منی دێتەوە یاد، ڕەنگە ڕووداوەکەی 'یۆنگستۆرگت'ی لەبیر بێت، بەڵام هەر ئەوەندەیە کە خۆی وانیشاندا کە نامناسێتەوە، وایدەرخست کە منی لەیادکردووە. ئەوە یەکەمیان. دووهەمیان زیاترێک نائارامی کردم، دە تۆ گوێبگرە؛ من وای بۆ چووم کە ئەو کچە داماوە زۆر تەواونەبێت، وەک دەڵێن کەمێک مێشکی ناساغ بێت. بەلایەنی کەمەوە گرفتێکی گەورەی یادوەری هەبێت. لەوانەیە نەیتوانیبێت هیچ شتێکی لەبیربێت و لە چرکەیەکەوە بۆ چرکەیەکی تر شتی بیرچووبێتەوە، ڕەنگە هەموو سمۆرەکان ئەو کێشەیەیان هەبێت. سمۆرە ژیانێکی تایبەتی خۆی دەژی، تاوێک لێرە و تاوێکی تر لەوێ. چونکە "ئەوەی لە ئێستادا نەژی، قەت ناژی، ئەی تۆ چی دەکەیت؟" لە ژیانێکی ئاوها چالاکدا شوێنی یادوەری و تێڕامانی تێدا نابێتەوە، چونکە سەرقاڵی خۆیەتی و بەس. یاساکانی ئەو حەکایەتەی کە کچەی پرتەقاڵی لێوە هاتبوو بەو شێوەیە بوون. بەڕاست، هەر ئێستاکە ناوی ئەو حەکایەتەم بیرکەوتەوە، ناوی "وەرە_ ناو_ خەونەکەمەوە"بوو.

بەڵام جۆرج لەلایەکی ترەوە ناچاربووم ڕوبەڕوی خۆم ببمەوە و بزانم ئەو کچە بە چ شێوەیەک لە من گەیشتووە. منیش دانیشتبووم و دەستیم گرتبوو و زۆر بە قوڵی تەماشای ناو چاویم دەکرد. بەڵام ئەی دواتر چیمکرد کە لەپاش سروتی جەژنی لەدایکبوون بینیمەوە؟ وتم "جەژنت پیرۆزبێت"، هەڵبەتە ڕاستە قسەکەم لە شوێنی خۆیدا بوو، بەڵام پێم نەوت "کەڕەتی پێشوو کە یەکترمان بینی کاتێکی خۆشم بەسەربرد و سوپاست دەکەم". نەخێر.. پرسیارم لێکرد و وتم "نیازتە بڕۆیت بۆ گرینلاند؟" مەبەستم لەوەیە وتم "دەتەوێت بە گالیسکەیەک، کە هەشت سەگ ڕایدەکێشن، ئەو وڵاتی پڕبەفرە ببڕیت و دە کیلۆ پرتەقاڵیش لەگەڵ خۆتدا بەریت؟" ئاخۆ منی بە چ شێوەیەک بینیبێت؟ ڕەنگە لەو بڕوایەدابووبێت کە نەخۆشی شیزۆفرینیام هەبووبێت.
بەهەرحاڵ لەو کاتەدا هەریەکەمان لە ئاوازێک دەمانخوێند. جۆرە یاریەکی دژوارمان بە تۆپ دەکرد و یاساکانی لەڕادەبەدەر زۆربوون. بەردەوام شەقمان لە تۆپەکان هەڵدەدا، بەڵام هیچ دانەیەکیان نەکەوتە ناو گۆڵەکەوە.

جۆرج، ڕێک لەوێدا تەکسیەکی بەتاڵ لە 'ئاکەرسگاتە'وە بەروخوارەوە هات. کچەی پرتەقاڵ دەستی ڕاستی بۆ بەرزکردەوە، تەکسیەکە وەستا و ئەویش بە خێرایی بەرەوڕوی ڕۆیشت...
سەندرێلام بیردەکەوێتەوە، کە دەبوایە پێش کاتژمێری دوانزەی شەو هۆڵی بالێتی کۆشکەکەی بەجێ بهێشتایە، ئەگەر نا، ئەوا جادووەکەی بەتاڵ دەبووەوە. بیر لەو کوڕی پاشایە دەکەمەوە، کە لە بالکۆنی کۆشکەکەدا بەتەنها ماوەتەوە _جێیان هێشتووە، جێیان هێشتووە.

بەڵام دەبوایە هێندەم ببینیبایە کە شتی وا ڕێیتێدەچێت. بێگومان بەرلەوەی زەنگی جەژنی لەدایکبوون لێبدرێت، دەبوایە کچەی پرتەقاڵ لەماڵەوە بوایە. چونکە *یاساکان بەو شێوەیە بوون*. ئێ خۆ کچەی پرتەقاڵ لەدوای زەنگی جەژنی لەدایکبوونەوە بە شەقامەکاندا ناسوڕێتەوە. گەر وا بوایە، ئەی کەواتە بۆچی زەنگیان لێدەدا؟ مەگەر زەنگی کڵێسەکان هەر لەبەرئەوە نەبێت کە پیاوە گەنجەکان ئاگاداربکاتەوە و نەهێڵێت بکەونە داوی کچەی پرتەقاڵەوە؟ لەوێدا کاتژمێر چارەکی دەویست بۆ پێنج، پاش نەختێک لەو سەری 'ئیوڤە سلۆتگاتە' نەفرین لێکراوەدا بەتەنها مامەوە.

زۆر بەپەلەپەل بیرمدەکردەوە. تەنها چرکەیەکم لەبەردەستدابوو و دەبوایە شتێکی وام بکردایە یان شتێکی وا جوان و زیرەکانەم بگوتایە کە کچەی پرتەقاڵ بۆ هەتاهەتایە لەبیرم نەکات.

هەڵبەتە دەمتوانی لێی بپرسم 'ماڵتان لە کوێیە؟' یان بڵێم 'لەوانەیە لەسەر یەک ڕێگا بین'. یان دەمتوانی بە پەلە سەد کرۆنیەکی لەبری ئەو دە کیلۆ پرتەقاڵە بدەمێ کە لە دەستیم خستە خوارەوە، سی کرۆنی ئەو پارەیەشم بخستایەتە بری ئەو زیانەی کە لێی کەوتووە، خۆ من نەمدەزانی نرخەکەیان بۆ داشکاندووە یان نا. یان هەر هیچ نەبێت بۆ ئەوەی فزوولیەتی خۆم دابمرکێنمەوە دەمتوانی پرسیارێکی لێبکەم و بڵێم 'ئەرێ تۆ بۆچی زەخیرەی پرتەقاڵ دەخەیت؟ نەک لەبەرئەوەی زەخیرە خستنی پرتەقاڵ شتێکی سەیر و ناوازەیە، بەڵام بۆ بەتایبەتی پرتەقاڵ؟ بۆچی زەخیرەی سێو یان مۆز ناخات؟

لە ماوەی ئەو چرکەیەدا فریای ئەوە کەوتم سەرلەنوێ بیر لەهەموو ئەمانە بکەمەوە؛ سەفەرەکەیان بۆ وڵاتی پڕبەفری گرینلاند، خێزانە گەورەکەی فرۆلاند، ئاهەنگی کۆتایی ساڵی خوێندنی پەیمانگای ئابووری و شیرینیە تایبەتەکەی کە بە ئاوی ئەو هەموو پرتەقاڵە

دروستیانکردبوو، منداڵە کۆرپەکە _مەبەستم لە 'ڕانفی'یە_ کە بەخەیاڵی من لەوێدا لەباوەشی باوکە چوارشانەکەیدابوو، ئەو باوکەی کە تەنها دوو حەفتە لەمەوبەر لە پەیمانگای ئابووری دەرچووبوو، جگەلەوەش مانگێک لەوەوپێش وەک بەڕێوەبەری یانەی کوڕە گەنجانی ڕەق و توندوتیژ' هەڵبژێردرابوو. لەوێدا نەموێرا دیسانەوە سەردانی باخچەی ساوایانە پڕ زاق و زیقەکە بکەمەوە، ئەو هەموو منداڵە نائارامیان دەکردم.

بەڵام جۆرج، فریا نەکەوتم شتێکی گونجاوی پێبڵێم، چونکە چەندەها شتم لەبەردەستابوو و نەمزانی کامیان هەڵبژێرم. هەر لەبەرئەوە لەو کاتەدا کە خەریکبوو بچێتە ناو تەکسیەکەوە، هاوارمکرد و وتم؛ "وابزانم خۆشم دەوێیت!"

وشەکانم بەڕاستی پێگوت، بەڵام هەر لەو چرکەیەدا پەشیمان بوومەوە.

تەکسیەکە ڕۆشت. بەڵام کچەی پرتەقاڵ سەرنەکەوتبوو، ڕای گۆڕیبوو. بەهێواشی دیسانەوە هاتەوە سەر شۆستەکە، زۆر بەلارولەنجە بەرەوڕوم هات و بەویستی خۆی دەستی خستە ناو دەستمەوە _هەروەک ئەوەی لەماوەی پێنج ساڵی ڕابووردوماندا جگەلە دەستگرتنی یەکتری هیچ شتێکمان نەکردبێت_ سەرێکی بۆ لەقاندم و بەو شێوەیەش ئاماژەی کرد کە دیسانەوە بکەوینەوە ڕێ. بەڵام تەماشای کردم و وتی؛ "ئەگەر تەکسیەکی ترمان توشبوو، ئەوا ناچارم بیگرم، چونکە چەند کەسێک چاوەڕوانمن".

لەدڵی خۆمدا وتم 'بێگومان مێردە بێهەستەکە و منداڵە شیرینەکەیەتی یان لەوانەشە دایک و باوکی چاوەڕوانی بن، باوکی قەشەیە _ڕەنگە هەر ئەویش ئەو سروتە ئاینیەی ئامادە کردبێت کە کەمێک لەمەوبەر بینیمان_ چوار خوشک و دوو براشی هەیە،

بەدەرلەوانەش توتەڵە سەگێکی بچکۆلەشیان لە باڵەخانەکەدا هەیە، هی برا بچکۆلەکەیەتی کە ناوی 'پیتەر'ە، پاش ورِکگرتنێکی زۆر ئینجا بۆیان کرِی. یان کەسێکی چوارشانە و وشک چاوەرِوانی دەکات کە حەز بە سەفەری گرینکاند دەکات، دەبینم لەژێر دار سنەوبەری رِۆژی جەژنی لەدایکبووندا کۆمەڵێک دیاری بەباشی پێچاوەتەوە؛ دەستکێشی تایبەتی ناو بەفر، جلی گەرموگورِ، پێڵاوی ناو بەفر و رِۆنی بنی پێڵاوەکە و فەرهەنگێکی زمانی ئاسکیمۆیی/ دانیمارکی و دانیمارکی/ ئاسکیمۆیی. بێگومان ئەم ئێوارەیە کچەی پرتەقاڵ ناچێتە ئاهەنگی تەواوبوونی پەیمانگا. ئەم ئێوارەیە پشووی هەیە و ناچێتە باخچەی ساوایانیش.

وتم؛ "پاش نەختێک زەنگی رِۆژی لەدایک بوون لێدەدرێت، وا نیە؟ بەلاَم تۆ لەپاش ئەو زەنگەوە ئیتر ناتوانیت لەناو بازارِدا بمێنیتەوە"
وەلاَمی نەدامەوە، بەس دەستمی بە توندی گوشی _لەوە دەچوو وەک شتێکی بێ کێش لە ئاسماندا بخولێینەوە، هەر دەتوت تێر تێرمان لە شیری نێوان گەلەهەسارەکان خواردۆتەوە و هەموو گەردوون هی خۆمانە.

بەلای مۆزەخانەی 'مێژوویی'دا تێپەرِبووبووین و گەیشتبووینە لای پارکی قەلاَ. دەمزانی لە هەر کاتێکدا بێت تەکسیەکی ترمان لێ پەیدا دەبێت. دەمزانی پاش کەمێکی تر زەنگی کلێسەکان بەرزدەبنەوە.

لەبەردەمیدا وەستام و زۆر بە هێواشی دەستم بە قژە پرِەکەیدا هێنا، دەستم خستە سەر تەوقە زیوینەکەی پشتی ملی. کێ لەو برِوایەدابوو کە من دەست لەو تەوقەیە بدەم؟

ئەوجا پرسیم؛ "کەی یەکتر دەبینینەوە؟"

وەستابوو و تەماشای قیرەکەی بەر پێی دەکرد، کەمێک دواتر سەری بەرزکردەوە و تەماشای دەموچاوی کردم. بیلبیلەی چاوەکانی بەشێوەیەکی نائارام سەمایاندەکرد، وا دەهاتە بەرچاوم کە لێوی بلەرزێ. ئینجا مەتەڵێکی دامێ کە هەڵیبهێنم و دواتر بۆ ماوەیەکی زۆر دەبوایە لێی ڕابمایە. وتی؛ "چەندێک دەتوانیت چاوەڕێ بیت؟"
جۆرج، لەوەڵامدا چیم پێ بگوتایە؟ لەوانەیە تەڵەیەک بێت و بیەوێت تێیبکەوم. ئەگەر بمگوتایە دوو سێ ڕۆژ، ئەوا ئەو کاتە وەک کەسێکی بێ سەبر دەهاتمە بەرچاوی. ئەگەریش بمگوتایە 'هەموو ژیانم' ئەو کاتە باوەڕی پێنەدەکردم، یان بەهیچ شێوەیەک وەک کەسێکی ڕاستگۆ نەیدەبینیم. واتە ناچاربووم شتێک لەو مابەینەدا بدۆزمەوە.
وتم؛ " دەتوانم هەتا ئەو کاتەی دڵم قەهری لێدەبارێ بوەستم"
پێکەنینێکی گوماناوی خستە سەر لێوانی. پەنجەیەکی بەلێومدا هێنا و ئەوجا وتی؛ "ئەی ئەوە چەندێکی پێدەچێت؟"
سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و وام بەباشزانی کتومت ڕاستیەکەی پێبڵێم؛ "ڕەنگە تەنها پێنج خولەک بتوانم".
دیاربوو قسەکەمی پێخۆشبوو، بەڵام بە چرپەیەک وتی؛ "شتێکی باشدەکەیت ئەگەر کەمێک زیاتر دان بەخۆتدا بگریت..."
لەوێدا ئینجا سەرەی من بوو داوای وەڵامێکی لێبکەم، گوتم؛ "بۆ ماوەی چەندێک؟"
گوتی؛ "دەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ چاوەڕوانم بکەیت. ئەگەر دەتوانێت هێندە دان بەخۆتدا بگریت، ئەوا دەتوانین یەکتر ببینینەوە"
وابزانم لەوێدا هەناسەیەکم هەڵکێشا و وتم؛ "ئاخر بۆ هێندە زۆر؟"

دەموچاوی کچەی پرتەقاڵ گرژبوو، وا هاتە بەرچاوم کە ناچاربوو هێندە ڕەق خۆی نیشانبدات، وتی؛ "چونکە چارت ناچارە و دەبێت کتومت هێندە چاوەڕوان بیت"
دەیبینی نائومێدی بەسەرمدا کشابوو، وابزانم هەر لەبەرئەوەبوو کە وتی؛ "بەڵام ئەگەر هێندە دان بە خۆتدا بگریت، ئەوا هەموو ڕۆژێکی شەش مانگی دواتر دەتوانین پێکەوەبین"
زەنگی کلێسەکان لێدران و ڕێک لەوێدا دەستم لەسەر قژە تەڕەکەی و تەوقە زیوینیەکەی قژی لادا. لە هەمان کاتیشدا تەکسیەکی بەتاڵ لە 'وێرگەلانسفای'ەوە دەهاتە خوارەوە. شتێکی چاوەڕوانکراوبوو.
بەشێوەیەک تەماشای چاوی دەکردم هەر دەتوت داوای شتێکم لێدەکات، داوای ئەوەم لێدەکات کە لێی تێبگەم، لەوە دەچوو داوام لێبکات هەموو توانا و هۆشم بخەمەکار، دیسانەوە فرمێسک بەچاویدا هاتە خوارەوە و بەدەنگێکی پچر پچر وتی؛ "ئێ... جەژنت پیرۆزبێت... 'یان ئۆلاو'!". دواتر بەخێرایی بەشەقامەکەدا ڕۆشت و دەستی بۆ تەکسیەکە بەرزکردەوە، لەناویدا دانیشت و زۆر بەگوڕ دەستی بۆ ڕاوەشاندم. بەڵام لە جەوێکی شومدا خۆمم بینیەوە. لەو کاتەدا کە تەکسیەکە ڕۆشت و بە خێرایی ونبوو، ئاوڕی لێ نەدامەوە. وابزانم دەگریا.

نەمدەزانی چی بکەم جۆرج، شلەژام و بەتەواوەتی لەسەرخۆم نەبووم. ملیۆنێکم لە یانسیبدا بردبۆوە و پاش چەند خولەکێک وتیان هەڵەیەک لە کاغەزی یانسیبەکەتدا هەیە و لەبەرئەوە ناتوانین دیاریەکەت پێ ببەخشین، وتیان بەلایەنی کەمەوە ناتوانین یەکسەر پارەکەت بدەینێ.

ئەو کچەی پرتەقاڵی سەروسروشتیە کێ بوو؟ من لەوەوپێش چەندەها جار ئەو پرسیارەم لەخۆم کردبوو. بەڵام لەوێ بە دواوە پرسیارێکی نوێش سەریهەڵدا؛ *لە کوێوە ناوی من دەزانی؟*
زەنگەکان بەردەوامبوون، لە کڵێسە گەورەکەی شار و لە کڵێسەکانی تری ناو شاریشەوە زرنگەیان دەهاتەوە، سەرەتای ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوونی مەسیحیان ڕاگەیاند. شەقامەکان کەسیان پێوە نەبوو، وابزانم هەر لەبەرئەوەش بوو کە چەندەها جار لەو ئێوارەیەی مانگی دوانزەدا بەدەنگی بەرز و گۆرانی ئاسا هەمان پرسیارم لەبەرخۆمەوە دەوتەوە؛ "لە کوێوە ناوی من دەزانی؟" پرسیارێکی تریش بە هەمان شێوە زۆری بۆ دەهێنام؛ "بۆچی دەبێت شەش مانگ تێپەڕیت و ئەوجا یەکتر ببینینەوە؟"
بەکورتی ماوەیەکی باشم لەبەردەستابوو کە لەو پرسیارە ڕابمێنم. ڕۆژەکان دەهاتن و تێدەپەڕین، چەندەها وەڵامی شیاو بەخەیاڵمدا دەهاتن، بەڵام نەمدەزانی چ وەڵامێکیان پێیدەچێت ڕاست بێت. من تەنها چەند نیشانەیەکم لەبەردەستدابوو کە دەستی بدەمێ، بەڵام ئەو کاتەش زیرەک بووم لە لێکدانەوەی نیشانەدا، کارامانە شتێکم دەست نیشاندەکرد. پێم وابێت نەختێکیش لەڕادەبەدەر لەو بابەتەم کۆڵیەوە، هەربۆیە چەندەها تیۆری وەکیەکم بەخەیاڵدا هات.
ڕەنگە کچەی پرتەقاڵ بەڕاستی نەخۆشبووبێت و بەهۆی ئەوەوە کەسێک ئامۆژگاری کردبێت کە ڕێجیمێکی توند بکات و پرتەقاڵ بخوات. لەوانەیە بۆ ماوەی شەش مانگ بەمەبەستی چارەسەرکردن سەفەرێک بۆ ئەمریکا یان سویسرا بکات، چونکە لەلای خۆمان ناتوانن چارەی نەخۆشیەکەی بکەن. هەرچۆنێک بێت هەمیشە فرمێسک لە چاوەکانیدا بوو، بەتایبەتیش لەو کاتانەدا کە لێم جیادەبووەوە. بەڵام خۆ ئەوەندەشی وت کە لەدوای ئەو شەش

مانگەوە هەموو ڕۆژێکی نیوەی دووهەمی ساڵی داهاتوو پێکەوە دەبین، واتە لە مانگی شەشەوە هەتا مانگی دوانزە. من دەبوایە بۆ ماوەی شەش مانگ چاوەڕوانی کچەی پرتەقاڵم بکردبایە، بەڵام دوای ئەوە *هەموو ڕۆژێک* دەمانتوانی پێکەوە بین. ئەو خەیاڵەم پێخۆشبوو. لەڕاستیدا پەیمانێکی خراپ نەبوو و بەگشتیش هەقی خۆم نەبوو کە گلەیی بکەم. واتە لەساڵی داهاتودا زوو زوو یەکتر دەبینین، هەروەک ئەوە وایە ڕۆژ نارۆژێک چاومان بەیەک بکەوێت. ئەوە باشترێک نیە لەوەی کە بۆ ماوەی شەش مانگ هەموو ڕۆژێک یەکتر ببینین و دواتر قەت چاومان بەیەک نەکەوێتەوە؟

ئەو کاتە هێندە نەبوو دەستم بە خوێندنی پزیشکی کردبوو، وەک ئاشکراشە قوتابیانی ئەو بەشە زۆرجار بەرامبەر خۆیان و خەڵکانی تریش جۆرە وەسواسیەک دەیانگرێت، مەبەستم لەوە کە زیاد لەڕادە پێیان خۆشە نیشانەیەک لێکبدەنەوە، حەز و ویستیان هەر لە حەزی پۆلیسێکی نهێنی دەچێت و دەیانەوێت نەخۆشیەک دەست نیشانبکەن. بە هەمان شێوەش شتێکی ئاساییە کە قوتابیانی تیۆلۆجی وەسواسی دەیانگرێت و گومان لە بڕوای دینی خۆیان دەکەن، ڕێشی تێدەچێت لەپڕێکدا قوتابیانی بەشی مافناسی ڕەخنە لە یاسا و مافی وڵاتەکەیان بگرن. لەبەرئەوە هەوڵمدا توند خۆمبگرم و ئەو بیرۆکەیە لە مێشکی خۆم دەربهێنم کە کچەی پرتەقاڵ زۆر نەخۆشە و ناچارە لەوڵاتێکی نامۆدا خۆی بخاتە ژێر چارەسەرکردنێکی ئازاربەخشەوە. چەندەها ڕێوشوێنی ترم لەبەردەستدا بوو کە دوایان بکەوم.

بەهەرحاڵ، ئەگەر کچەی پرتەقاڵ نەخۆشبووبێت یان نا، ئەگەر مێشکی تەواو بووبێت یان نا، هیچ شتێکی وای لە بابەتەکە نەدەگۆڕی.. هەر بۆ نمونە من نەمدەزانی ئەو لەکوێوە ناوی من

دەزانێت. جگەلەوە شتێکی تریش؛ بۆچی هەموو کەرەتێک کە منی دەبینی دەگریا؟ چ شتێک لە مندا هەبوو کە هێندە دڵی تەنگ دەکرد؟

من دەتوانم لێرەدا زۆر بە ڕاشکاوی هەموو ئەو خەیاڵانەت بۆ هەڵبرێژم کە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژی جەژنەدا بە مێشکمدا هاتن. هەر بۆ وێنە دەتوانم بەکورتی باسی هەموو ئەو شتانەت بۆ بکەم کە لەبارەی خێزانە گەورەکەی فرۆکەرەوە هۆنیبوومنەوە. دەربارەی ئەوەش کە بۆچی دەبوایە دوای شەش مانگ کچەی پرتەقاڵم ببینیایەتەوە، چەندەها لێکدانەوە بە مێشکمدا هاتن، من دەتوانم هەموو ئەوانەشت بەدوورودرێژی بۆ باسبکەم. یەکێک لە لێکدانەوەکانم، وابزانم لە هەمووشیان سەرنجڕاکێشەرتر، ئەوەبوو کە کچەی پرتەقاڵ زۆر لەوە باشتربوو کە لەم ژیانەدا بێت. هەر لەبەرئەوە زۆر بە نهێنی سەفەریدەکرد بۆ ئەفریقا و بەقاچاخ خواردن و دەرمانی دەبرد بۆ خەڵکە هەرە هەژارەکەی ئەو کیشوەرە ڕەشە، بەتایبەتیش دەیبردە ئەو شوێنانەی کە مەلاریا و نەخۆشیە کوشندەکانی تری تێدا بڵاوە. بەڵام وەڵامێکی ئاوها مەتەڵی پرتەقاڵەکانی بۆ لێکنەدەدامەوە. بەڕاست.. بۆ نا؟ خۆ ڕەنگە لەگەڵ خۆیدا بیانبات بۆ ئەفریقا. نازانم بۆچی لەوەوبەر خەیاڵم بۆ ئەوە نەچووبوو؟ لەوانەیە هەموو پارە زیادەکانی بۆ ئەوە بەکارهێنابێت کە فرۆکەیەکی یەکجار گەورەی پێبگرێت!

بەڵام جۆرج، ئێمە لەوەوپێش لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە بۆ دۆزینەوەی کچەی پرتەقاڵ تەنها دوای نیشانە ڕاستەقینەکان بکەوین. ئەگەر هەموو ئەو خەیاڵ و فەنتاسیایانەت بۆ باسبکەم کە هێدی هێدی دەربارەی ئەو کچە هاتنە مێشکمەوە، ئەوا دەبێت بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لەبەردەم کۆمپیوتەرەکەمدا دانیشم و

بیاننوسمەوە، بەڵام هەر زۆر بەساکاری دەڵێم هێندە کاتم بەدەستەوە نەماوە.. بەڕاستی بیرکردنەوە لەوە ئازارێکی زۆرم دەدات.

بەڵام بۆچی خۆمان بە خەیاڵاتەوە ببەستینەوە؟ لەڕاستیدا کچەی پرتەقاڵ چەند جارێک تەماشای ناو چاوی کردم و دوو کەڕەتیش دەستی گرتم، یەک کەڕەتیش پەنجەیەکی هێنا بە لێومدا، جگە لەوانەش تەنها ئەو چەند وشە کەمەم لەبەردەستدایە کە بە یەکتریمان وت و هیچی تر. مەبەستم لەوەیە گرنگە ئەو قسانە ڕێک بخەم کە ڕاست و دروست بەیەکتریمان وت. لەبەرئەوە هەر یەکسەر بەلیستەیەک هەموو ئەو ڕستانەم نوسیەوە و هەوڵمدا بە مەبەستی لێکدانەوەیان بە قوڵی لێیان بڕوانم.

ئەی تۆ چی جۆرج؟ دەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەیتەوە؛ یەکەم "تۆ دەزانی ئەو هەموو پرتەقاڵەی بۆچی دەکڕی؟"، دووهەم؛ "دەتوانیت پێم بڵێت بۆچی لە قاوەخانەکەدا بە قوڵی تەماشای ناو چاوی کردم و دەستی گرتم، بەڵام تەنانەت یەک وشەشی لەدەم نەهاتە دەرەوە؟"، سێهەم؛ "بۆم ڕونبکەرەوە و پێم بڵێ بۆچی دانە دانە لەو پرتەقاڵانە وردەبووەوە کە لە 'یۆنگستۆرگت'دا دەیکڕین؟ بڵێیت بۆ ئەوە بووبێت کە هیچ دانەیەکیان لەوانی تر نەچێت؟"، چوارەم؛ "تۆ دەزانیت بۆچی دەبوایە شەش مانگ تێپەڕیبایە و ئەوجا یەکتریمان ببینیایەتەوە؟"، پێنجەمیش؛ "دەتوانیت مەتەڵە هەرە گەورەکەم بۆ هەڵبهێنیت و پێمبڵێیت ئەو لەکوێوە ناوی منی دەزانی؟"

ئەگەر بتوانیت وێنەی ئەو مەتەڵانە دەربخەیت، ئەوا پێدەچێت لەسەر ڕێگای ڕاستبیت و بتوانیت وەڵامی پرسیارە هەرە گرنگەکەم بدەیتەوە؛ کچەی پرتەقاڵ کێیە؟ بڵێیت ئەویش یەکێک بێت لە ئێمە؟

یان لە هەقیقەتێکی ترەوە هاتووە؟ تۆ بڵێیت لە جیهانێکی ترەوە نەهاتبێت و ناچاربێت بۆ ماوەی شەش مانگ بگەڕێتەوە، ئەوجا بێتەوە ناومان؟
جۆرج.. من نەمتوانی نیشانەکان لێکبدەمەوە، نەمتوانی هیچ شتێک دەستنیشانبکەم.

کەمێک پاش ئەوەی کچەی پرتەقاڵ لە "وێرگەلانسفای'یەوە بەجێی هێشتم، تەکسیەکی تر هات و من گرتم. گەڕامەوە بۆ 'هوملەفای' و جەژنم لەگەڵ خێزانەکەمدا کرد.
ئەو زستانە 'ئاینە' تەنها یەک خۆزگەی دەخواست، ئەویش ئەوەبوو کە لە 'تریڤانسکلیڤا'دا خلیسکێنەی سەر بەفر بکات، لەبەرئەوە وەک دیاریەک جوتێ دەستکێشی نایابی خلیسکێنەم بۆ کڕیبوو و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانبووم لەدوای نان خواردن دیاریەکەی بکاتەوە و بیبینێت. جگەلەوەش قتویەک خواردنی گرانبەهام بۆ پشیلەکەی کڕیبوو. ئەو دیوانە شیعرەشم بۆ دایکم کڕی کە زیاد لەڕادە مشتومڕی لەسەرکرا و بە زمانی 'سویدی فینلەندا' دەرچوو، 'مارتا تیکانن' نوسیبووی و ناوی 'چیرۆکی خۆشەویستی سەدە' بوو. بۆ باوکیشم ڕۆمانێکی 'ئێرلین گێلسفیک'ی نوسەری نەرویجی گەنجم کڕیبوو، خۆم ماوەیەک لەوەوپێش ئەو ڕۆمانەم خوێندەوە و پێم وابوو باوکم حەزی لێبکات. بەڵام شتێکی تریش لە ئارادابوو؛ ئەو کاتە خۆشم خەیاڵم بەوەوە لێدەدا کە شتێک بنوسم، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێت کە زیادلەڕادە پێم خۆشبوو ڕۆمانی نوسەرێکی گەنج بە باوکم ببەخشم.
ئەو کاتە من زیاترێک لە ژورە بچکۆلەکەی تەنیشت ژوری دانیشتن دەخەوتم. ئەمڕۆکە ئەو ژورە ژوری تۆیە، بەلایەنی کەمەوە لە کاتی

ئێستادا کە ئەم شتانە دەنوسم. بەڵام وەک دەزانیت کاتێک کە ئەم نوسراوە دەخوێنیتەوە، نازانم کێ ئەو ژورە بەکاردەهێنێت.

نامەوێت باسی جەژنی ئەو ساڵەت بۆ بکەم، هەڵبەتە بۆ ئەوەی شانبەشانی هێڵی سەرەکی چیرۆکەکەمان بڕۆین، بەڵام هەر تەنها دەمەوێت ئەوەندە بڵێم کە شەوی یەکەمی ئەو جەژنە خەو نەچووە چاوم.

گەیشتبوومە نیوەی نامە دورودرێژەکەی باوکم، بەڵام لەوێدا ناچاربووم خۆم بگەیەنمە تەوالێتەکەمان. بێگومان خەتای خۆم بوو، چونکە ئەو هەموو کۆلایەم خواردەوە.
لەدڵی خۆمدا وتم 'شەیتان!'. ناچاربووم بەژوری دانیشتنەکە و ساڵۆن و دالانەکەدا بڕۆم، لە هەموو شوێنێکدا دەکەوتمە ژێر چاوی پڕ پەرۆشییەوە. ناچاربووم بەبەردەمی ئەو هەموو چاوە بە پەرۆش و بەدیقەتەدا تێپەڕم، بەڵام چارم ناچاربوو.
دەرگای ژورەکەم کردەوە، نوسراوەکەی باوکمم لەسەر جێگاکەم دانا و دەرگاکەم بەدوای خۆمدا بەکلیل داخستەوە. کلیلەکەشم خنیە گیرفانمەوە.
یەکسەر هەر چواریانم لێ پەیدابوون، هەوڵمدا وا خۆم نیشانبدەم کە گوێنادەمە چاوە پڕ پرسیارەکانیان.
دایکم پرسیاری لێکردم و وتی؛ "هەروا زوو تەواوت کرد؟"، لەوێدا دایکم هەر لە نیشانەیەکی گەورەی پرسیار دەچوو. "ئاخۆ چیم خوێندبێتەوە؟"
یۆرگن وتی؛ "دڵی تەنگ کردیت؟". هەر دەبوایە وای پیشانبدایە کە بەزەیی پێمدا دێتەوە، چونکە بێ باوک بووم، بەڵام بەردەوام

تائەوپەڕی ڕادە هەوڵیدەدا شوێنی ئەوم بۆ بگرێتەوە. بۆ من بەو شێوەیەبوو، ڕەنگە نەکرایە لەوەش باشترێک بێت. بەڵام خۆ ناتوانێت بڵێت بەزەییم بە دایکیدا هاتۆتەوە چونکە مێردەکەی لەدەستداوە و هاوکاتیش خۆی بخاتە شوێنی هەمان ئەو پیاوەوە، یان ڕاسترێک بیڵێم ڕێک بچێتە هەمان جێگەی خەوەکەیەوە. وابزانم یۆرگن لە قوڵایی ناوەوەیدا پێی خۆشبوو کە باوکم مردووە، ئەگەر نا ئەوا دایکمی نەدەهێنا.. ئەگەر وانەبوایە، ئەوا مەریەمی نەدەبوو. دەتوانم بڵێم ئەگەر وانەبوایە، ئەوکاتە منیشی نەدەناسی. ئەمەیە کە دەڵێن "یەکێک دەمرێت و یەکێکی تر سودی لێدەبینێت".

بینیم پەرداخێکی گەورەی ویسکی تێکردبوو. ئەو جارجارێک پێکێ ویسکی دەخواردەوە، بەڵام تەنها لە ڕۆژانی شەممە و یەکشەمەدا، بەڵام ئەو ڕۆژە دووشەممە بوو.

من پێم وانیە شەرمی لەوە کردبێت کە بە خۆی و پەرداخێک ویسکیەوە لە ژوری دانیشتنەکەدا وەستابێت، من مەبەستم لەوە نەبوو کە ناوی ئەوەم هێنا. بەڵام ڕەنگە کەمێک شەرمی لەوە کردبێت کە من دەرگای ژورەکەمم بە کلیل داخستووە و خەریکی خوێندنەوەی شتێکم کە باوکە ڕاستەقینەکەم کەمێک بەر لە مردنی بۆی نوسیووم، ئەو کاتە یۆرگن بەهیچ شێوەیەک ماڵی ئێمەی نەدەناسی. من کە منداڵ بووم هەندێک جار پێم ئەوت "میوان". هەڵبەتە قسەکەم منداڵانەبوو، بەڵام هەر بۆ ئەوە دەموت کە پەستی بکەم.

باپیرەم جگەرەیەکی پێکرد و پرسی؛ "یان هێشتا ماوتە تەواوی بکەیت؟"، ئەو لەبابەتەکە تێگەیشتبوو.

منیش وتم؛ "تەنها نیوەیم خوێندۆتەوە و ئێستاش دەبێت بچمە تەوالێت"

ئەوجا نەنکم هەڵیدایە و وتی؛ "بەڵام پێت خۆشە کە ئەو شتانە دەخوێنیتەوە؟"
لەوەڵامی ئەودا وتم؛ "نامەوێت لەو بارەیەوە هیچ شتێک بڵێم".
سیاسەتمەندارەکانیش ئا بەو شێوەیە وەڵامی ڕۆژنامەنوسەکان دەدەنەوە کە پرسیارێکی سەختیان لێدەکەن.
ڕۆژنامەنوس و دایک و باوک لەو خاڵەدا لەیەک دەچن کە هەردووکیان پەرۆشی زانینن. هەروەها سیاسەتمەندار و منداڵیش لەو خاڵەدا لەیەک دەچن کە هەردووکیان بەردەوام پرسیاری هەستیاریان لێدەکرێت و هەروا بە ئاسانیش ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە.

ڕەنگە ئا لێرەدا لە کاتی خۆیدا بێت کە کەسایەتیەکانی ناو ئەم چیرۆکەتان پێبناسێنم، پێشم خۆشە لە دایکمەوە دەستپێبکەم، چونکە لە هەموویان باشترێکی دەناسم.
دایکم چل ساڵی پڕکردۆتەوە، بەبڕوای من وەک کەسایەتی ژنێکی پێگەیشتوو و سەربەستە، بەلایەنی کەمەوە دەوێرێت ڕای خۆی بڵێت. بەدەر لەوەش "دایکێکی میهرەبانە"، لێرەدا تەنها بیر لەشێوەی هەڵسوکەوتی لەگەڵ مەریەمدا ناکەمەوە. بەڵکو لەگەڵ منیشدا هەر وایە، زیاد لەڕادە نازم دەکێشێ و جاری وا هەیە بەشێوەیەک قسەم لەگەڵ دەکات هەر دەڵێیت دوو سێ ساڵ لەم تەمەنەی خۆم بچکۆلەترێکم. من بەشێوەکی گشتی کە بەو شێوەیە قسەم لەگەڵدا دەکات هێندە گوێی نادەمێ، بەڵام ئەو کاتانە پەستدەبم پێی کە لە ماڵەوەم و برادەرێکی قوتابخانەم لەگەڵدایە. لەوە دەچێت چێژ لەوە ببینێت لەبەرچاوی برادەرەکانمدا نیشانی بدات کە من کوڕە بچکۆلەکەیم، هەرچەندە لەڕاستیدا بەباڵا یەک دوو سانتیمەترێک

لەو درێژترم. کەڕەتێکیان لەگەڵ 'مارتین'ی برادەرمدا لە ژوری دانیشتنەکەمان یاری شەترەنجمان دەکرد، دایکم بە خۆی و شانەیەکەوە هاتە لای قەنەفەکە و دەستیکرد بە قژداهێنانم! لەوێدا بەڕاستی ڕای خۆمم پێوت. من پێمخۆش نیە لەدایکم تورە ببم _ئەو کەڕەتە نەک هەر تورەبووم، بەڵکو گرم لێدەبووەوە_ بەڵام ناچاربووم حسابێک بۆ مارتین بکەم، ناچاربووم هێندە نیشانی مارتین بدەم کە دەتوانم سنورێک بۆ شتەکان دابنێم. دایکم دەرپەڕیە چێشتخانەکەوە، بەڵام پاش بیست دەقەیەک بەخۆی و کاکاوی گەرم و کێکەکەوە هاتەوە بۆ لامان. مارتین لە خۆشیدا فیکەیەکی لێدا، بەڵام من لەپاش ئەو ڕوداوەوە هەستم بەشەرم دەکرد کە بەو شێوەیە خزمەتمان بکات. خەریکبوو ڕابکەمە چێشتخانەکە و بەدوای بیرەیەکدا بگەڕێم، لەدڵی خۆشمدا دەموت 'ئەگەر بیرەشی لێنەبێت، ئەوا دەزانم یۆرگن بتڵە ویسکیەکەی لە چ شوێنێکدا دادەنێت'، بەڵام خۆشبەختانە مارتین کوڕێکی قۆشمەیە و بێگومان دواتریش کەوتینە باسکردنی دیمەنەکە. وابزانم لەپاش ئەوەی کە پێموت دایکم مامۆستای هونەرە جوانەکانە، کەمێک زیاتر ڕێزی لێدەگرت. هەروەها وتم "ئەگەر 'بیکاسۆ'یەکی نوێ سەریهەڵدا، ئەوا دەزانیت کێ وانەی پێوتۆتەوە". لەپاش ئەو ڕوداوە ناخۆشەوە، هەستمکرد لەبەرژەوەندی خۆمدایە کە ڕێزی بەرزبکەمەوە.

سەختە وەسفی دایکی خۆت بکەیت، بەتایبەتیش لایەنی زەوق و حەزی، بەڵام لەڕاستیدا دایکم حەزێکی زۆر دیاری هەیە. شێتی نوقڵێ 'بەڵەک"ە[1]، حەزی لە هەموو جۆرەکانیشیەتی. لەهەموو کون و قوژبنێکی ماڵەکەدا بەڵەک دەبینم، لە هەموو شوێنێکدا قوتوی 'فازیر'

---

[1] بەڵەک یان 'بنەبەڵەک' گیایەکی دەشتەکی تەمەن درێژی لاسک ڕەقە، ڕەگەکەی شیرینە و بۆ دەرمان و نوقڵ دروستکردن بەکاردەهێنرێت.و

و بەڵەکی ئینگلیزی دەدۆزمەوە. وا ماوەیەکیشە بەدزیەوە دەیانخوات، چونکە من و یۆرگن باسی کێشەکەی دەکەین و لەگەڵ ئەو خووە خراپەیدا ڕووبەڕووی دەکەینەوە. یۆرگن پێی وایە بەڵەک فشاری خوێن بەرزبکاتەوە، ڕەنگە ئەوەش زیادەڕۆیی بێت، بەڵام بەهەرحاڵ خووەکەی لەڕادەبەدەر تێپەڕیوە و وای لێهاتووە کە دەچینە بازاڕ و کیسەیەک بەڵەک یان قتویەک بەڵەکی ئینگلیزی دەکڕین، داواملێدەکات پەیمانی بدەمێ کە لەلای یۆرگن باسی نەکەم.

ئەگەر بە دوو وشە باسی لایەنی هەرە بەهێزی دایکم بکەم، ئەوا دەڵێم "مەزاجی باشە". بەڵام دەبێت هێندەش بڵێم کە لایەنە هەرە لاوازەکەی "مەزاجی خراپە". کەم ڕێکدەکەوێت ئەو لایەنە دەرەکیەم بۆ جودابکرێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی دایکم مەزاجێکی باشی هەیە، بەڵام جارجارێک بەڕاستی پەستدەبێت. مەبەستم لەوەیە هەردەمەو مەزاجێکی هەیە و قەت 'شتێک نیە لەو بەینەدا'. جوانترین قسە بەلای دایکمەوە ئەمەیە؛ "بەرلەوەی بخەوین با یاریەکی کاغەز بکەین".

ئینجا با بێینە سەر یۆرگن. باڵای ئەو مەترێک و حەفتا سانتیمەترە و بەو شێوەیەش ڕێک هێندەی دایکم درێژە. لەبەرئەوە بەبەراوردکردنی لەگەڵ پیاوێکی لەو تەمەنەدا هێندە درێژ نیە. زۆر کەس کورتی باڵا وەک کەموکوڕیەک دەبینن، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە تەنها نوقسانی نیە کە ئەو هەیەتی، ئەو لەسەروئەوەشەوە قژیشی سورە. ڕەنگی پێستی سپیە و هەرگیز لەبەر خۆردا ڕەنگێکی قاوەیی باو ناگرێت، بەڵکو پێستی لەبەر خۆردا ڕەنگێکی مەیلەو پەمەیی وەردەگرێت. وەک وتیشم قژی سورە، لە ڕاستیدا تووکی قۆڵ و دەستیشی سورە. لەوەوپێشیش وتم کە لەسەر مۆدە دەڕوات،

هەندێجاریش پێی خۆشە کەمێک خۆی دەرخات. هەموو پیاوێک لە سەر ڕەفەی ناو گەرماوەکەیدا سێ جۆر سپرای لەش و چوار جۆر کۆلۆنیا دانانێت. هەموو کەسێکیش ناوێرێت بە کراسێکی ئاوریشمی ڕەش و چاکەتێکی بێجی کاڵی لەموی حوشتر چنراو بچێتە ناو بازاڕەوە. بەڵام یۆرگن ئەوەی لەدەست دێت. لە هەموو شتێک خراپتریش ئەوەیە کە لێی دێت.
بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا یۆرگن پۆلیسە و لە بەشی تاوانکاری کاردەکات. هەمیشە ئەوەمان دێنێتەوە یاد کە 'سوێندی نهێنی پاراستنی' خواردووە، بەڵام هەموو کاتێک ناتوانێت پێ بە پێی ئەو سوێندە بڕوات. من خۆم بەلایەنی کەمەوە یەک دوو کەرەتێک هەندێک زانیاری زۆر گرنگم دەربارەی یەک دوو تاوانی گەورە لێوەرگرت، تەنانەت هێشتا لە ڕۆژنامەکاندا بڵاونەکرابوونەوە. بڕوای بە من هەیە و ئەوەش سیفەتێکی باشە. یۆرگن دەزانێت کە من ناچم باسی نهێنی کاری پۆلیس لەلای خەڵکی بدرکێنم.
یۆرگن لەو کەسانەیە کە پێیانوایە زۆر دەزانن، بەڵام هەمیشە شتەکانی بەو شێوەیە ناشکێتەوە. ماوەیەک لەمەوبەر چووین بۆ بازاڕی 'ئیکیا' بۆ ئەوەی کەنتۆرێک بۆ ژورەکەم بکڕین (ماوەیەکبوو زۆر گلەییان لەوەدەکرد کە من جلەکانم لە هەموو کون و کەلەبەرێکی ماڵەکەدا بڵاودەکەمەوە، بەڵام لەڕاستیدا پێوەیان دەنا، چونکە هەرگیز ڕوینەداوە تەنانەت جوتێک گۆرەویش لە قاتی سەرەوە دابنێم. ئاخر لێرەدا دەبێت هێندەش بڵێم کە من زۆر بەدەگمەن پێ دەخەمە قاتی سەرەوە).
پێکەوەلکانی پارچەکانی کەنتۆرەکەی 'ئیکیا' هەموو پاشنیوەڕۆکەی برد، ئینجا بەدرێژایی ئێوارەکەش باسی ئەوەماندەکرد لە چ شوێنێکدا دایبنێین. یۆرگن دەیوت دەبێت لەپشتی دەرگاکەوە

بینوسێنین بە دیوارەکەوە، بەڵام من بەهیچ جۆرێک ڕازی نەبووم لەوێدا بێت. من دەموت هەرچەندە نیو سانتیمەترێکی دەچێتە سەر پەنجەرەکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبێت لە تەنیشت پەنجەرەکەوە دایبنێین. وتم ژورەکە ژوری خۆمە و بەهیچ شێوەیەک گوێ نادەمێ گەر نیو سانتیمەتری پەنجەرەکەم بگرێت. هێندەشم هێنایەوە یاد کە من لەو زیاترێک لەو ماڵەدا ژیاوم. بەڵام لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە من پێم وابوو بێسودبێت گەر دۆلابەکە لە شوێنێکدا دابنێین کە دەرگاکەی نەکرێتەوە هەتاوەکو دەرگای ژورەکە دانەخەین. بێگومان دواتر هەر لەو شوێنەدا دامانا کە من ویستم، بەڵام بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێک قسەی لەگەڵدا نەکردم. دواتریش کە کەوتەوە قسە لەگەڵمدا دیاربوو زۆری لە خۆیدەکرد.

لایەنی هەرە بەهێزی یۆرگن ڕەنگە لەوەدابێت کە ئامادەیە هەموو کاتێکی بەتاڵی بۆ ئەوە تەرخانبکات کە من بکاتە وەرزشەوانێک. ئەو دەڵێت 'هەموو کەسێک کەلەدایک دەبێت ماسولکەی هەیە، بەڵام ماسولکە بۆ ئەوە کراوە کە بەکاربهێنرێت. لایەنی هەرە لاوازیشی دەبێت لەوەدابێت کە هێندە ناچێت بە مێشکیدا کەمن نامەوێت ببمە وەرزشەوان و پلانی ترم لە خەیاڵدایە. من پێم وانیە یۆرگن مەشقکردنم لەسەر 'سۆناتەی تریفە' بەرز بنرخێنێت. هیچ گومانێکم نیە کە جوانترین وتە بەلای یۆرگنەوە ئەمەیە؛ گرنگترین شت شێوەی تێڕوانینمانە!'.

بەر لەوەی باسی نەنکم و باپیرەم بکەم، دەمەوێت هێندە بڵێم کە من زۆر باش دەیان ناسم، بەلایەنی کەمەوە هێندەی یۆرگن دەیان ناسم، چونکە لەماوەی چەند ساڵی ڕابوردوودا لە ماڵەکەی "تیونسبێرگ"دا زۆر لەلایان ماومەتەوە. بەتایبەتیش لەو ماوەیەدا زیاترێک لەلایان دەمامەوە کە دایکم و یۆرگن تازە بووبوونە دەستگیرانی یەکتری. ئەو

کاتە من تەمەنم دە ساڵ بوو. ئێستاش لەو بڕوایەدام کە یۆرگن و دایکم ئەگەر بۆیان نەلوایە جارجارێک بۆماوەی چەند ڕۆژ و چەند حەفتەیەک لەسەریەک دورم بخەنەوە، ئەوا قەت نەیاندەتوانی ببنە دەستگیرانێکی ڕاستەقینەی یەکتری. مەبەستم نیە وەک گلەیییەک ئەوە باسبکەم، بەڵکو بە پێچەوانەوە من هەمیشە پێم خۆشبووە کە سەردانی "تیونسبێرگ" بکەم. بەدەرلەوەش پێموایە دایکم و یۆرگن ئاقڵیانکرد کە لە ماوەی یەکەمی یەکتر ناسینیاندا منیان دورخستەوە، هەڵبەتە مەبەستم لە ماوەی خەمزە و نازفرۆشتنە. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە خۆمم لەسەر چەندەها شت ڕابهێنایە. کەرەتێکیان چوومە سەرەوە بۆ ئەوەی شەو شادیان لێبکەم، بەڵام بینیم لە ژێر لێفەکەدا خەریکی دەستبازیبوون. ئەو دیمەنەم بەلاوە جوان نەبوو، لەبەرئەوە زۆر بە هێواشی بە پلیکانەکاندا هاتمەوە خوارەوە. ڕەنگە ئەگەر یۆرگن باوکی ڕاستەقینەی خۆم بوایە، ئەو کاتە بە جۆرێکی تر ڕەفتارم بکردایە. ڕەنگە واش نەبێت. لەڕاستیدا دیمەنەکەیان بێزاری نەکردم، بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت دەیانتوانی دەرگای ژوری خەوەکایان دابخەن. خۆ دەیانتوانی بڵێن 'دەچین دەخەوین'، ئیتر منیش توشی ئەو حاڵەتە نەدەبووم و هەستم نەدەکرد کە بێئەقڵم.. ئیتر منیش هەستم نەدەکرد کە تەنهام.

وا تەمەنی نەنکم دەگاتە حەفتا و زۆربەی ژیانی وەک مامۆستایەکی گۆرانی وتن بردۆتە سەر. هەموو جۆرە مۆسیقایەکی پێخۆشە، بەڵام بەپلەی یەکەم ئارەزووی 'پوتشینی'یە. نەنکم هەروەک ئەرکێکی گەورەی ژیانی خۆی دەبینێت کە وام لێبکات حەزم لە ئۆپێرای 'لا بۆهێمە' بێت، بەڵام بەڕاستی من پێموایە ئۆپێرای ئیتاڵی زیاد لە ڕادە گەشبینی پێوە دیارە و ئۆپێرای 'لا بۆهێمە'ش لەو حاڵەتە بەدەر نیە، بەڵکو تێکەڵەیەکی خۆشەویستی و نەخۆشی سیلە و هیچی تر.

لە لایەکی تریشەوە نەنکم ئاشقی سروشتە، بەتایبەتیش شێتی بولبولە. هەموو جۆرە خواردنێکی دەریاییشی پێ خۆشە و زەڵاتەیەکی دەریایی تایبەت بە خۆشی داهێناوە، ئەو پێی دەڵێت زەڵاتەی "تیونسبێرگ" (ڕۆبیان و نەرمەی قرژانگی دەریایی و ماسی تێکەڵدەکات، تامی ماسیەکەی لە هەمووی خۆشترە). هەموو پاییزێکیش بۆ قارچک ڕنین لەگەڵ خۆیدا دەمبات بۆ 'تیومە'. لایەنە هەرە بەهێزەکەی نەنکم؛ ناوی هەموو بولبلەکان دەزانێت و ڕێکیش دەزانێت لە چ شوێنێکدا هێلانەدەکەن. لایەنی هەرە لاوازەکەی نەنکم؛ (بەداخەوە) ناتوانێت خواردن لێبنێت ئەگەر گۆرانیەکی 'پۆتشینی' لەگەڵدا نەڵێت. من قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان پێم نەوتووە کە واز لەو خووە بهێنێت، بەڕاستی نەموێراوە هەوڵی ئەوە بدەم، چونکە خواردنەکانی نەنکم لەڕادەبەدەر بەتامن. جوانترین قسە بەلای نەنکمەوە؛ "جۆرج، وەرە لامەوە دانیشە با کەمێک لەگەڵ یەکدا قسەبکەین".

باپیرەم بەرلەوەی خانەنشین بکرێت، وەک 'کەشناس'ێک کاری دەکرد، ئێستاکەش وەک ئارەزوویەک هەر خەریکی ئەو بابەتەیە، چونکە هەموو ڕۆژیک ڕۆژنامە لەبەرئەوە دەکرێت کە باسی کەژوهەواکەی بکات. باپیرەم سیگار دەکێشێت، بەڵام بەپێی قسەی خۆی تەنها لە بۆنە خۆشەکاندا دەیکێشێت. لەوەدەچێت هەموو کەرەتێک کە من دەچمە لایان بۆ 'تیونسبێرگ' وەک بۆنەیەکی خۆش بێتە بەرچاوی، بەهەمان شێوەش هەموو کەرەتێک کە سواری بەلەمەکە دەبین. پیاوێکی هەر زۆر قسەخۆش و خۆش مەعشەرە، بەڕاستی زۆر قۆشمەیە، قەتیش لەوە ناترسێت کە ڕای خۆی بەڕاشکاوی بڵێت. ئەگەر قژی نەنکمی بەدڵ نەبێت، ئەوا بێ سێ و دوو یەکسەر پێی دەڵێت. بەڵام کاتێکیش کە قژی جوان وەستابێت،

یەکسەر پێی دەڵێت. باپیرەم نیوەی هاوین بە بەلەمە ماتۆڕدارەکەیەوە دەباتە سەر و نیوەکەی تریشی بە ڕۆژنامە خوێندنەوەوە دەکوژێت. جارجارێکیش وتارێک لە ڕۆژنامەی 'تیونسبێرگ'دا دەنوسێت، دەتوانین بڵێین کەسێکی ناسراوی 'تیونسبێرگ'ە. لایەنە هەرە بەهێزەکەی باپیرەم؛ لەناو ئاودا زۆر ئازایە. لایەنە لاوازەکەی؛ هەندێ جار وا دەزانێت پاشای 'تیونسبێرگ'ە. وتە هەرە بەناوبانگەکەشی؛ "ئێمەی دەوڵەمەند خۆش دەیگوزەرێنین!".
یەک دوو کەڕەت ناوی مامە 'ئاینە'شم هێنا. لەنامەکەدا خوێندمەوە ئەو کاتەی کە باوکم لەو پایزەدا کچەی پرتەقاڵی بینیوە، مامم تەمەنی هێندەی ئێستای من بووە، من ئەوەم بەلاوە خۆشە. ئێستاکە ئەفسەری یەکەمی کەشتیەکی گەورەی شتومەکە و هێشتا ژنی نەهێناوە، بەڵام دەنگۆکان دەڵێن لە هەموو بەندەرێکدا دەستگیرانێکی هەیە (لە ماوەیەکدا هەستمدەکرد لەناو کەشتیەکەشدا دەستگیرانێکی هەبێت. بەهەرحاڵ کچێک بەناوی 'ئینگرید'ەوە بۆ ماوەی شەش مانگ لەسەر کەشتیەکە لەگەڵیدا بوو و دواتر وازی لە کارەکەی هێنا). چەندەها جار پەیمانی داومەتێ کە لەگەڵ خۆیدا کەڕەتێک بە کەشتیەکەی بمباتە دەرەوەی وڵات، بەڵام هەر قسەبووە و هیچی تر، چونکە تا ئێستا هیچ شتێکی وا ڕوینەداوە. لایەنە هەرە بەهێزەکەی؛ وابزانم باشترین مامە کە لە وڵاتی نەرویجدا هەبێت. لایەنە لاوازەکەشی؛ قەت پەیمانەکەی ناباتە سەر. جوانترین قسەش بەلایەوە؛ "پیاوەکە.. خۆ تۆ تا ئێستا نەچوویتەتە ناو دەریاوە!".
ئەوجا تەنها یەک کەس ماوەتەوە کە باسی بکەم و وەسفکردنی ئەویش لە هەموویان سەختترە، چونکە ئەو کەسە 'جۆرج ڕوید'ە. من

باڵام مەترێک و حەفتاوچوار سانتیمەترە، واتە چوار سانتیمەتر لە یۆرگن درێژترم. من پێموانیە یۆرگن ئەوەی پێخۆشبێت، بەڵام خۆ ڕێشی تێدەچێت کە خۆی لێبدزێتەوە! من خۆم 'جۆرج'م، لەبەرئەوە قەت خۆم نابینم کەلە ژورەکەدا بێم و بچم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ڕوبەڕوی خۆم دەبمەوە، ئەوەش لەو کاتە دەگمەنانەدایە کە لە بەرامبەر ئاوێنەیەکدا دەوەستم. ڕەنگە قسەکەم وا بێتە بەرگوێ کە خۆم بە شتێکی گرنگ بزانم، بەڵام بەڕاستی من لەو خەڵکانەم کە تاڕادەیەک سیمای خۆیان بەدڵە. من نامەوێت ڕاستەوخۆ بڵێم کە قۆزم، بەڵام بەلایەنی کەمەوە زۆر ناشیرین نیم. بەهەرحاڵ ئەو خاڵە شایانی سەرنجە، چونکە لە شوێنێکدا خوێندمەوە کە لەسەدا بیستی ئافرەتان پێیان وایە جوانترین لەسەدا سێی ئافرەتانی ئەم وڵاتەبن، وەک دەبینن ئەوە شتێکە کە ڕێیتێناچێت. من نازانم چەندە کەس لەو بڕوایەدان کە لەنێوان ڕێژەی کەسە ناشیرینەکانی وڵاتدابن، بەڵام وای بۆدەچم شتێکی یەکجار ناخۆشبێت گەر ژیانێکی دورودرێژ بژیت و سیمای خۆتت بەدڵ نەبێت. من بەڕاستی ئومێدەوارم کە یۆرگن دڵی بەوە نیگەران نەبێت کە باڵای تەنها مەترێک و حەفتا سانتیمەترە و قژێکی سوری پێوەیە. هەندێ جار ئەو هەستەم هەبووە، بەڵام قەت نەمویراوە لەو بارەیەوە ڕاستەوخۆ پرسیاری لێبکەم.

هەرچی دەربارەی سیمای خۆشمە، کەمێک نیگەرانی ئەو زیپکانەم کە وا هێدی هێدی لەسەر ناوچەوانم دەردەکەون، دڵێشم بەوە ئاو ناخواتەوە کە پاش چوار یان هەشت ساڵێکی دی خۆیان بۆ خۆیان وندەبن. یۆرگن دەڵێت ئەگەر لەگەڵیدا چەند جارێک بۆ ماوەیەکی دورودرێژ مەشقی ڕاکردن بکەم، زیپکەکانم چاکدەبنەوە. بەڵام من نەک هەر باوەڕی پێ ناکەم، بەڵکو وتەکەی وەک قسەیەکی بێمانا

دێتە بەرگوێم و تەنانەت چیتر تاقەتم نیە کالەی ڕاکردنیش لەپێبکەم، چونکە ئەگەر لەگەڵیدا بچم بۆ مەشقکردن، ئەوسا وابیردەکاتەوە من مەشق بۆ ئەوەدەکەم کە زیپکەکانم لەکۆڵببێتەوە. چاوە شینەکانم لە باوکمەوە بۆم ماوەتەوە، قژم زەردە و ڕەنگی پێستیشم هەر زۆر کاڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاوینان ڕەنگی پێستی لەشم قاوەیی دەبێت. لایەنی هەرە بەهێزی؛ 'جۆرج ڕوید' یەکێکە لەو کەسانەی کە بەڕاستی هێندە تێگەیشتووە کە لەسەر ئەستێرەیەکی ڕێگای کا کێشان دەژین. لایەنە هەرە لاوازەکەی؛ زۆر کارامە نیە لە دەنک گرتندا. من هیچ لاریەکم لەوە نیە کەمێک زیاتر لەو بوارەدا خۆم باشتربکەم. جوانترین وتە بەلامەوە؛ "بەڵێ سوپاس، هەردووکیانم دەوێت".

پاش ئەوەی دەستم بەئاو گەیاند، ناچاربووم کەرەتێکی تر بەناو ژوری دانیشتنەکەدا بڕۆمەوە، بەڵام ئەو کەرەتەیان هیچ یەکێکیان ورتەی لەدەم نەهاتە دەرەوە. دیاربوو خۆیان لەناو خۆیاندا لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون کە بێدەنگبن. منیش دەرگای ژورەکەم کردەوە، هەڵبەتە هەر ئەو ژورەبوو کە کاتی خۆی هی باوکم بووە، لەودیوەوە بەکلیل دامخستەوە و لەسەر جێگاکەم بۆی پاڵکەوتمەوە. خەریکبوو نهێنی کچەی پرتەقاڵم بۆ ڕوندەبووەوە. هەڵبەتە بەو مەرجەی ئەگەر باوکم کەرەتێکی تر بیبینیایەتەوە. پێیدەچێت جادووگەر بووبێت. بەهەرحاڵ توانیبووی جادوویەک لەباوکم بکات. دەبێت هۆیەکی زۆر گرنگ هەبێت کە وای لەباوکم کردووە باسی ئەو کچەم بۆ بکات. دیارە شتێک هەیە و دەیەوێت من بیزانم، دیارە شتێکی گرنگی لە خەیاڵدابووە و بەرلەمردنی ویستویەتی بۆم بگێڕێتەوە.

نازانم بۆ بەڵام هەر لەخۆمەوە هەستمدەکرد کچەی پرتەقاڵ پەیوەندیەکی بە تەلیسکۆبەکەی هۆبڵەوە هەبێت، یان لایەنی کەم بەشێوەیەک لەشێوەکان پەیوەندیەکی بە گەردوون و ئاسمانەوە هەبێت. باوکم چەند دێڕێکی سەیری نوسیبوو و دیسانەوە ئەو خەیاڵەی خستەوە مێشکم. لاپەڕەکانم بۆ دواوە هەڵدایەوە و سەرلەنوێ خوێندمەوە؛ **"وەڵامی نەدامەوە، بەس دەستمی بە توندی گوشی _لەوە دەچوو وەک شتێکی بێ کێش لە ئاسماندا بخولێینەوە، هەر دەتوت تێر تێرمان لە شیری نێوان گەلەهەسارەکان خواردۆتەوە و هەموو گەردوون هی خۆمانە".**

بڵێیت کچەی پرتەقاڵ لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتبێت؟ بەلایەنی کەمەوە ئامازەی بەوەدا کە لە هەقیقەتێکی ترەوە هاتووە. یان بڵێیت لە 'یوفۆ'یەکەوە هاتبێت؟ بێگومان نەء، من باوەڕم بەو شتانە نیە و دڵنیاشم باوکیشم باوەڕی بەو شتانە نەبووە. بەڵام ڕەنگە کچەکە خۆی لەو بڕوایەدابووبێت! ئەوەش هەر شتێکی خراپە.

تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ لەماوەی 97 خولەکدا کەرەتێک بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە، واتە 28 هەزار کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا دەبڕێت. هەروەک بەراوردکاریەک دەڵێم یەکەمین شەمەندەفەری هەڵمی 68 کیلۆمەتری نێوان 'ئۆسلۆ' و 'ئایدسڤۆل'ی بە دوو سەعات و نیو بڕیووە، من خێرایی ئەو شەمەندەفەرەم دەرهێناوە و دەکاتە نزیکەی 28 کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا. واتە تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ لەچاو یەکەمین شەمەنەفەری نەرویجدا، هەزار کەرەت خێراتر دەڕوات (مامۆستاکەم ئەو بەراوردکاریەی زۆر بەلاوە جوانبوو!).

28 هەزار کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا! لە خێراییەکی ئاوهادا دەتوانین باس لە بێکێشی بکەین لە ئاسماندا! ڕەنگە بشتوانین باسی تێرخواردنەوەی شیری 'نێوان گەلەهەسارەکان' بکەین، بەتایبەتیش

کە بەردەوام وێنەی ئەو گەلەهەسارانە بگرێت کە ملیۆنەها ساڵی تیشکی لە گەلەهاسارەی کاکێشانەوە دورن.
تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ دوو باڵی پێویە کە لەوحی خۆری پێوەیە. درێژی هەریەکەیان دوانزە مەترە و مەترونیوێکیش پانن، بەهەردووکیان 3000 وات بە سەتەلایتەکە دەبەخشن. بەڵام دوو ئاشقەکەی کڵێسە گەورەکەی شار، بەرلەوەی بەلای مۆزەخانەی 'مێژوویی'دا تێپەڕن و بگەنە لای پارکی قەڵا، هەریەکەو لەسەر باڵێکی تەلیسکۆبەکەش نەبوون و کەچی هەستیانکردووە هەموو گەردوون هی خۆیانە. بەڵام خۆ کێ دەزانێت، ڕەنگە لەو پەڕی ئاسمانیشدابووبن.
کاغەزەکانم هەڵگرتەوە و دەستم کردەوە بە خوێندنەوە.

لە ماوەی نێوان جەژنی لەدایک بوونی مەسیح و سەری ساڵدا هیچ هەوڵمنەدا بەدوای کچەی پرتەقاڵدا بگەڕێم. ویستم هەر هیچ نەبێت جەژنەکەم بەئارامی لێبرواتت. بەڵام هەر لە دەوروبەری ناوەڕاستی مانگی یەکەوە دیسانەوە دەستمپێکردەوە. ئەو کاتە لەو پەڕی چالاکیدابووم.
بەسەدان جار هەوڵمدا جێشوێنێکی ئەو کچە بدۆزمەوە، بەڵام هیچێکی وام بەدەست نەکەوت، لەبەرئەوەش هیچ شتێکی وام پێنیە کە بۆتی باسبکەم. من دڵنیام کە ئێستاکە تۆ لەگەڵ ڕیتم و لۆجیکی ئەم چیرۆکەدا ڕاهاتوویت.
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا دەمەوێت لەو ڕێسایە دەربچم و شتێکی گرنگت بۆ باسکەم کە کاتی خۆی بیرمچووبوو بیخەمە ناو لیستەی ئەو مەتەڵانەوە کە دەبوایە هەوڵی شیکردنەوەیانت بدایە. قەمسەڵە کۆنە کڵاودارەکە، جۆرج! ئەی ئەو چی؟ بەپلەی یەکەم هەر ئەو

قەمسەڵەیەبوو کە خەیاڵی سەفەرە سەختەکەی ناو بەفر و سەهۆڵانی گرینلاندی بە مێشکمدا هێنا. هەر ئەو قەمسەڵیەش یەکەمجار وایلێکردم مەزەندەی ئەوەبکەم کە کچەی پرتەقاڵ زۆر فەقیربێت. بەڵام لەسەرو هەموو شتێکەوە ئەو قەمسەڵەیە نیشانەی ئەوەبوو کە کچەی پرتەقاڵ حەزی لە هەوای پاکە.

ئەو زستانە چەندەها جار بەمەبەستی خلیسکێنەی سەر بەفر چوومە دەرەوە، وابزانم هەر خلیسکێنەی سەر شاخەکان و 'ئۆسلۆمارکە' یاریدەی لەشی دام و بۆ ماوەی چەند مانگێک ئەو نەخۆشیە کوشندەیەی لێ دورخستمەوە. بەڵام من لێرەدا نامەوێت باسی ئەو پیاسانەت بۆ بکەم، چونکە لە هیچ شوێنێکدا کچەی پرتەقاڵم نەبینی، نە لە شوێنی خلیسکێنەکاندا بینیم و نە لە 'کیکوت'یشدا، نە لە 'ستریوکن' و 'هارستوە'شدا چاوم پێکەوت. بەڵام دواتر لەسەرەتای مانگی سێدا ڕۆژی یەکشەممەی یاریەکانی خلیسکێنەی سەر بەفری 'هۆلمنکۆلن' نزیکبووەوە. هەر بیرکردنەوە لەو پێشبڕکێی خۆ هەڵدانی سەر بەفرە دڵشادی دەکردم. هەر دەتووت هەموو پارچەکانی وێنەکە چوونەتە شوێنی خۆیان، لەوەدەچوو تەواوی وێنەکە دیاربێت. وا دەهاتە بەرچاوم کە دوانزە ژمارەی یانسیبێکم ڕاستبێت و نیوەی ژمارەی سیانزەهەمیشم مسۆگەر کردبێت.

لە ڕۆژی یەکشەممەی 'هۆلمنکۆلن'دا ئەگەر ئاووهەوا خۆش بێت، ئەوا پەنجا هەزار کەس لەوێدا کۆدەبێتەوە. واتە بەشێکی دیاری دانیشتوانی ئۆسلۆ لەو ڕۆژەدا دەچنە سەر ئەو بەرزاییە. بەڵام بەبڕوای تۆ چەندێک لە دانیشتوانی ئۆسلۆ بە بەردەوامی قەمسەڵەیەکی کۆنی لەو شێوەیە لەبەردەکەن؟ من خۆم لەو بڕوایەدام نزیکەی لەسەدا سەدی دانیشتوانی ئۆسلۆ هەمیشە قەمسەڵەی باران لەبەربکەن.

لەبەرئەوە ئەو یەکشەمەیە چووم بۆ 'هۆلمنکۆلن' و ئاووهەواش هێندە خراپ نەبوو ـدەتوانم بڵێم مامناوەندیبوو. لەوێدا دەرفەتی بینینی کچەی پرتەقاڵ لە پەنجا هەزار زیاتربوو. بەڕاستی دەمەوێت یەک شتت پێبڵێم؛ ئەو یەکشەمەیەی مانگی سێ لەسەر بەرزاییەکەی ئۆسلۆ، گەلێ کەس قەمسەڵەی کۆنی لەو جۆرەی لەبەردابوو، جمەیان دەهات. ڕۆژی یەکشەمەی هۆلمنکۆل هەر بە پێشانگایەکی قەشەنگی قەمسەڵە بارانیە کۆنەکان دەچێت، کۆمەڵێک ڕەنگی هەمەجۆری پەڕیوی تێدا دێتە بەرچاو. لەبەرئەوە بە هیچ جۆرێک تەماشای خلیسکێنە و خۆهەڵدانی سەر بەفرەکەم نەکرد، چونکە قەمسەڵە کڵاودارەکان بیروهۆشیان بردبووم و هەر لێیان وردەبوومەوە. چەندەها جار کچەی پرتەقاڵم بینی و هەموو جارێکیش شاگەشکەدەبووم، بەڵام هیچ کەڕەتێکیان خۆی نەبوو. یەک دوو کەڕەتێکیش تەوقە ئەفسوناویە زیوینیەکەیم بینی، بەڵام ئەوەی ئەو نەبوو. جۆرج، ئەو لەوێ نەبوو. هەر ئەوەندەم دەستکەوت کە ئەو لەوێ نەبوو، جگە لەوە هیچ شتێکی ترم نەبینی. تەنانەت نەمزانی چ کەسێک بردیەوە. هەموو سەرنجم لەو ڕۆژی یەکشەممەیەی 'هۆلمنکۆل'دا تەنها چووە سەرئەوەی کە کچەی پرتەقاڵ لەوێ نەبوو. چاوم بەس ئەو شتەی دەبینی کە نوقسانبوو.

لەدوای ئەوەوە تەنها یەک کەڕەتی تر سەردانی هۆلمنکۆلم کردەوە، نازانم ئا ئێستاکە ئەم باسە خەیاڵێک بە مێشکتدا دێنێت یان نا؟ بڵێیت یادوەریەکی ناڕونی شتێکت بێتەوە یاد کە من و تۆ پێکەوە کاتی خۆی بینیومانە، ئەو کاتەی کە تۆ نزیکەی سێ ساڵان بوویت؟

ئەو ساڵە من و تۆ لە پانتاییەکەی خوارەوەدا وەستابووین و تەماشای وەرزشوانەکانمان دەکرد کە خۆیان هەڵدەدا. ئاووهەوای ئەو ڕۆژەی مانگی سێ هەر زۆر تایبەتی بوو. بایەکی گەرم و وشکی ناوازە خۆی

بەسەر وڵاتدا کێشا و پلەی گەرمای بەرزکردەوە، هەر لە هاوین دەچوو. لەبەرئەوە ناچاربوون ئەو هەموو بەفرەی کە پێویستبوو بۆ ئەو پێشبڕکێ گەورەیە لە باکوری نەرویجەوە بهێنن، ڕێک لە شاخەکانی 'فینس'ەوە هێنایان. ئەو ساڵە 'یانس وایسفلۆگ' مەدالیای ئاڵتونی بردەوە. هەڵبەتە ئەو ئەنجامەش خەڵکانی نەرویجی لەڕادەبەدەر نائومێدکرد، بەڵام لەهەمان کاتیشدا نەبووە مایەی واقوڕمانێکی گەورە، چونکە ساڵی پێشووش هەر ئەو یەکەم بوو.
پێم خۆشە نهێنیەکی بچکۆلەت بۆ باسبکەم. تەنانەت ئەو کاتەش کە شەش مانگێک لەمەوبەر هەردووکمان لەو ڕۆژە خۆشەی مانگی سێدا لە هۆلمنکۆل بووین، هەر لەخۆمەوە بەدوای کچەی پرتەقاڵدا دەگەڕام. ئەو کاتە دە ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو، بەڵام هێشتا نائومێدیەکەی لەناوەوەمدا مابووەوە.

هێندە کاتێکی زۆرم لەبەردەستدا نیە کوڕەکەم، بەڵام هەر لەبەرئەوە نیە کە دەمەوێت چەند حەفتەیەک بپەڕێنم، بەڵکو لەبەرئەوەشە کە لەو ماوەیەدا هیچێکی وام لانیە کە بۆتی باسبکەم. لە ڕۆژێکی کۆتایی مانگی چواردا لەناکاودا پۆستکارتێکی جوانم لە سندوقی پۆستەکەمدا بینی. ئەو ڕۆژە شەممەبوو و منیش بەمەبەستی سەردانی دایک و باوکم چووبوومە هوملەفای. سەیربوو.. پۆستکارتەکە بۆ من هاتبوو بەڵام نەنێردرابوو بۆ 'ئادەمستوون'، ئەو کاتە من چەند مانگێک بوو لەوێدا لەگەڵ 'گۆنار'دا دەژیام.
دە ئێنجا باش گوێ بگرە؛ لەسەر دیوێکی پۆستکارتەکە وێنەیەکی ئەفسوناوی باخێکی پرتەقاڵی لەسەربوو و بەخەتێکی گەورە لەسەر وێنەکە نوسرابوو "NARNJOS PATIO DE LOS"، واتە باخی پرتەقاڵ. من دەمتوانی هێندە بە زمانی ئیسپانی بخوێنمەوە،

هەروەک لەوەوپێش پێم وتیت هەمیشە دەستێکی باڵام لە لێکدانەوەی نیشانەکاندا هەبووە.
باخی پرتەقاڵ! خەریکبوو دڵم لە قەفەزەی سنگمەوە دەهاتە دەرەوە. جۆرج، شتێک هەیە پێی دەڵێن فشاری خوێن. لە پڕێکدا لەو کاتانەی کە تووشی حاڵەتێکی زۆر وروژێنەر دەبین فشاری خوێنمان یەکجار بەرزدەبێتەوە، لەڕاستیدا هەر زۆر لەپڕدا بەرزدەبێتەوە. بەڵام هەر لەبەرئەوە ڕێگە لە خۆت مەگرە کە تاقیکردنەوەی گەورە و هەستی قوڵ ئەزموونبکەیت، چونکە لەڕاستیدا حاڵەتێکی سروشتی و بێزیانە (بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێمخۆشە قەت بە پەرەشووت خۆت هەڵنەدەیتە خوارە و دووربیت لە فڕۆکەی چارۆکەداریش. لایەنی کەم خۆ هەڵدان بەهۆی لاستیکە بەهێزەکانەوە تاقیمەکەرەوە!)
پۆستکارتەکەم هەڵگێڕایەوە. لە شاری 'ئیشبیلیا' مۆری لێدرابوو و هەر تەنها ئەم چەند وشەیەی لەسەر نوسرابوو؛ *"بیرم لێ کردیتەوە... دەتوانیت کەمێکی تریش دان بەخۆتدا بگریت و چاوەڕوانم بیت؟"*
هیچی تری لێ نەنوسرابوو، نەناوی ئەو کەسەی کە ناردبوی و نە ناونیشانیشی پێوەبوو. بەڵام وێنەی دەموچاوێکی لەسەر کێشرابوو ـوێنەی دەموچاوی خۆی بوو، جۆرج.. دەموچاوە سمۆرەییەکەی بوو. لەوەدەچوو نەک هەر بە فڵچەی وێنەکێشێک دەموچاوەکە نەخشێنرابێت، بەڵکو لەکاری وێنەکێشێکی گەورە دەچوو.
لەڕاستیدا هێندە سەرم نەسوڕما. بێگومان کچەی پرتەقاڵ دەبوایە لە باخی پرتەقاڵدا بوایە، ئێ لە کوێ بوایە؟ هەر زۆر بە کورتی سەفەری کردبووەوە بۆ ماڵی خۆی و چووبوەوە ناو مەملەکەتەی خۆی، گەڕابووەوە بۆ وڵاتی پرتەقاڵ. ڕێک لەگەڵ لێکدانەوە و مەزەنەکانی

مندا ڕێک دەکەوت. مەسیحیش کاتی خۆی هەر بۆ ئەوە نەگەڕایەوە کڵێسەکە کە لەناو ماڵی باوکیدا بێت؟
لەوە بەدواوە بە ئاسانی لە هەموو شتێک تێدەگەیشتم. وەڵامی هەموو مەتەڵەکان کەوتنە ڕوو. هەموو یاری کاغەزەکان کرانەوە. لەو خوارانەوە کچەی پرتەقاڵ دەتوانێت بەڕاشکاوی خەریکی ئارەزووە سەیرەکەی بێت و بەشێوەیەکی هونەرئاسا گرنگی بە پرتەقاڵە جۆراوجۆرەکانی بدات، ئەوجا دواتریش بەڵکو خۆشبەختانە بتوانێت دەست لە پرتەقاڵەکانی هەڵبگرێت و پەیمانەکەی بەرێتە سەر، ئیتر بۆ ماوەی شەش مانگ دەتوانین هەموو ڕۆژێک یەکتر ببینین. ئینجا خۆ لەوانەیە دیسان ناچاربێت بەرو ئەو خوارانە سەفەر بکاتەوە و بای باڵێ خۆی بدات، بەڵام چ پێویست دەکات لە ئێستاوە نیگەرانی ئەوە بم.
دڵم خۆشبوو و مێشکم لەڕادەبەدر مادەیەکی بەرهەمدەهێنا کە ئێمە لە زمانی پزیشکیدا پێی دەڵێین "ئیندۆرفین". ئێمە وشەیەک بۆ ئەو حاڵەتە بەکاردەهێنین و وەک سوکە نەخۆشیەک تەماشای دەکەین، ئێمە دەڵێین؛ نەخۆشەکە شاگەشکە بووە. من کتومت خۆمم لەو حاڵەتەدا دەبینیەوە. نەمدەزانی چی بکەم، لەتاوانا ڕامکردە حەوشەکەمان خۆم گەیاندە لای دایک و باوکم. دایکم لەسەر جۆلانە سەوزەکە دانیشتبوو و باوکیشم لەسەر کورسیە درێژەکە ڕاکشابوو و ڕۆژنامەیەکی بەدەستەوە بوو. بەهەڵەداوان لێیان نزیک بوومەوە و وتم 'ژن دێنم'. بەڕاستی وام پێوتن و بۆم ڕونکردنەوە کە مەبەستمە ژن بهێنم. بەڵام دەبوایە زمانی خۆمم بگرتایە و ئەو قسەیەم نەکردبایە، چونکە هەر پاش چارەکێک هێوربوومەوە. مێشم چیتر بەهیچ شێوەیەک مادەی 'ئیندرۆفین'ی بەرهەم نەدەهێنا و لەبەرئەوە

حاڵەتی شاگەشکەبییەکەم لەدەستدا. لە هیچ شتێک تێنەدەگەیشتم. هەستمدەکرد هیچ کاتێک لە هەموو ژیانمدا هێندە نەزان نەبووم.
لەوەوپێش کچەی پرتەقاڵ هێندەی بۆ دەرخستم کە ناوی من دەزانێت. بەڵام وا دەرکەوت کە ناوی باوکیشم دەزانێت. لەوەش زیاتر، جۆرج.. لەوەش زیاتر؛ جگە لەوەش لەو خوارانەوە لە وڵاتی پرتەقاڵدا ناونیشانی ماڵەکەی 'هوملەفای' لابوو. تۆ چۆنی لێکدەدەیتەوە؟ بەلامەوە شتێکی جوان بوو.. من پێم خۆشبوو بیری لێبکەمەوە، ئیتر وەڵامی مەتەڵەکە هەرچیەک بێت. پێش سەفەرەکەی ئێمە چەند خولەکێکی ئەفسوناویمان پێکەوە بردەسەر، دەست لەناو دەست بەرەو پارکی قەڵا دەڕۆیشتین، بەرلەوەی زەنگی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح لێبدرێت ناچاربوو پێشئەوەی گالیسکەکەی ببێتەوە بە کولەکە خۆی فرێبداتەوە ناوی.. بەڵام ئایا کەمێک مایەی دڵتەنگیش نیە کە هەروا بەئاسانی سەفەری کردووە بۆ ئیسپانیا و بەهیچ شێوەیەک لەو چەند خولەکە ئەفسوناویەدا ناوی ئەو سەفەرەی نەهێنا؟
ئێستاکە سێ مانگ و نیو بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیووە، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتەوە بیست و پێنج کەڕەت خلیسکێنەی سەر بەفرم کردووە، لەچەندەها شوێنیشەوە هەوڵمدا سۆراغی بکەم، بەڵام نامەوێت باسیان بکەم.
خۆ ڕێیتێدەچێت کچەی پرتەقاڵ سەفەری بۆ مەغریب و کالیفۆڕنیا و بەڕازیلیش کردبێت؟ کێ دەزانێت؟ جۆرج، ئەمڕۆکە پرتەقاڵ درەختێکی بەسوودی سەر ئەم زەویەیە، بەبڕوای من دەبوایە لەمێژەوە وەک گرنگترین میوەی سروشت دابنرایە. ڕەنگە کچەی پرتەقاڵ لە ژێرەوە بەشێوەیەکی زۆر نهێنی ئەندامی پشکنینی پرتەقاڵی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان بێت 'UNIO' و ئەو کارەی لە

ئەستۆدا بێت کە نەهێڵێت نەخۆشیەکی بەدی نوێی پرتەقاڵ تەشەنەبکات؟ بڵێیت هەر لەبەرئەوە بووبێت کە بەردەوام دەچووە 'یۆنگستۆرگت' و لە حاڵەتی باش و خراپی پرتەقاڵەکان وردەبووەوە؟ بڵێیت هەر لەبەر ئەوە بووبێت کە هەموو حەفتەیەک کۆمەڵێ پرتەقاڵی بۆ تاقیکردنەوە هەڵدەبژارد؟

لەوانەیە سەفەری 'چین'یشی کردبێت. دەمێکبوو دەمزانی کە بە پرتەقاڵ دەڵێن 'سێوی چین'ی، چونکە لە بنەڕەتدا پرتەقاڵ یەکەم جار لەوێوە سەریهەڵداوە. بەڵام ئەگەر کچەی پرتەقاڵ بە مەبەستی حەجکردن سەفەری بۆ چین کردبێت، سەفەری بۆ ئەو وڵاتە کردبێت کە بۆ یەکەمین جار گوڵی پرتەقاڵی تێدا پشکوتووە، ئەوا ئەو کاتەش هەر نەمدەتوانی بەم ناونیشانەی خوارەوە پۆستکارتێکی بۆ ڕەوانەبکەم؛ 'بۆ کچەی پرتەقاڵ.. وڵاتی چین'. ئەو کاتە سەختبوو پۆستەچیەکەی ئەوێ بتوانێت لە نێوان سەرو ملیارد کەسێکەوە کچەی پرتەقاڵم بۆ بدۆزێتەوە. من خۆم بومایە دەمتوانی بیدۆزمەوە، بەڵام گومانم هەیە پۆستەچیە چینیەکە هێندەی من بۆ ئەو کارە چالاک و بە پەرۆشبێت.

بەهەرحاڵ جۆرج، با لەسەر باسەکەمان بەردەوامبین.

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک خۆم لە خوێندنەکەم دزیەوە، هەزار کرۆنێکم لە دایک و باوکم قەرزکرد و بلیتێکی هەرزانی فڕۆکەم بۆ شاری مەدرید کڕی. ئەو شەوە لەماڵی مامی برادەرێکی کۆنی قوتابخانەم مامەوە. بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر هەر بەفڕۆکە خۆم گەیاندە ئیشبیلیا. دڵنیانەبووم لەوەی کە دەیدۆزمەوە، بەڵام وام مەزەنە دەکرد شەنسی بینینیم لەوێدا هێندەی شەنسی بینینیم لە 'هۆلمنکۆلن'دا کەمتر نەبێت. بیرم لە شتێکی تریش دەکردەوە؛ لەدڵی خۆمدا دەموت

تەنانەت ئەگەر لە ئیشبیلیاشدا ڕوو بە ڕوو نەیبینم، ئەوا هەر هیچ نەبێت ئەوەندەم بۆ دەردەکەویت کە ماوەیەکی کەم لەوەوبەر لەوێدا بووە و ئەوجا سەفەریکردووە بۆ شوێنێکی تر، بۆ نمونە بۆ مەغریب. لەهەموو بارێکدا وڵاتی پرتەقاڵم دەبینی، کەمێک لە هەمان ئەو هەوای ترشی پرتەقاڵەم هەڵدەمژی کە ئەو هەڵیمژیبوو، هەر هیچ نەبێت بەهەمان ئەو شەقامانەدا دەڕۆشتم کە ئەوی پێدا تێپەڕیبوو، خۆ ڕەنگە لەسەر هەمان ئەو کورسیەش دابنیشتمایە کە ئەوی لەسەر دانیشتبوو. من تەنها ئەوەندەم بەسبوو بۆ ئەوەی سەفەرێکی ئەو خوارانە بکەم. جگە لەوانەش زۆر ڕێتێدەچوو هەندێ جێشوێنی گرنگی کچەی پرتەقاڵ بدۆزمەوە، بۆ نمونە لە باخی پرتەقاڵەکەدا، هەڵبەتە ئەگەر ڕێگەم پێبدەن پێ بخەمە ناوی. بە خەیاڵی خۆم کەناڵێکی ئاویان بەچواردەوری ئەو شوێنە پیرۆزەدا لێداوە و چەند پاسەوانێک و کۆمەڵێک سەگی دڕ ئەو ناوە دەپارێزن.

بەڵام هەر پاش نیو سەعاتێک لەدوای ئەوەی کە گەیشتمە ئیشبیلیا، بەبێ هیچ گرفتێک بەناو باخی پرتەقاڵەکەدا تێپەڕیم. باخێکی قەشنگ بوو و چواردەوری گیرابوو، هەر ڕێک بە کڵێسە گەورەکەوە نوسابوو، هەر لە باخچە کلاسیکیە نەخشدارەکان دەچوو. بەهەرحاڵ داری پرتەقاڵەکان بەڕیزی یەک چێنرابوون و پرتەقاڵی لەڕادەبەدەر گەیویان پێوەبوو.

بەڵام کچەی پرتەقاڵ لەوێ نەبوو، پێیدەچوو هەروا بۆ پیاسەیەک چووبێتە ناو شار. لەدڵی خۆمدا دەموت 'بێگومان کەمێکی تر دێتەوە...'

هەوڵمدەدا بە شێوەیەکی ئەقڵانی بیربکەمەوە. دەمویست بڕوا بە خۆم بهێنم و بڵێم 'بێگومان چاوەڕوانی ئەوە نیم دەمودەست کچەی پرتەقاڵ ببینم، ڕەنگە تا یەک دوو ڕۆژێکی تریش نەیبینم'.

لەبەرئەوە تەنها سێ سەعات لە باخەکەدا مامەوە. بەڵام هەروا بۆ دڵنیایی خۆم لەناوەڕاستی باخەکەدا لەلای نافورەی ئاوەکەوە کاغەزێکی بچکۆلەم بۆ جێهیشت و لەسەرم نوسی "منیش بیرم لە تۆ کردەوە.. نەخێر ناتوانم چیتر چاوەڕوانت بم". بەردیکی بچکۆلەشم خست سەر کاغەزەکە و جێمهێشت.
ناوی خۆمم لەسەر کاغەزەکەم نەنوسی، تەنانەت ناوی ئەو کەسەشم نەنوسی کە کاغەزەکەم بۆ ناردبوو، بەڵام شێوەی هێلکاریەکی دەموچاوی خۆمم لەسەر کێشا. بە هیچ جۆرێک لە خۆم نەدەچوو، بەڵام هیچ گومانێکم نەبوو کە کچەی پرتەقاڵ لەگەڵ بینینی کاغەزەکەدا وێنەکە دەناسێتەوە و دەزانێت چ کەسێکە. بێگومان پاش نەختێک هەر دێتەوە، خۆ هەر هیچ نەبێت تاوناتاوێک بۆ وەرگرتنی پۆستەکەی دەگەڕێتەوە.

پاشئەوەی بەردەکەم خستە سەر کاغەزەکە بەرەو شار کەوتمە ڕێ، کاتژمێرێک تێپەڕی و ئینجا هێندە تێگەیشتم کە ڕەنگە هەڵەیەکی گەورەم کردبێت، خۆم سەرم لە کارەکەی خۆم سوڕما.
ئەو کاتی خۆی پێی وتم؛ *"دەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ چاوەڕوانم بکەیت. ئەگەر دەتوانێت هێندە دان بەخۆتدا بگریت، ئەوا دەتوانین یەکتر ببینینەوە"*. منیش پرسیم؛ *"ئاخر بۆ هێندە زۆر؟"*، لەوێدا کچەی پرتەقاڵ زۆر بەساکارانە لەوەڵامدا وتی؛ *"چونکە چارت ناچارە و دەبێت کتومت هێندە چاوەڕوان بیت، بەڵام ئەگەر هێندە دان بە خۆتدا بگریت، ئەوا هەموو ڕۆژێکی شەش مانگی دواتر دەتوانین پێکەوەبین"*.
جۆرج، لێم تێدەگەیت؟ من یاساکانم شکاند. نەمتوانی بۆ ماوەی شەش مانگ چاوەڕوانی بم. لەبەرئەوە نەمدەتوانی چاوەڕوانی ئەوەبم کە

ئەو پەیمانەکەی بەرێتە سەر و هەموو ڕۆژێکی شەش مانگی دواتر ببینم.
ئەو پەیمانە ڕەسمیەی نێوانمان لە ڕادەبەدەر ئاشکراو و ڕونبوو، بەڵام زۆر سەختبوو بیبەمەسەر. بەڵام خۆ هەموو حەکایەتێک یاسای تایبەتی خۆی هەیە.. بەڵێ، ڕەنگە هەر کتومت ئەو یاسایانە حەکایەتەکان لەیەک جودابکاتەوە. پێویست ناکات لەو یاسایانە تێبگەین، بەڵام دەبێت لەسەریان بڕۆین. هەڵبەتە ئەگەر وا نەکەین، ئەو کاتە پەیمانەکان نایەنە دی!
جۆرج، تۆ لەوە تێدەگەیت؟ بۆچی دەبوایە سەندرێلا پێش سەعات دوانزەی شەو هۆڵی سەمای کۆشکەکە جێبهێڵێت و بگاتەوە ماڵەوە؟ من خۆم نازانم بۆ، بەدڵنیاییەوە سەندرێلاش نەیدەزانی بۆ دەبوایە بەو شێوەیە بوایە. بەڵام ئەگەر خۆمان بخەینە ناو جادوویەکی دڵفرێنی دونیای خەیاڵاتەوە، ئەوا بۆمان نیە ئەو جۆرە پرسیارانە بوروژێنین. ئەو کاتە دەبێت هەروا بەئاسانی ڕازیبین بە مەرجەکان، هەرچەندە گەر لێشیان تێنەگەین. ئەگەر سەندرێلا بیەوێت دڵی کوڕی پاشا فریوبدات، ئەوا دەبێت پێش کاتژمێری دوانزەی شەو هۆڵی سەمای کۆشکەکە بەجێبهێڵێت. هەروا بەڕوونی و بە ئاسانی دەبێت لەسەر یاساکان بڕوات و هیچی تر. ئەگەر وا نەکات، ماکسیەکەی بەری لەدەستدەدات کە سەمای پێوە دەکات و لەلایەکی تریشەوە گالیسکە جوانەکەی دەبێتەوە بە کولەکە. بەکورتی دەبێت پێش کاتژمێری دوانزە لە ماڵەوەبێت و تاڕادەیەکیش دەتوانێت؛ هەر ئەوەندەیە لەڕێگادا تاکێکی پێڵاوەکەی لێ بەجێدەمێنێت. مایەی سەرسوڕمانیشە کە دواتر کوڕی پاشاکە بەهۆی ئەو تاکە پێڵاوەوە دەیدۆزێتەوە. لەو حەکایەتەدا دەستە خوشکە بەدەکان بەپێی

یاساکان ناجوڵێنەوە و لە ئاکامیشدا بەخراپی بەسەریاندا دەشکێتەوە.
بەڵام لە حەکایەتەکەی خۆماندا چەند یاسایەکی تری تێدایە. ئەگەر بمتوانیبایە سێ کەڕەت لەسەر یەک کچەی پرتەقاڵ لەو کاتانەدا ببینم کە زەرفێک پرتەقاڵی بە باوەشەوەیە، ئەو کاتە بۆ من دەبوو. بەڵام بێگومان دەبوایە سیمایەکیشیم لە ئێوارەی جەژنی لەدایکبوونی مەسیحدا ببینیایە، ڕەنگە لەوە زیاتریش؛ ناچاربووم ڕێک لەو کاتەدا تەماشای ناو چاوی بکەم کە زەنگی جەژن لێدرا، هاوکاتیش دەبوایە دەستم بە تەوقە زیوینە ئەفسوناویەکەیەوە بووایە. لەپاش ئەوەوە تەنها یەک تاقیکردنەوە مابووەوە و دەبوایە لەوەشدا دەربچم؛ دەبوایە دان بەخۆمدا بگرم و تا ماوەی شەش مانگ نەیبینم... جۆرج، لێم مەپرسە بۆ دەبوایە بەو شێوەیە بوایە، چونکە یاساکان وابوون. دەبوایە لەدواهەمین و گرنگترین تاقیکردنەوەدا دەربچم، دیسانەوە واتە دەبوایە بۆ ماوەی شەش مانگ نەیبینم، ئەگەر نا، ئەوا هەموو ڕەنج و ماندووبونی پێشووم بەبادەچوو و هەموو شتێکم لەدەست دەدا.
بەپەلە گەڕامەوە بۆ باخی پرتەقاڵەکە. بەڵام کاغەزەکەمی لێنەمابوو، دڵنیاش نەبووم کە کچەی پرتەقاڵ بردبێتی. چونکە زۆر ڕێی تێدەچوو گەشتیاریکی نەرویجی هەڵیگرتبێت.
ڕێک لەو کاتەدا کە چاوم چووە سەر بەردە بچکۆلەکەی کە خستبوومە سەر کاغەزەکە _کە وەک وتم لێی نەمابوو_ خەیاڵێکی تر بە مێشکمدا هات. خەیاڵێک کە کەمێک هیوا و ئومێدی پێبەخشیمەوە، هەرچەندە لە یاساکانیش لایدابوو. تۆ ئەم خەیاڵە چۆن دەبینیت جۆرج؛ کچەی پرتەقاڵ دەستپێشکەری کرد و نامەیەکی بۆ ناردم، چونکە ئەو ناونیشانەکەی منی لابوو. ئێ منیش بەهەمان شێوە

پەیامێکم بۆ نوسی، بەڵام لەبەرئەوەی ناونیشانەکەیم لانەبوو، ناچاربووم خۆم وەک پۆستەچیەک بەدەستی بیگەێنمە ئەو باخەی کە ئەو نامەکەی لێوە ناردبوو.
بەبڕوای تۆ بەشێوەیەک لە شێوەکان هەردووکمان وەک یەکمان نەکردووە؟ پێت وانیە ئەویش یاساکانی شکاندبێت؟ جۆرج، تۆ چۆنی دەبینیت؟ تۆش دەتوانیت هەروەک من یاساکانی حەکایەتەکە لێکبدەیتەوە.
بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەو هەر ئەوەندەی لێداواکردم کە کەمێکی تر چاوەڕوانبم. دەتوانین بڵێن پەیمانەکەی نوێ کردۆتەوە و هیچی تر. منیش لە وەڵامیدا وتم کە ناتوانم مەرجەکانی قبوڵبکەم، واتە نامەوێت چیتر پەیڕەوی یاساکان بکەم.
ئەو نوسیبووی؛ *"بیرم لێ کردیتەوە... دەتوانیت کەمێکی تریش دان بەخۆتدا بگریت و چاوەڕوانم بیت؟"*
بەڵام باشە جۆرج؛ ئەگەر وەڵامم بۆ ئەو پرسیارە ئەوەبوایە کە من ناتوانم دان بەخۆمدا بگرم، ئەو کاتە بەبڕوای ئەو دەبوایە من چیم بکردایە؟
نا، نەمدەتوانی بیر لەوە بکەمەوە، چونکە تازە زۆر تێوەگلابووم و دەبوایە بمدۆزیبایەتەوە.

من لەوەوپێش هەرگیز شاری ئیشبیلیام نەبینیبوو، تەنانەت ئیسپانیاشم نەدیبوو. بەڵام پاش نەختێک دوای شەپۆلی گەشتیاران کەوتم و بەرەو گەڕەکی دێرینی جولەکەکان کەوتمە ڕێ. بەو گەڕەکە دەڵێن "سانتا کروز" و هەرلە ناوچەی کڵێسایەکی گەورە دەچێت کە بۆ ڕێزلێنانی پرتەقاڵ دروستکرابێت وەک درەختێکی سودبەخش.

بەلایەنی کەمەوە لەو گەڕەکەدا چواردەوری هەموو گۆڕەپان و چوارڕاکان بە داری پرتەقاڵ ڕازێنراونەتەوە.
پاش ئەوەی لە گۆڕەپانێکەوە بۆ گۆڕەپانێک دەڕۆیشتم و کچەی پرتەقاڵم نەبینی، بڕیارمدا لە قاوەخانەیەک لابدەم، لەژێر سێبەری دار پرتەقاڵێکدا کورسیەکی بەتاڵم دۆزیەوە و بۆی دانیشتم. پاش ئەوەی هەموو گۆڕەپانەکانی 'سانتا کروز'م بینی، بەلامەوە ئا ئەم یەکەیان لە هەموویان جوانترێک بوو، پێیان دەوت گۆڕەپانی "ئەلیانزا".
دانیشتبووم و بیرم لەم شتەی خوارەوە دەکردەوە؛ ئەگەر بتەوێت لە شارێکی گەورەدا کەسێک بدۆزیتەوە و نەشزانیت لە چ شوێنێکی شارەکەدایە، ئەو کاتە باشترێکە کوناوکون بەدوایدا بگەڕێیت یان بواری بینینی ئەو کاتە زیاترێکە کە لە ناوجەرگەی شاردا دابینشیت و چاوەڕوانی ئەو کەسە بکەیت خۆی دەربکەوێت؟
جۆرج، بەرلەوەی وەلامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە، دوو کەڕەت بیخوێنەرەوە. من خۆم لەلای خۆمەوە گەیشتمە ئەم ئەنجامە؛ نایابترین گەڕەکی ئیشبیلیا 'سانتا کروز'ە و گۆڕەپانی 'ئەلیانزا'ش جوانترین گۆڕەپانی شارەکەیە. ئەگەر کچەی پرتەقاڵ کەمێک لە من بچێت، ئەوا درەنگ یان زوو ڕێک لەم ناوەدا دەردەکەوێت کە من تێیدا دانیشتووم. ئێمە لەوەوبەر لە قاوەخانەیەکی ئۆسلۆدا یەکتریمان بینی. دواتریش لە کڵێسەیەکدا چاومان بەیەک کەوتەوە. کەواتە ئەگەر من و کچەی پرتەقاڵ لایەنێکی بەهێزمان هەبێت، ئەوا دەبێت ئەوە بێت کە بە ڕێکەوت یەکتر ببینین.
بڕیارمدا لە شوێنی خۆمدا بمێنمەوە. کاتژمێر سێی پاشنیوەڕۆبوو، لەبەرئەوە دەمتوانی بەلایەنی کەمەوە هەشت سەعاتێک بمێنمەوە، من ئەو ماوەیەم بەلاوە زۆر نەبوو. بەرلەوەی لە ئۆسلۆوە سەفەربکەم

ژوورێکم لە ئوتێلێکی بچکۆلەی ئەو ناوەدا گرتبوو. لە ئوتێلەکە پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێت پێش کاتژمێری دوانزەی شەو لە ئوتێلەکەدا بم، چونکە لەوەبەدواوە دەرگاکەی دادەخەن (تەنانەت ئوتێلەکانی ئیسپانیاش ئەو جۆرە یاسایانەیان هەیە و ناچارین پەیڕەویان بکەین!). لەدڵی خۆمدا وتم 'ئەگەر کچەی پرتەقاڵ هەتا کاتژمێر دەی بوێت بۆ دوانزە دەرنەکەوێت، ئەوا بۆ سبەینێ هەر لە هەمان گۆڕەپاندا بەدرێژایی ڕۆژەکە چاوەڕوانی دەکەم، بۆ بەیانی دەتوانم هەر لەگەڵ خۆر هەڵهاتندا هەتا ئەو کاتەی خۆر ئاوادەبێت چاوەڕوانی بکەم.

هەر چاوەڕوانمکرد و هەر چاوەڕوانمکرد. دانیشتبووم تەماشای ئەو خەڵکانەم دەکرد کە دەهاتنە ناو گۆڕەپانی 'ئەلیانزا'وە و دەڕۆیشتنە دەرەوە، سەیری خەڵکی شارەکە و گەشتیارانم دەکرد. جیهانم وەک شوێنێکی جوان دەبینی. دیسانەوە لەوێشدا لەڕادەبەدەر دڵم خۆشبوو و شاگەشکەبووم، دڵم بە هەموو شتێکی چواردەورەکەم دەکرایەوە. ئاخۆ ئێمە کێ بین کە لێرەدا دەژین؟ هەموو تاکە مرۆڤێکی ئەو گۆڕەپانە وەک سندوقێکی پڕگەوهەری زیندوو دەهاتە بەرچاوم، کە لێوانلێوبوو لە ئەندێشە و یادوەری، پڕبوو لە خەون و تاسە. من خۆم هەستمدەکرد لەسەر ئەم زەویە لەناو دڵی ژیانی خۆمدام، بێگومان بەلای هەموو خەڵکانی تری گۆڕەپانەکەشەوە هەر هەمان شت بوو. هەر بۆ نمونە بۆیەکە، ئەو کوڕە ئیشەکەی ئەوەبوو کە خواردن و خواردنەوە بۆ ئەو کەسانە بهێنێت کە ڕوو لە قاوەخانەکە دەکەن. لەگەڵ داواکردنی قاوەی چوارەمدا، هەستمکرد خەریکە لێم بێزاردەبێت، چونکە ماوەیەکی دوورودرێژبوو مێزەکەم گرتبوو_سێ چوار سەعاتێک دەبوو لەوێدا دانیشتبووم. بەهەرحاڵ هەرکە پاش نیو سەعاتێک ئەو قاوەیەشم خواردەوە، خێرا هاتە بەردەمم و

بەئەدەبەوە وتی "دەتانەوێت پارەی قاوەکان بدەن؟"، بەڵام من نەمدەتوانی ئەوێ بەجێبهێڵم، چونکە چاوەڕوانی کچەی پرتەقاڵ بووم، لەبەرئەوە پێم جوانبوو داوای قاپێک 'تاپاس' و کۆلایەک بکەم. خۆم بەخۆمم وت 'هەتا کچەی پرتەقاڵ نەیەت بیرە و شەراب داواناکەم'. وامدانابوو پێکەوە شەمپانیا بخۆینەوە. بەڵام کچەی پرتەقاڵ هەر دەرنەکەوت. کاتژمێر بوو بە حەوت و ئیدی هەستمکرد دەبێت پارەی مێزەکەم بدەم. لەپڕێکدا بۆمدەرکەوت کە چەندە کەسێکی ساویلکەم؛ ئەو نامەیەی کە ئەو لە ئیشبیلیاوە ناردبووی، چەند ڕۆژێک لەوەوبەر لەڕێگەی سندوقی پۆستەکەی "هوملەفای"ەوە گەیشتە دەستم، ئێ خۆ هەر هیچ نەبێت ئەوەندە ڕۆژیشی پێچووە تا گەیشتۆتە ئەوێ..

دیسانەوە لەوەدەچوو کە کچەی پرتەقاڵ هەروەک پێشوو کەسێکی دورەدەست بێت، بێگومان خەریکی شتی ترە و تاقەتی یاری مشک و پشیلەی نیە لەگەڵمدا. ڕەنگە لە شاری 'سالامانسا' یان لە 'مەدرید'دا زمانی ئیسپانی بخوێنێت. پارەی مێزەکەم دا و خۆم ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن. شێوەی کورتبینی هەڵسەنگاندنەکەم نائومێدی کردم، قوڕگم پڕبوو و بڕیارمدا بۆ ڕۆژی دواتر بەرەو نەرویج بکەومەوە ڕێ.

تۆ هەرگیز ڕۆژێک لەڕۆژان هەستت بەوە کردووە کە شتێکی بێ هودەت کردبێت؟ ڕەنگە لە ڕۆژێکی تووش و بەفردا لەماڵەوە هاتبیتە دەرەوە و بەرەوشار کەوتبیتە ڕێ بۆ کڕینی شتێک کە زۆر پێویستت پێبووە، بەڵام ئەو کاتەی کە دەگەیتە لای دوکانەکە دەبینیت دوو دەقە لەوەوپێش داخراوە. ئەو حاڵەتانە زۆر ناخۆشە، زیاتریش خەفەت بە بێئەقڵی خۆمان دەخۆین. بەو شێوەیە تاڕادەیەک هەستم بەشەرمدەکرد کە سەفەرێکی ئاوها بێهودەم کردبوو. چ سەفەرێکیش، خۆ من هەر هێندە سواری ترامەکە نەبووم کە بچمە ناوشار، بەڵکو تا

ئیشبیلیا ڕۆیشتبووم و جگە لە پۆستکارتێکیش هیچ شتێکی ترم بەدەستەوە نەبوو. کەسم نەدەناسی و پاش ماوەیەکیش دەبوایە بڕۆیشتمایەتە ئوتێلێکی قۆڕەوە و بخەوم، زمانی ئیسپانیشم نەدەزانی. حەزمدەکرد بەهەموو هێزم یەک زللەی قایم لەخۆم بدەم، هەرچەندە ئەو کاتە لەبەر بێئەقڵی خۆم هێندەی تر شەرمم دەکرد. بەڵام پەیمانم بەخۆمدا کە بەشێوەیەکی تر سزای خۆم بدەم، چەندەها شێوەی سزادانی خۆمم لەبەردەستابوو. هەر بۆ نمونە دەمتوانی دەست لە کچەی پرتەقاڵ هەڵبگرم و چیتر بەهیچ شێوەیەک بیری لێنەکەمەوە، چیش دەبوو با ببوایە.
بەڵام جۆرج کەمێک دواتر دەرکەوت! کاتژمێری حەوت و نیو لەپڕێکدا هاتە ناو گۆڕەپانی 'ئەلیانزا'وە!

چوار سەعات و نیو بوو لەژێر سێبەری دار پرتەقاڵێکدا دانیشتبووم و ئەوجا کچەی پرتەقاڵ بەلارولەنجە هاتە ناو گۆڕەپانی پرتەقاڵەوە. بێگومان قەمسەڵە کڵاودارەکەی لەبەردانەبوو، چونکە ئاووهەوای ئەندەلوس هەمیشە خۆشە. ماکسیەکی هاوینەی ئەفسوناوی لەبەردابوو، ڕەنگە سورەکەی هەروەک ڕەنگی ئەو گوڵە سورە دەدرەوشایەوە کە لەدورەوە دەمدی بە دیوارە بەرزەکەی پشتەوەدا هەڵزنابوو. لەدڵی خۆمدا وتم لەوانەیە ماکسیەکەی لە "گوڵە تۆرنە"[1] قەرزکردبێت، یان ڕەنگە لە پەرییەکی دزیبێ، کێ ئەزانێت؟
ئەو منی نەبینی، تاریکی ئێوارە باڵی بەسەر گۆڕەپانەکەدا کێشابوو. زۆر زۆر گەرمیش بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا من هەڵدەلەرزیم، ئارەقێکی سارد بە پشتمدا دەهاتە خوارەوە.

---

[1] "گوڵە تۆرنە" کەسایەتی سەرەکی یەکێک لە حەکایەتەکانی برایانی گریمس'ە، لە حەکایەتەکەیدا بۆ ماوەی سەد ساڵ دەخەوێت.و

ئا بەو شێوەیە بوو جۆرج _دەمەوێت هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە_ هێندەی نەبرد و زانیم پیاوێکی گەنجی لەگەڵدایە، بە مەزەنەم تەمەنی هەر بیست و پێنج ساڵێک دەبوو. پیاوێکی باڵا بەرزبوو و ڕیشێکی چڕی کاڵی هێشتبووەوە. بەبڕوای من هەر لە پیاوێک دەچوو کە شەیدای سەفەری جەمسەرەکانی زەوی بێت. بەڵام ئەو شتەی لە هەموو شتێکی تر زیاترێک پەستی کردم ئەوەبوو کە تارادەیەک وەک کەسێکی بەسۆز دەهاتە بەرچاوم.

کەواتە دۆڕاندم، بەڵام خەتاکە خەتای خۆم بوو. چونکە پەیڕەوی یاساکانم نەکرد. من پەیمانێکی گرنگ و ڕەسمیم شکاند. چووبوومە ناو شتێکەوە کە هی من نەبوو، ڕۆیشتبوومە ناو حەکایەتێکەوە کە یاساکانی لەگەڵ مندا نەدەهاتەوە. ئەو کاتی خۆی پێی وتم "*دەبێت بۆ ماوەی شەش مانگ چاوەڕوانم بکەیت. ئەگەر دەتوانێت هێندە دان بەخۆتدا بگریت، ئەوا دەتوانین یەکتر ببینینەوە*".

بەرلەوەی کوڕی پاشا بێت و سەندرێلا ڕزگارکات لەدەستی باوەژنەکەی و زڕخوشکە بەدەکانی، سەندرێلا خەریکی پاککردنەوەی فرنێک بوو و خۆڵەمێشەکەی دەردەهێنا.. لەو کاتەدا کە چاویان پێمکەوت، هەستمدەکرد دەموچاوم لەو فرنەدەچێت. من وتم کە *چاویان* پێمکەوت، نەک کە چاوی پێمکەوت، چونکە لەڕاستیدا یەکەم جار کچەی پرتەقاڵ نەیبینیم. پیاوە ڕیشنەکە یەکەم جار سەرنجی چووە سەرم (تۆ هیچ شتێک تێدەگەیت جۆرج؟ من خۆم لە هیچ تێنەدەگەیشتم). پیاوەکە قۆڵی کچەی پرتەقاڵی گرت و ئامارژەی بۆ من کرد، ئینجا بەدەنگێکی ڕوون و بەرز وتی "یان ئۆلاو!"، هێندە بەرز وتی هەموو گۆڕەپانەکە گوێیان لێبوو. هەر بەشێوەی گوتنەکەیدا یەکسەر زانیم کە دانیمارکیە. من قەت لەوەوپێش ئەوم نەدیبوو.

هەموو ئەو ڕووداوەی دواتر تەنها ساتێکی کەمی خایاند، بەڵام پێم خۆشدەبێت گەر ئەو دیمەنە بهێنیتە بەرچاوت. کچەی پرتەقاڵ لەژێر دار پرتەقاڵەکەدا دەمبینێت. لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا و لەلای نافورە گەورەکەوە بۆ ماوەی یەک دوو چرکە لە شوێنی خۆیدا چەقیوە و چاوم تێدەبڕێت. بەڵام هەر لەپاش یەکەمین چرکەوە بەشێوەیەک وشک بووە دەڵێیت یەک دوو سەعاتێکە بەو شێوەیە وەستاوە و ناتوانێت بجوڵێتەوە. ئەوجا دواتر خۆی بەردەدات. 'گوڵە تۆرنە' سەد ساڵە خەوتووە، بەڵام وا دیسانەوە خەبەری دەبێتەوە و دێتەوە ناو ژیان، وەک ئەوەی نیو چرکەیەک بێت خەوتبێت. بەرەوڕووم ڕادەکات و ڕیک هەروەک پیاوە دانیمارکیەکە دەڵێت "یان ئۆلاو!".
ئینجا نۆبەی پیاوە دانیمارکیەکەیە، جۆرج. هەروا بە بێهوودەیی بەرەو ڕوم دێت و دەستێکی بەهێزم بۆ تەوقەکردن لێدەهێنێتە پێشەوە و بە ئەدەبەوە دەڵێت؛ "خۆشە ئاوها بەڕاستی بتبینم 'یان ئۆلاو'!". بەر لەو کاتە کچەی پرتەقاڵ لەسەر کورسیەکی سەر مێزەکە دانیشتبوو، ئیدی پیاوە دانیمارکیەکە دەستە گەورەکەی دەخاتە سەرشانی کچەی پرتەقاڵ و دەڵێت؛ "کەواتە دەبێت من بڕۆم". هەر پاش ئەو قسەیەی ڕێک بەرەودواوە هەنگاودەنێت، خۆی دەکێشێتە دواوە، پشتمان تێدەکات و ڕێک ملی ئەو ڕێگایەی ناو گۆڕەپانەکە دەگرێتەبەر کە لێوەی هات. ئیدی ون دەبێت. ڕزگارمانبوو لێی. فریشتە باشەکان ئاگایان لێمە.

بەرامبەرم دانیشتووە. هەردوو دەستی خستۆتە ناو دەستمەوە. زۆر بەگەرمی خەندەم بۆ دەکات، کەمێک تورە دیارە، بەڵام بەگەرمی خەندەم بۆ دەکات.
دواتر وتی؛ "نەت بردە سەر.. نەتتوانی چاوەڕوانم بکەیت!"

ناچاربووم دان بەڕاستیەکەدا بنێم و وتم؛ "نەء، چونکە ئێستاکە دڵم قەهری لێدەبارێت"

تەماشایەکم کرد و بینیم هێشتا هەر خەندەی لەسەر لێوبوو، منیش هەوڵمدا خەندەیەکی بۆ بخەمە سەر لێوم، بەڵام نەمتوانی. ئەوجا وتم؛ "کەواتە گرەوەکەم دۆڕاند".

بیرێکی کردەوە و دواتر وتی؛ "بەڵام هەندێ جاری کەم لە ژیاندا دەبێت هێندە فێربین کە کەمێک تاسە بکەین. خۆ من نامەم بۆ نوسیت. من هەوڵمدا هێزت بدەمێ کە بتوانیت کەمێکی تر تاسەم بکەیت".

موچوڕکەیەک بەشانمدا هات و دیسانەوە وتمەوە؛ "کەواتە دۆڕاندم".

خەندەیەکی گوماناوی خستیە سەرلێوی و وتی؛ "بەلایەنی کەمەوە گوێ ڕایەڵ نەبوویت، بەڵام ڕەنگە هێشتا بتوانین شتێکی ڕزگاربکەین".

"چۆن؟".

"هێشتا هەروەک پێشووە، کەوتۆتە سەرئەوەی تۆ چەندە سەبرت هەیە".

لەوێدا وتم؛ "لە هیچ شتێک تێناگەم".

دەستی گوشیم و هەر زۆر بەئاسانی بەچرپەیەک وتی؛ "لە چی تێناگەیت 'یان ئۆلاو؟"

منیش لەوەڵامدا وتم؛ "لە یاساکان، من لە یاساکان تێناگەم".

لەوەبەدواوە ئیدی کەوتینە گفتوگۆیەکی دورودرێژەوە.

جۆرج! بەپێویستی نازانم هەموو ئەو وشانەت بۆ بگێڕمەوە کە لەو ئێوارەیە و لەو شەوەدا بەیەکمان وت. بەڕاست.. خۆ هەر هەمووشیم

بیر ناکەوێتەوە. جگە لەوەش دەزانم ئێستاکە کۆمەڵێک پرسیارت لادروستبووە و دەتەوێت بە زوترین کات وەڵامەکانیت دەستکەوێت.
من خۆم بەرلە هەموو شتێک دەمویست بزانم کچەی پرتەقاڵ لە کوێوە ناوی من دەزانێت، لەکوێوە ناونیشانی دایک و باوکمی دەزانی. چونکە پەیوەندی هەبوو بەو پۆستکارتەوەی کە لە ئیشبیلیاوە ناردبووی، لەڕاستیدا ئەوەش دواهەمین شتبوو کە ڕویدا.
بەچاوێکی پڕلەپرسیارەوە دانیشتبووم و تاماشامدەکرد، پاش نەختێک بە نەرمیەکەوە وتی؛ 'یان ئۆلاو'.. تۆ بەڕاستی منت بیرناکەوێتەوە؟
لێی وردبوومەوە، هەوڵمدا بەشێوەیەک تەماشاییکەم وەک ئەوەی یەکەم جارم بێت کە بیبینم. هەر تەماشای چاوە تۆخەکانیم نەکرد، بەوەشەوە نەوەستام کە دەموچاوە مەکراویەکەی بخوێنمەوە، بەڵکو چاوم خزانە سەر شانە ڕووتەکانی و ئەویش بەلایەوە ئاسایی بوو، ئەوجا سەیرێکی ماکسیە تەنکەکەیم کرد. بەڵام ئاسان نەبوو جگە لەو چەند جارە کەمەی کە بەر لە جەژن یەکتریمان بینی، هیچ یادوەریەکی تری ئەو بهێنمەوە یادم. ئاخر تەنانەت ئەگەر لەوەوپێشیش بینیبێتم، لەو کاتەدا مەحاڵبوو بیرم بکەوێتەوە، چونکە لەوێدا جوانیە بێوێنەکەی نەیدەهێشت بیر لە هیچ شتێکی تر بکەمەوە. لەدڵی خۆمدا وتم 'خودا ئەمەی خوڵقاندووە، یان ڕەنگە 'پیگمالیۆن' خوڵقاندبێتی، کە لە ئەفسانەیەکی یۆنانیدا بەدڵێ خۆی پەیکەری ئافرەتێک لە مەرمەڕ دادەتاشێت و دواتر خوازنی خۆشەویستی بەزەیی پێدا دێتەوە و پەیکەرەکەی بۆ دەکاتە ئافرەتێکی ڕاستەقینە'. دواجار کە کچەی پرتەقاڵم بینی پاڵتۆیەکی ڕەشی زستانەی لەبەردابوو، بەڵام لەوێدا جلەکانی هێندە تەنکبوون، شەرمم دەکرد سەیری بکەم. تا ئەندازەیەک هەستمدەکرد زۆر

نزیکبوومەتەوە لێی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی بیناسمەوە، یان لەوانەیە ڕێک لەبەرئەو هۆیە بووبێت کە نەمناسیەوە.
دیسانەوە وتیەوە؛ "منت لەیاد نیە؟ زۆر حەزدەکەم منت بیربکەوێتەوە"
داوای یارمەتیم لێکرد و وتم؛ "دەتوانیت شتێکم بیربخەیتەوە؟
لەوەڵامدا وتی؛ 'هوملەفای' بێئەقڵ!
هوملەفای.. من لە هوملەفایدا گەورەبووم، هەر لەوێشدا لەدایک بووم. بەدرێژایی ژیانم لەوێدا ژیاوم. هەمووی شەش مانگێک بوو گواستبوومەوە بۆ 'ئادەمستوون'.
ئەوجا وتی؛ "یان 'ئیریسفای"
ئەوەش هەر هەمان گەڕەک بوو، ئیریسفای سەرەتای گەڕەکی هوملەفای بوو.
"ئەی کلیوڤەفای!"
ئەویش هەر لەو نزیکانەوە بوو. ئەو کاتەی منداڵبووم زوو زوو لە پانتاییە گەورەکەی نێوان ڤێللاکانی 'کلیوڤەفای'دا یاریم دەکرد. گردێکی گەورەی لێبوو و درەخت و دەوەنی لێڕوابوو. وابزانم جۆلانەیەک و کەمێک لمی لێبوو کە یاریمان تێدا دەکرد. چەند ساڵێک لەمەوبەر چەند کورسیەکیشیان لەوێدا دانا.
دیسانەوە تەماشایەکی کچەی پرتەقاڵم کردەوە. موچوڕکەیەک بە سەرتاپای لەشمدا هات، هەر دەتوت لەدوای خەوێکی ماگناتیسی قوڵ خەبەرم بۆتەوە. هەردوو دەستیم بە توندی گوشی. قوڕگم پڕبوو لە گریان و بەدەنگی بەرز وتم "فیرۆنیکا!"
خەندەیەکی گەورەی خستە سەرلێوانی، بەڵام وابزانم ئەویش فرمێسکێک هاتە ناو چاویەوە و سڕی.

دانیشتبووم و هەر تەماشای چاوانیم دەکرد، لەوە بەدواوە چیتر چاوم نەدەتروکاند. هیچ شتێک نەبوو ڕێگەم بگرێت، هەموو شەرم و شکۆیەکەم وەلاوەنا. لەناکاودا دەموێرا لەبەردەمیدا خۆم ڕووتبکەمەوە. لەپڕێکدا دەموێرا بەبێ هیچ خۆبەستنەوەیەک خۆمبدەمە دەستی کچەی پرتەقاڵ. هەستم دەکرد سەرشانم بەیەکجارەکی سوکبووە.
پێموانیە هیچ شێوە ئولفەتێکی تر هەبێت کە کێبەرکێ لەگەڵ نیگای دوو چاودا بکات، کە بەقوڵی و سۆزەوە تەماشای یەکتریدەکەن و نکوڵێ لەوە دەکەن یەکتر بەجێبهێڵن.

ماڵی ئەو کچە چاو قاوەییە لە 'ئێریسفای'بوو. هەرلەو کاتەوەی کە پێمان گرت، یان وردتریێک بیڵێم لەو کاتەوەی کە فێری قسەکردنبووین، نزیکەی هەموو ڕۆژێک یەکتریمان دەدی و پێکەوەبووین. پۆلی یەکەمی سەرەتاییشمان هەر بەیەکەوە دەستپێکرد، بەڵام دوابەدوای جەژنی لەدایکبوونی مەسیحی ئەو ساڵە 'فیرۆنیکا' و دایک و باوکی شارەکەیان بەجێهێشت و ماڵیان گواستەوە. ئەو کاتە تەمەنمان حەوت ساڵانبوو. هەمووی دوانزە سیانزە ساڵێک لەمەوبەربوو، بەڵام لەو کاتەوە یەکتریمان نەدیبووەوە.
ئێمە هەمیشە لەنێوان گوڵ و پەرژین و درەختەکانی سەر گردەکەی کلیوقەفای پێکەوە یاریمان دەکرد. هەر لەوێدا وەک دوو سمۆرە پێکەوە دەمانگوزەراند و دەژیاین _بەڵێ، بەڕاستی وەک ژیانێکی تەواوی دوو سمۆرە دەژیاین. بەڵام تەنانەت ئەگەر ماڵیشیان نەگواستایەتەوە، ئەوا ئەو سەردەمی منداڵیە بێگەردەم لەگەڵ فیرۆنیکادا هەر کۆتایی پێدەهات، چونکە لە حەوشەی قوتانخانەدا

زوو زوو گلەییان لێدەکردم و دەیانوت 'تۆ زیاترێک پێت خۆشە لەگەڵ کچاندا یاری بکەیت'.
ئا ئێستاکە گۆرانیەکم بیرکەوتەوە کە لەماڵەوە فێربووبووین، ئێمە هەمیشە لەکاتی وازیکردندا ئەو گۆرانیەمان دەوتەوە؛ "هیچ کوڕە بچکۆلەیەک دەیەوێت لەگەڵ کچە منداڵێکدا یارییکات؟ هەتا ئەو کاتەی ڕۆژەکە تەواودەبێت بۆ خۆمان یاریدەکەین، لە وڵاتی خەونی خۆماندا گەمەدەکەین".
کەمێک دواتر وتی؛ "بەڵام تۆ نەتناسیمەوە"، هەر بەدەنگیدا زانیم کە هێشتا دڵی ڕەنجاوە و کەمێک توڕەشە. لەپڕێکدا هەستمکرد کچێکی حەوت ساڵان قسەم لەگەڵدا دەکات نەک کچێکی گەورەی بیست ساڵان.
ناچاربووم سەرلەنوێ سەیرێکی بکەمەوە. هەتا بڵێیت ماکسیە سورەکەی لەبەرچاومدا جوانبوو و هەستی دەبزواندم. هەر بە ماکسیەکەیدا دەمبینی لەشی چۆن هەناسەدەدات، چونکە ماکسیەکەی بەرزدەبووەوە و دەنیشتەوە، بەرزدەبووەوە و دەنیشتەوە و هەروەک شەپۆلی دەریایەک دەهاتە بەرچاوم کە خۆی دەکێشا بە قەراخ ئاوێکی ڕۆمانسی ئاسادا.. قەراخ ئاوەکە هەربە ماکسیەکەی ئەو دەچوو.
سەرم هەڵبڕی و سەیرێکی ئاسمانم کرد، پەپولەیەکی زەردم لە نێوان گەڵاکانی دار پرتەقاڵێکدا بینی. ئەو ڕۆژە ئەوە یەکەمین پەپولە نەبوو کە بیبینم، بەڵکو چەندەهام بینی.
ئاماژەم بۆ پەپولەکە کرد و وتم؛ "چۆن بتوانم کرمۆڵەیەک بناسمەوە کە چەندەها ساڵە بووە بە پەپولە؟"
زۆر بەتوندی وتی؛ "یان ئۆلاو!" لەوە بەدواوە هیچی تر دەربارەی گۆڕانی ئەو لە سەردەمی منداڵیەوە بۆ کچێکی گەورە باسنەکرا.

من هێشتا چەندەها پرسیاری بێ وەڵامم لەلا مابووەوە. بینینی کچەی پرتەقاڵ خەریکبوو شێتی دەکردم، بەلایەنی کەمەوە هەموو ژیانمی هەڵگێڕایەوە. ڕاستەوخۆ چوومە ناو بابەتەکەوە و وتم؛ "ئێمە لە ئۆسلۆ یەکتریمان بینی. سێ کەڕەت چاومان بەیەکتری کەوت و لەو کاتەوە جگە لەتۆ تاڕادەیەک بیرم لەهیچ شتیکی تر نەکردۆتەوە. بەڵام دواتر هەروا بەئاسانی دیارنەمایت و ونبوویت. بەلامەوە ئاسانتربوو پەپولەیەک بەدەست بگرم وەک لەوەی تۆ بهێڵمەوە. بەڵام تێناگەم بۆچی وتت دەبێت شەش مانگ تێپەڕێت و ئەوجا یەکتر ببینینەوە؟"
بێگومان بەهۆی ئەوەوەبوو کە ناچاربوو سەفەرێکی ئیشبیلیا بکات. هەر هیچ نەبێت ئەوەندە تێدەگەیشتم. بەڵام بۆچی هێندەی بەلاوە گرنگبوو کە شەش مانگ لە ئیسپانیادا بمێنێتەوە؟ لەدڵی خۆمدا دەموت بڵێیت بەهۆی ئەو کوڕە دانیمارکیەوە بووبێت؟
گومانم نیە کە تۆ بتوانیت مەزەنەی وەڵامەکەی بکەیت، جۆرج. من ئەو کاتە نەمدەتوانی، بەڵام تۆ بەچاوی خۆت بینیوتە فیرۆنیکا سەرقاڵی چیە. لەو کاتەوەی کە دەستم بە نوسینی ئەم نامەیەکردووە، بەردەوام پرسیارێک بە مێشکمدا دێت و دەچێت، خۆم بەخۆم دەڵێم 'بڵێیت ئێستاکەش تابلۆ گەورەکەی کە دار پرتەقاڵەکانی تێدایە هەر لە ژوری دانیشتنەکەدا هەڵواسرابێت؟ ئەو خۆی زوو زوو دەڵێت 'ئەو جۆرە تابلۆیانەم تێپەڕاندووە _مەبەستم لەم کاتەیە کە ئەم شتانەت بۆ دەنوسم_ بەڵام لەبەرخاتری تۆ هیوادارم نە دابێتی بە هیچ کەسێک و نە خستبێتیشیە ئەمبارەکەوە. ئەگەر ئێستاکە لەوێدا دایناوە، ئەوا بەبڕوای من هەقە داوای ئەو تابلۆیەی لێبکەیت.

لەوەڵامدا وتی؛ "لێرە لەقوتابخانەیەکی هونەری یان وردترێک بیڵێم لە قوتابخانەیەکی وێنەکێشان وەرگیراوم. ئەو خولە بەلای منەوە زۆر گرنگە، لەبەرئەوە سورم لەسەر ئەوەی تەواوی بکەم"
منیش سەرمسوڕما و وتم؛ "قوتابخانەی وێنەکێشان! ئەی بۆچی ئێوارەی جەژن هیچ شتێکت لەو بارەیەوە باس نەکرد؟"
یەکسەر وەڵامی نەدامەوە، لەبەرئەوە بەردەوامیم بە قسەکانم دا و وتم؛ "بیرت دێ چۆن بەفرێک دەباری؟ لەیادتە چۆن دەستم بە قژتا دەهێنا؟ بیرتە لە پڕێکدا کە تەکسیەکە هات زەنگەکان زرنگەیان لێبەرزبووەوە؟ ئیدی تۆ ڕۆیشتیت!"
لەوەڵامدا وتی؛ "هەموویم لەبیرە. هەروەک فیلمێک دێتەوە پێش چاوم. وەک دیمەنی یەکەمی فیلمێکی... زۆر زۆر ڕۆمانسی دێتەوە یادم"
وەک ئەوەی ناڕەزایی دەرببڕم وتم؛ "بەڵام بۆ ناچاربوویت ئاوا پڕبیت لە ڕاز و نهێنی، من لەوە تێناگەم "
دەموچاوی گۆڕاو بەجدیەوە سەیریکردم و وتی؛ "وابزانم هەر لەو کاتەوەی کە لە ترامەکەدا بینیمیت، سەرنجت ڕاکێشام و چاوێکم لەسەر دانایت. یان دەتوانین بڵێین دیسانەوە سەرنجت ڕاکێشامەوە، بەڵام بەشێوەیەکی جیاوازتر لە کەڕەتەکانی پێشوو. دواتریش چەند جارێکی تر یەکترمان بینیەوە. بەڵام من وای بۆچووم کە بتوانین هێندە بەرگە بگرین کە بۆ ماوەی شەش مانگێک لە یەکتریەوە دوربین. لەدڵی خۆمدا وتم ڕەنگە پێویستیمان بەو جیابوونەوەیە بێت. ئێمە لە سەردەمی منداڵیماندا زۆر لەیەکەوە نزیکبووین، بەڵام چیتر خۆ منداڵ نین. من پێم وابوو کەمێک پێویستیمان بە تاسەکردنی یەکتری هەبێت، بۆ ئەوەی هەروەک جاران یەکسەر دەستنەکەینەوە بەیاریکردن لەگەڵ یەکتریدا، مەبەستم لەوەبوو کە هەروەک خووی

یاریکردنی سەردەمی منداڵی دیسانەوە تێکەڵ نەبینەوە. من ویستم سەرلەنوێ بمدۆزیتەوە. ویستم هەروەک چۆن من تۆم ناسیەوە، تۆش بەهەمان شێوە بمناسیتەوە. هەر لەبەرئەوەش بوو کە خۆمم پێنەناساندیت".

ڕاست و دروست لەیادم نیە بە چ شێوەیەک وەڵامم دایەوە، هەموو ئەو وشانەشم لەبیر نیە کە کچەی پرتەقاڵ هەڵیرشتن. بەڵام هێدی هێدی کە لەباسەکەماندا قوڵبووینەوە، زوو زوو لە بابەتێکەوە دەچووینە سەر بابەتێکی تر، لە بەسەرهاتێکەوە دەڕۆیشتینە سەر بەسەرهاتێکی تر.

تا دوایی لەکاتێکی گونجاودا پرسیارێکم لێکرد و وتم؛ "ئەی کوڕە دانیمارکیەکە؟" هەستمدەکرد کە سواڵی شتێکی لێدەکەم، بێئەقڵیمکرد. قێزم لەخۆم دەکردەوە.

سارد هاتە بەرچاوم و بەسوکە توڕەبوونێکەوە وتی؛ "ناوی 'مۆگنس'ە، ئەویش لەهەمان ئەو قوتابخانەی وێنەکێشانەیە کە منی لێوەرگیراوم. کوڕێکی باشە. من پێمخۆشە کەسێکی وڵاتانی ئەسکەندەنافیم لەگەڵدایە".

سەرم گێژی دەخوار و وتم؛ "بەڵام لە کوێوە ناوی من دەزانێت؟"

بۆم پرسیاربوو کە لەوێدا دەموچاوی سورنەبووەوە، بەڵام هۆکەشیم نەزانی. هەروا بەئاسانی بەبۆنەی کراسە سورەکەیەوە نەمدەتوانی بیبینم، جگە لەوەش خەریکبوو دونیا بەتەواوەتی تاریک دەبوو. یەک دوو گڵۆپی سەر شەقامەکە ڕوناکیەکی زەردباویان بەسەر گۆڕەپانە چۆڵەکەدا پەخشدەکردەوە. کەمێک لەوەوبەر بتڵێک شەرابی 'ڕیبیرا دیل دیورۆ'مان داواکردبوو و هەریەکەمان بە پەرداخێک شەرابی دەستمانەوە دانیشتبووین.

لەویدا وتی؛ "پورتریتیکی تۆم کێشاوە، هەڵبەتە هەر بەخەیاڵ وێنام کردوویت، بەڵام لە تۆ دەچێت. 'مۆگنس' بەلایەوە جوانە. ماوەیەکی تر تۆش دەیبینیت. هەر زۆر بەئاسانی ناوی پۆرتریتەکەم ناوە 'یان ئۆلاو".

کەواتە بۆم دەرکەوت کە فیرۆنیکا خۆی وێنەی خۆی لەسەر پۆستکارتەکە کێشابوو، لەبەرئەوە پێویستی نەکرد لەو بارەیەوە پرسیاری لێبکەم. بەڵام شتیکی تر هەر بە خەیاڵمدا دەهات و دەچوو، لەبەرئەوە وتم؛ "کەواتە ئەو پیاوەی ناو تیۆتا سپییەکە مۆگنس نەبوو؟"

پێم پێکەنی. واهاتە بەرچاوم کە بیەوێت بابەتەکە بگۆڕێت، وتی؛ "ڕەمبێکم بڕوام پێنەکەیت گەر بڵێم ئەو ڕۆژە تۆم لە بازاڕی 'یۆنگستۆرگت'دا نەبینی؟ بەڵام من لەبەر خاتری تۆ هاتمە ئەویێ".

من لە قسەکەی تێنەگەیشتم، هەستمدەکرد زۆر بە نهێنیەوە قسەدەکات. بەڵام ئەو بەردەوامی دا بە قسەکانی و وتی؛ "یەکەم کەڕەت لە ترامەکەی فرۆگنەردا یەکترمان بینی. دواتر کەمێک بە شاردا خولامەوە و ئەو قاوەخانەیەم دۆزیەوە کە تۆ زوو زوو سەردانیت دەکرد. من قەت لەوەوپێش نەچووبومە ئەو قاوەخانەیەوە، بەڵام ڕۆژێکیان پاش ئەوەی کتێبێکی وێنەی تابلۆکانی 'ڤیلازکیس'ی وێنەکێشی ئیسپانیم کڕی، خۆم کرد بەویدا. بۆ خۆم دانیشتبووم و پەڕەکانیم هەڵدەدایەوە.. چاوەڕوانبووم"

"چاوەڕوانی منت دەکرد؟"

یەکسەر زانیم کە پرسیارێکی زۆر نابەجێم کرد. هەستمکرد بە پەستیەکەوە وەڵامی دامەوە و وتی؛ "تۆ لەو بڕوایەدایت بەس تۆ بەدوای خەڵکدا بگەڕێیت؟ منیش بەشێکی ئەم چیرۆکەم. بێگومان من تەنها پەپولەیەک نیم کە تۆ هەوڵی گرتنی بدەیت".

نەمویرا چیتر لەو بابەتانەدا قوڵببمەوە، لەو کاتەدا ترسناک هاتە بەرچاوم، هەر بۆیە زۆر بەئاسانی وتم؛ "بەڵام لە بازاڕی 'یۆنگستۆرگت'دا؟"

"یان ئۆلاو، هێندە منداڵ خۆت مەنوێنە. خۆ من بۆم باسکردیت. لەدڵی خۆمدا دەموت کوا یان ئۆلاو؟ ئەگەر بەڕاستی مەبەستی بێت بمدۆزێتەوە، کەواتە دەبێت لە چ شوێنێکدا بەدوامدا بگەڕێت، بەتایبەتیش کە دوو کەڕەت بە زەرفێکی گەورەی پرتەقاڵەوە بینیمی؟ دڵنیا نەبووم، بەڵام وای بۆچووم کە لە بازاڕە گەورەکانی میوەی شاردا بەدوامدا بگەڕێیت. من چەندەها جار چوومە ئەوێ بۆ ئەوەی بتبینم. بەڵام لە شوێنی تریشدا بەدواتا گەڕام. چوومە کلیوقەفای و هوملەفای. ڕۆژێکیان چوومەماڵتان و چاک و چۆنیم لە دایک و باوکت کرد، هەر ڕێک لەو کاتەدا کە دەرگایان لێکردمەوە پەشیمان بوومەوە، بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو. کەمێکم دەربارەی سەردەمی منداڵی و شوێنە کۆنەکان بۆ باسکردن. حەزدەکەم هێندەش بزانیت کە پێویستی نەکرد ناوی خۆمیان پێبڵێم، چونکە یەکسەر منیان ناسیەوە. بانگیان کردمە ژوورەوە، بەڵام وتم بەداخەوە کاتەکەم نالەبارە. ئەوەندەشم پێ وتن کە لە قوتابخانەیەکی وێنە کێشان وەرگیراوم".

نەمدەزانی باوەڕی پێبکەم یان نا، لەبەرئەوە وتم؛ "بەڵام تەنانەت یەک وشەیان دەربارەی ئەو سەردانەی تۆ بۆ من نەگێڕاوەتەوە".

خەندەیەکی پڕنهێنی خستە سەر لێوی. لەوێدا کەمێک لە 'مۆنالیزا' دەچوو، بەڵام وابزانم لەبەرئەوەبوو کە بەردەوام بە نائاگا بیرم لە قوتابخانەی وێنەکێشان دەکردەوە. ئەوجا وتی؛ "داوام لێکردن پێتنەڵێن کە من سەردانم کردوون، ناچاریش بووم شتێک هەڵبەستم و هێندەیان بۆ ڕوونبکەمەوە کە تۆ نابێت بەوە بزانیت".

لاڵ بووم و نەمزانی چی بڵێم. ئاخر من خۆم چەند ڕۆژێک لەمەوبەر خۆم پێنەگیرا و پۆستکارتەکەی ئیشبیلیام نیشانی دایک و باوکمدا. بەپەلە خۆمکرد بەژوردا و پێموتن 'ژن دەهێنم'. ئێستا تێدەگەم بۆچی هەر دەمودەست پارەیان بەقەرزدامێ تا بلیتێکی فڕۆکەی پێبکڕم. هیچیان پێ نەوتم، نەیانوت بۆچی لە گەرمەی خوێندندا سەفەرێکی ئیشبیلیا دەکەیت، بۆ چ شتێکیش، تەنها لەبەرئەوەی کچێک بدۆزمەوە کە یەک دوو کەڕەت لە ئۆسلۆدا بینیبووم.

کچەی پرتەقاڵ لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛ "هەروا بە ئاسانی ناتوانین کەسێکی دیاریکراو لە شارێکی گەورەدا بدۆزینەوە، بەلایەنی کەمەوە ئەگەر بمانەوێت بیبینین هەروا بەڕێکەوت نایەتە بەر لوتمان. جارجارێکیش کتومت ئەوەمان دەوێت. من دەبوایە بهاتمایەتە ئەم قوتابخانەی وێنەکێشانە، هەر لەبەرئەوە نەمویست بەر لەو سەفەرەم خۆم بە هیچ کەسێکەوە ببەستمەوە. ئێ خۆ گەر دوو کەسیش بەردەوام بەدوی یەکتریدا بگەڕێن، ئەو کاتە هیچ مایەی سەرسوڕمان نیە گەر بە ڕێکەوت یەکتر ببینن".

بابەتەکەم گۆڕی، مەبەستم لەوەیە شوێنی دیمەنەکەم گۆڕی و پرسیم؛ "تۆ قەت لەوەوپێش بەمەبەستی ئامادەبوونی سروتی جەژنی لەدایک بوونی مەسیح ڕوتکردۆتە کڵێسە گەورەکە؟"

سەری بۆ ڕاوەشاندم؛ "نەخێر هەرگیز نەچووم، ئەی تۆ؟"

منیش سەرم بۆ ڕاوەشاندەوە، ئەوجا وتی؛ "کاتژمێری دووش لەوێ بووم، دواتر چوومە دەرەوە و بەشاردا خولامەوە، چاوەڕوانی کاتی دەستپێکردنی سروتی دواترم دەکرد. ئەو جارەیان دەبوایە تۆ دەربکەوتیتایە. جەژنی لەدایک بوون بوو و لەسەر سەفەریشبووم بۆ دەرەوەی وڵات"

وابزانم بۆ ماوەیەکی دورودرێژ هەروا بە بێدەنگی دانیشتبووین، هیچمان نەدەوت. بەڵام خاڵێکی زۆر گرنگم لا مابووەوە و دەبوایە بگەڕامەیەتەوە سەری، لەبەرئەوە وتم؛ "کەواتە ئەو پیاوەی ناو تیۆتا سپییەکە مۆگنس نەبوو؟"

"نەخێر ئەو نەبوو"

"ئەی کێ بوو؟"

ئەو جارەیان بەر لەوەی وەڵامم بداتەوە کەمێک دوودڵی گرتی، دواتر وتی؛ "کەس نەبوو"

دیسانەوە پرسیمەوە؛ "کەس نەبوو؟"

دەستگیرانە کۆنەکەم بوو. کاتی خۆی لە دواناوەندی پێکەوە بووین"

وابزانم لەویادا من خەندە گرتمی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتی؛ "یان ئۆلاو، هیچمان ناتوانین ڕابوردووی ئەوی ترمان بکەینە موڵکی خۆمان، پرسیارەکە لەوەدایە ئایا پاشەڕۆژێکمان پێکەوە هەیە یان نا؟"

دوابەدوای ئەو قسەیەی شتێکی هەر زۆر قوڕم وت، وابزانم هەر لەبەر ئەوەش بوو کە نەمدەوێرا بڕوا بەوە بکەم کە پێدەچێت من و کچەی پرتەقاڵ پاشەڕۆژێکمان پێکەوە هەبێت. بە زمانی ئینگلیزی وتم "پرسیارەکە لەوەدایە کە پێکەوەبین یان پێکەوەنەبین"

وابزانم ئەویش کەمێک قسەکەمی بەلاوە بێمانابوو. هەر بۆ ئەوەی داییپۆشم دەستمکرد بە باسکردنی شتێکی جیاواز و وتم؛ "ئەی ئەو هەموو پرتەقاڵە چی بوو؟ چیت لێدەکردن؟ بەڕاست بۆ چ شتێک بەکارت دەهێنان؟

لەدڵەوە پێکەنی. دواتر وتی؛ "ئمم، پێم وابێت سەری سوڕماندبوویت. هەر بە بۆنەی ئەو پرتەقاڵانەوە ڕامکێشایتە ناو بازاڕی 'یۆنگستۆرگت'ەوە. وابزانم هەر بەهۆی ئەو پرتەقاڵانەشەوە بوو کە

کەوتیتە باسکردنی سەفەرەکەی گرینلاند. باسی گالیسکەی سەر بەفرەکەت بۆ کردم، ئەها وتت هەشت سەگ ڕایدەکێشن و دە کیلۆ پرتەقاڵیشی تێدایە".
بەپێویستم نەزانی نکۆڵی لە قسەکانی بکەم، بەڵام دیسانەوە وتمەوە؛ "ئەو هەموو پرتەقاڵەت بۆ چی بوو؟"
لەوێدا نیگایەکی تێگرتم، هەر وەک ئەو کاتە تەماشایکردم کە لە قاوەخانەکەی ئۆسلۆ دانیشتبووین. زۆر لەسەرخۆ کەوتە قسەکردن و وتی؛ "وێنەم دەکردن"
سەرم سوڕما و وتم؛ "وێنەت دەکردن؟.. هەر هەموویان؟"
زۆر بەنەرم و نیانیەوە سەرێکی بۆ لەقاندم، دواتر وتی؛ "ناچاربووم بەر لەوەی بێمە ئەم قوتابخانەی وێنەکێشانە، ڕاهێنان لەسەر وێنە کێشانی پرتەقاڵ بکەم"
"بەڵام ئەو هەمووە؟"
"دەبوایە وێنەی چەندەها پرتەقاڵم بکێشابایە. بەڵێ، من ڕاهێنانم لەوەدا دەکرد"
خۆمدا بەدەستەوە و سەرێکم بۆ ڕاوەشاند. لەدڵی خۆمدا دەموت 'بڵێیت پێم ڕاببوێرێت؟'، ئەوجا وتم؛ "باشە نەدەکرا یەک پرتەقاڵ بکڕیت و چەندەها جار وێنەی بکەیتەوە؟"
سەرێکی بۆ لار کردمەوە و بە نیمچە پەستیەکەوە وتی؛ "وابزانم من و تۆ لە ماوەی داهاتوودا دەبێت چەندەها بابەت تاوتوێ بکەین، چونکە لەوەدەچێت چاوێکت کوێر بێت"
"مەبەستت چیە؟"
"یان ئۆلاو، هیچ دوو پرتەقاڵێکی دونیا وەک یەک نین. تەنانەت هیچ دوو چڵە گیایەکیش بەتەواوەتی چوون یەک نین. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێستاکە تۆ لێرەدایت"

هەستم دەکرد بێئەقڵم، چونکە لە مەبەستی قسەکانی تێنەدەگەیشتم؛ "هەرلەبەر ئەوە لێرەدام چونکە هیچ دوو پرتەقاڵێک وەک یەک نین.. مەبەستت لەوەیە؟"
وتی؛ "تۆ ئەو هەموو ڕێگایەت تائێرە بەس بۆ ئەوە نەبڕیوە کە 'ئافرەتێک' ببینیت. ئەگەر وات کردبێت، ئەوا وەک ئەوە وایە بەدوای ئاودا هاتبیت و چەندەها کانیت بەجێهێشتبێت. ئێ خۆ ئەو هەموو ئافرەتە لە ئەورووپادا هەیە، بەڕاست.. چەندەها کانییشی تێدایە. بەڵام تۆ بۆ ئەوە هاتوویت کە من ببینیت و تەنها یەک 'من'یش هەم. لەڕاستیدا منیش لە ئیشبیلیاوە هەروا نامەیەکم بۆ 'پیاوێکی' ئۆسلۆ نەنارد. من نامەکەم بۆ تۆ نارد. داواملێکردیت کە هۆگرم بیت. داواملێکردیت کە کەمێک متمانەم پێبکەیت".
زۆر دوای ئەوەی کە قاوەخانەکە داخرا، ئێمە هەر دانیشتبووین و قسەمان دەکرد. دواتریش کە هەستاین، ڕایکێشامە لای قەدی ئەو دار پرتەقاڵەوەی کە لە ژێریدا دانیشتبووین، بەڕاست.. بەتەواوەتی بیرم ناکەوێتەوە، وابزانم من پاڵم بەوەوە نا بەرەو دارەکە، بەڵام لەیادمە کە وتی؛ "یان ئۆلاو، ئێستا دەتوانیت ماچم بکەیت، چونکە وا لەدواجاردا توانیم بتگرم".
دەستم خستە سەر دەفەی شانی و بەهێواشی ماچێکی لێوانیم کرد. وتی "ئاوها نا، دەمەوێت بەڕاستی ماچم بکەیت! دواتریش دەمەوێت بەڕاستی باوەشم پێدا بکەیت".
منیش ڕێک بە قسەی کچەی پرتەقاڵم کرد. ئەو یاساکانی دادەڕشت. ماچەکەی تامی 'فانیللا'ی دەدا، قژیشی بۆنی لیمۆیەکی تەڕوبڕی لێدەهات.
زۆر بەڕوونی هەستمدەکرد دوو سمۆرەی پڕلەژیان بە قەدی دار پرتەقاڵەکەدا هەڵدەزنێن و دەچنە سەر ترۆپکی دارەکە.

بەدڵنیاییەوە نەمدەزانی چ جۆرە یاریەکیان دەکرد، بەڵام هەستم دەکرد بەتەواوەتی سەرقاڵی گەمەکەیانن.
جۆرج، نامەوێت لەوەندە زیاتر لەسەر ئەو ئێوارەیە بنوسم، هێندە بەسە، بەڵام بەیارمەتیت دەمەوێت بزانیت ئەو شەوە بە چ شێوەیەک کۆتایی هات.
ئەو شەوە نەمتوانی پێش سەعات دوانزە بگەمەوە ئوتێلەکە. بەڵام کچەی پرتەقاڵ ژوریک و موبەقێکی خنجیلانەی لەلای ئافرەتێکی بەتەمەن بەکرێ گرتبوو. چەندەها وێنەی گوڵی پرتەقاڵ و داری پرتەقاڵ هەڵواسیبوو، هەمووشی بە ڕەنگی ئاوی کردبوو. تابلۆیەکی منیشی بە بۆیەی زەیتی کێشابوو و لە سوچێکی ژورەکەدا دایناببوو. نە من هیچ شتێکم دەربارەی ئەو تابلۆیە گوت و نە ئەویش هیچ شتێکی لەو بارەیەوە باسکرد. گەر شتێکمان دەربارەی بوتایە، ئەوکاتە هەر زۆر لە جادووی حەکایەتەکە نزیک دەکەوتینەوە. نەدەبوایە هەموو شتێک بە وشە بڵێین. یاساکان بەو شێوەیە بوون. بەڵام من خۆم لەو بڕوایەدابووم کە چاوم لە تابلۆکەیدا لەڕادەبەدەر گەورە بوو و زیاد لەڕادەش شین بوو. لەوە دەچوو هەموو کەسایەتی منی لە چاومدا چڕکردبێتەوە.
پاڵکەوتبووم تا نیوەشەوێک چیرۆکە دورودرێژەکانم بۆ فیرۆنیکا دەگێڕایەوە، هەموو وردەکاریە خۆشەکانیشم باسدەکردن. باسی کچی قەشەکەم بۆ گێڕایەوە کە نەخۆشبوو و چوار خوشک و دوو برا و سەگێکی 'لابرادۆر'ی لاساریان هەبوو. هەموو چیرۆکە دورودرێژەکەی گرینلاندیشم بۆ باسکرد، باسی سەفەرە سەختەکەم بۆ کرد کە بە گالیسکەیەک کردیان و هەشت سەگ ڕایدەکێشا، دە کیلۆ پرتەقاڵیشیان پێبوو. چیرۆکی کچە ئازاکەم بۆ گێڕایەوە کە وەک ئەندامێکی نهێنی پشکنینی پرتەقاڵی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان

کاریدەکرد و بەتەنها و چاپوکانە ڕوبەڕوی فایرۆسێکی کوشندەی نوێی پرتەقاڵ دەبووەوە. هەرچی دەربارەی ئەو کچەشبوو کە لە باخچەی ساوایەنەکەدا کاریدەکرد، هەموو ئەو شتانەم بۆ گێڕایەوە کە خۆم دەمزانی. ئەو ناچاربوو هەموو ڕۆژێک بڕواتە بازاڕی میوەکە و سی پرتەقاڵی ڕێک وەک یەک بکڕێت. چیرۆکی کچە گەنجەکەشم پێوت کە قوتابی پەیمانگای ئابووریبوو و جۆرە شیرینیەکی تایبەتی بە ئاوی ئەو پرتەقالانەی بۆ سەد میوانێکی دروستدەکرد. باسی کچە نۆزدە ساڵەکەم بۆ گێڕایەوە کە شوویکردبوو بە یەکێک لە قوتابیەکان و کچێکی بچکۆلەی لێهەبوو _هەرچەندە پیاوەکە پیاوێکی ناپۆلا و ناشیرینبوو. باسی کچە ئازا و ماندوونەناسەکەشم بۆ گێڕایەوە کە بەقاچاخ دەرمانی دەبرد بۆ منداڵە هەژارەکانی ئەفریقا.
کچەی پرتەقاڵیش هەندێ یادوەری سەردەمی منداڵیمانی گێڕایەوە کە کاتی خۆی لە گەڕەکی هوملەفای و ئیریسفایدا بەسەرماندا هاتبوو. من خۆم هەموو ئەو بەسەرهاتانەم لەیادکردبوو، بەلام لەگەڵ گێڕانەوەیدا هەندێکیان نەختە نەختە دەهاتنەوە بەرچاوم.
کە خەبەرمان بووەوە، خۆر گەیشتبووە ناوەڕاستی ئاسمان. ئەو لە پێشدا خەبەری بووەوە و هەرگیزیش ئەو کاتەم بیرناچێتەوە کە خەبەریکردمەوە، هەستێکی تایبەتی پێبەخشیم. چیتر هەقیقەت و فەنتاسیام بۆ جودا نەدەکرایەوە _وابزانم هیچ جیاوازیەکیان نەبوو. تەنها ئەوەندەم دەزانی کە چیتر بەدوای دۆزینەوەی کچەی پرتەقاڵەوە نەبووم.
سەرئەنجام دۆزیمەوە.

منیش هەروەها. لەوێدا دەمزانی کچەی پرتەقاڵ کێیە، بەڵام دەبوایە زۆر بەرلەوەی پێم بڵێت ناوی 'فیرۆنیکا'، بمزانیبایە کە کێیە..
کە گەیشتمە ئەو شوێنەی نامەکە، دایکم دیسانەوە لەدەرگای دایەوە و وتی؛ "کاتژمێر دە و نیوە جۆرج.. سفرەمان داخستووە. زۆرت ماوە بیخوێنیتەوە؟"
بەدەنگێکی کەمێک بەرێزەوە وەڵامم دایەوە و وتم؛ "ئازیزم کچەی پرتەقاڵی بچکۆلە. بیرم لێکردیتەوە. دەتوانیت کەمێکی تر چاوەڕوانم بکەیت؟"
نەمدەتوانی لە پشتی دەرگاکەوە بیبینم، بەڵام بەتەواوەتی بێدەنگ بوو. ئینجا وتم؛ "بەڵام هەندێ جاری کەم لە ژیاندا دەبێت هێندە فێربین کە کەمێک دان بەخۆماندا بگرین".
هیچی نەگوت، لەبەرئەوە وتم؛ "هیچ کوڕە بچکۆلەیەک..."
هێشتا گوێم لەهیچ شتێک نەبوو کە لەودیو دەرگاکەوە بێت، بەڵام پاش نەختێک گوێم لێبوو دایکم بەتەواوەتی خۆی نوساند بەدەرگاکەوە. بەچرپەچرپ لە قەراغی دەرگاکەوە کەوتە گۆرانی وتن؛ "...دەیەوێت لەگەڵ کچە منداڵێکدا یارییکات؟..."
لەوەندە زیاترێکی ئەو گۆرانیەی بۆ نەگوترا، چونکە دەستیکرد بە گریان. زۆر بەئەسپایی دەگریا.
منیش بە چرپەچرپێک وتم؛ "...هەتا ئەو کاتەی ڕۆژەکە تەواودەبێت بۆ خۆمان یاریدەکەین، لە وڵاتی خەونی خۆماندا گەمەدەکەین..."
هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، دواتر بەدەم لوشکەلوشکەوە وتی؛ "بەڕاستی.. دەربارەی ئەو شتانە دەنوسێت؟"
منیش لەوەڵامدا وتم؛ "نوسیویەتی"
وەڵامی نەدامەوە، بەڵام بەدەسکی دەرگاکەدا زانیم کەخۆی بەدەرگاکەدا داوە.

بەهێواشی وتم؛ "دایە، کەمێکی تر دێمە دەرەوە. تەنها پانزە لاپەڕەیەکم ماوە بیخوێنمەوە"
هێشتا هەر بێدەنگ بوو. ڕەنگە نەیتوانیبێت هیچ بڵێت. من بەتەواوەتی نەمدەزانی قسەکانم چەندە کاریگەری تێکردبوو.
خۆم بەخۆمم وت "ئای 'یۆرگن'ی داماو. ئەمە یەکەمین جارە ئاوها بتبینم کە لە پلەی دووهەمدا بیت. مەریەم خەوتبوو. لەوێدا من و دایکم و باوکم پێکەوە قسەمان دەکرد. کاتی خۆی هەرسێکمان خێزانێکی بچکۆلە بووین و ماڵمان لە گەڕەکی هوملەفای بووە. باپیرە و نەنکیشم لە ژورەوە دانیشتبوون، کاتی خۆی ئەوان ئەم خانوەیان دروستکردووە. یۆرگن هەروا بە میوانی هاتبووە لامان.

زۆر بەوردی بیرم لە هەموو ئەو شتانە کردەوە کە خوێندبوومەوە. هەر تا ئەو کاتە هەندێ شتی گرنگم بۆ دەرکەوتبوو. باوکم هەڵی نەدەخڵەتاندم. هەروا چیرۆکی کچەی پرتەقاڵی نەهۆنیبۆوە. ڕەنگە هەموو شتێکی باس نەکردبێت، بەڵام هەموو ئەو شتانەی کە نوسیبونی ڕاستبوون.
من بەهیچ جۆرێک بیرم نایەتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان تابلۆیەکی دار پرتەقاڵمان لە ژوری دانیشتنەکەدا هەڵواسیبێت. تەنانەت یەک وێنەی پرتەقاڵیشم نایەتەوە یاد. من تەنها تابلۆکانی تری دایکم دیووە. ئەو تابلۆ ئاویانەم دیوە کە تێیدا وێنەی یاسەمین و توتڕکی باخەکەی خۆمانی تێدا کێشاوە.
چەندەها شتی لەو بابەتەم دانابوو کە لە دایکمی بپرسم، یان خۆم بڕۆمە ئەمبارەکەوە و بگەڕێم بەدوایاندا. بەڵام من ئەوەم دەزانی کە دایکم کە منداڵ بووە ماڵیان لە ئێریسفای بووە. من یەک کەڕەت

چوومەتە ئەو خانووە زەردەوە، ئەویش بۆ ئەوەبوو کە نامەیەکیان بۆ بەرم، چونکە بەهەڵە ڕەوانەی پۆستەکەی ئێمە کرابوو.

لەوانەشە لەگەڵ خوێندنەوەمدا زیاترێکم دەربارەی وێنەی پرتەقاڵەکان بۆ ئاشکرابێت. شتێکی گرنگی تریش لە خەیاڵمدا بوو؛ "بڵێیت باوکم شتێکی زیاتر دەربارەی تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ بنوسێت؟"

ئەو تەلیسکۆبە لەسەر ناوی "ئێدوین پاوڵ هۆبڵ"ی ئەستێرەناسەوە ناونراوە. ئەو بوو کە سەلماندی گەردوون لە حاڵەتێکی بڵاوبوونەوەدایە. لەسەرەتادا هێندەی دۆزیەوە کە 'تەمی ئاندرۆمیدا' تەنها هەورێکی پڕلە گاز و گەردی گەلەهەسارەکەی خۆمان نیە، بەڵکو گەلەهەسارەیەکی سەربەخۆیە و لەدەرەوەی گەلەهەسارەی کاکێشانداتیە. دۆزینەوەی ئەو ڕاستیەش کە ڕێگای کاکێشان تەنها گەلەهەسارەیەکی نێو چەندەها گەلەهەسارەی تری گەردوونە، شۆڕشێکی مەزنبوو و ئەو دیدەیەی گۆڕی کە ئەستێرەناسەکان بەرامبەر گەردوون هەیانبوو.

گرنگترین دۆزینەوەی هۆبڵ ئەوەبوو لە ساڵی 1929دا هێندەی بۆ دەرکەوت کە هەتاوەکو گەلەهەسارەیەک لە ڕێگای کاکێشانەوە دورتربێت، خێراتر لە ئاسماندا دەجوڵێتەوە. ئەم دۆزینەوەیەش بنەمای ئەو تیۆریە پێکدەهێنێت کە پێی دەڵێن "تیۆری تەقینەوە گەورەکە". بەپێی ئەو تیوریە، کە ئەمرۆکە نزیکەی هەموو ئەستێرەناسەکان لەسەری تەبان، گەردوون بەر لە 12 بۆ 14 ملیارد ساڵێک لەمەوبەر لەپاش تەقینەوەیەکی گەورە هاتۆتە بوون. ئەوەش ماوەیەکی زۆرە، هەر زۆر زۆرە.

ئەگەر هەموو ئەو شتانەی کە لە مێژووی گەردووندا ڕویانداوە لە ماوەی شەووڕۆژێکدا چڕبکەینەوە، ئەو کاتە زەوی لەپاشنیوەڕۆیەکی درەنگی ئەو شەووڕۆژەدا سەریهەڵداوە. دایناسۆرەکانیش چەند

خولەکێک لە پێش نیوەشەودا هاتوونەتەبوون. بەڵام هەموو مرۆڤایەتی لە یەک دوو چرکەی کۆتایی ئەو شەورۆژەدا بوونی هەبووە...

جۆرج، هێشتا لێم تێدەگەیت؟ وا دیسانەوە پاش ئەوەی تۆم بردە باخچەی ساوایان، لەبەردەم کۆمپیوتەرەکەمدا دانیشتمەوە. ئەمڕۆ دووشەممەیە.
ئەمڕۆ کەمێک لەسەرخۆت نەبوویت. پلەی گەرمای لەشتم گرت، بەڵام 'تا'ت نەبوو. تەماشایەکی قوڕگ و گوێچکەکانیشم کردیت، دەستیشم لە لیمفەکانی قوڕگتدا، بەڵام هیچ شتێکم نەبینی. وابزانم سوکە هەڵامەتێکت گرتووە، لەوانەشە بەهۆی پشووی حەفتەوە کەمێک هیلاک بوو بیت.
لەلایەکەوە ئومێدەواربووم کە کەمێک نەخۆشبیت، ئەوسا دەکرا بەدرێژایی ڕۆژەکە لەماڵەوە لەگەڵمدا بمێنیتەوە. بەڵام وەک دەزانیت هێشتا ئەم کاری نوسینەشم تەواو نەکردووە.
دیسانەوە لە پشووی حەفتەدا چووینەوە بۆ 'فێلستیۆلن'. دایکت هەر لە بەیانی زووەوە سەتڵێکی هەڵگرت و بەمەبەستی پیاسەیەکی دورودرێژ بۆی دەرپەڕیە دەرەوە، دواتریش بە خۆی و چوار کلیۆ تمەشکی [1] زەردەوە گەڕایەوە. تۆش زۆر توڕەبوویت جۆرج، نەک هەر دەتویست توترک لێبکەیتەوە، بەڵکو سوربوویت لەسەرئەوەی بڕۆیتە سەر شاخەکە و توترک بڕنیت، لەماوەی ئەو پاش نیوەڕۆیەدا هەر خۆت بەتاقی تەنیا نیو کیلۆ توترکی ڕەشت ڕنی. بێگومان ئێمەش لە خانوەکەوە چاوێکمان لەسەرت دانابوو. دایکیشت ناچاربوو بیانکوڵێنێت و بیکاتە مربا و دوێنێ خواردمان، دوێنێ یەکشەممەبوو.

[1] "تمەشک" جۆرە تویەکە.و

وابزانم تۆ تامەکەیت بەلاوە کەمێک ترش بوو، بەڵام ناچاریشبوویت بیخۆیت، چونکە خۆت توترکەکانت ڕنیبوو.
ئەم هاوینە زۆر کەرەت 'لیمینگ'[1]مان بینی، ڕێگەشمان بەتۆدا کە وینەیەکی ئەو گیاندارە بەقەڵەمی بۆیەی زەرد و ڕەش لە دەفتەری یاداشتی خانوە هاوینەکەدا بکێشیت. وێنەیەکی جوان دەرچوو، ئەگەر بەوردی تەماشات بکردبایە، دەتبینی ئەوە کە 'لیمینگ'ە. تەنها ئەوەندەبوو کە کلکیت زۆر درێژ کردبوو. هەروا بۆ ئەوەی بیرمان نەچێتەوە دایکت لەژێر وێنەکەدا نوسی 'لیمینگ'، دواتریش نوسی جۆرج، 1990/9/1.
خۆ لەوانەشە تا ئێستاکەش دەفتەری یاداشتی خانوە هاوینەکەتان مابێت.. بەڕاست، هێشتا ماوتانە جۆرج؟
تۆ خەوت لێکەوت و منیش دانیشتبووم هەموو نوسراوی ناو دەفتەرەکەم خوێندەوە، هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی. چەند جارێک خوێندمەوە. هەرئەوەندەی دەگەیشتمە دواهەمین لاپەڕە، دیسانەوە تەماشایەکی وێنەکەی تۆم دەکردەوە و سەرلەنوێ لەسەرەتاوە دەستم بە خوێندنەوەی دەکردەوە. وا مەزەندەم دەکرد بەرلەوەی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح بێت، ئەوە دواهەین جارمان بێت کە لەو خانوە هاوینەیەدا بمێنینەوە.
دواجار فیرۆنیکا هات و دەفتەرەکەی لەدەست سەندم و خستیە سەر ڕەفەکە، هەرچەندە ئێمە هەمیشە لەسەر تاقی ئاگردانەکە داماندەنا. ئەوجا هەروا بەئاسانی وتی؛ "با کەمێک شەراب بخۆینەوە"

بەڵام با بگەڕێینەوە بۆ ئیسپانیا.

---

[1] گیاندارێکی بچکۆلەیە و سەربە گیانەوەرە قرتێنەرەکانە، لە نەرویج و سویددا زۆرە.

دوو ڕۆژ لە شاری ئیشبیلیادا لەگەڵ فیرۆنیکادا مامەوە. دواتر ناچاربووم بگەڕێمەوەماڵەوە، چونکە فیرۆنیکا و خاوەن خانوەکە وایان پێباشبوو ئەوێ بەجێبهێڵم. چارەم نەبوو، دەبوایە نزیکەی سێ مانگێکی تر دانم بەخۆمدا بگرتایە و چاوەڕوانی بومایە هەتاوەکو خوێندنەکەی لە قوتابخانەی وێنەکێشانەکەدا تەواودەکرد. بەڵام لەوەبەدواوە فێری تاسەکردن بووم. هێندەش فێربووم کە بڕوا بە کچەی پرتەقاڵ بکەم.
بێگومان دەمویست دڵنیابم کە هێشتا هەر لەسەر پەیمانەکەی خۆی ماوە کە شەش مانگی دواتر هەموو ڕۆژێک پێکەوەبین یان نا. هەر بۆیە لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد، چونکە من یاساکانم شکاندبوو و نەمدەتوانی هەروا بەئاسانی چاوەڕوانی ئەوەبم کە پەیمانەکەی بەرێتەسەر. بۆ ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە و ئەوجا وەڵامی دامەوە. وابزانم دەیویست شتێک بڵێت کە کەمێک پەستم بکات. دواتر بەدەم خەندەیەکەوە وتی؛ "باشە، هەر ئەو دوو ڕۆژەی لێدەردەکەم کە لێرە لێت دزیم، هەرئەوەندە و هیچی تر".
لەڕێگاماندا بەرەو فڕۆکەخانەکە چاومان بە کۆترێکی سپی مردارەوەبوو کەوت، لەسەر ئاوەڕۆی تەنیش شەقامەکەدا کەوتبوو. فیرۆنیکا وەستا و موچوڕکەیەکی پێدا هات. من بەلامەوە سەیربوو کە ئەو دیمەنە هێندە کاری تێکرد. بەڵام ئەو ئاوڕێکی لە من دایەوە و سەری خستە سەر قوڕگم، ئینجا دەستیکرد بە گریان. پاش نەختێک خۆشم دڵم پڕبوو و دەستم کرد بە گریان. هەردووکمان گەنج بووین. ئاخر ئێمە لە گەرمەی حەکایەتێکدا بووین و نەدەبوایە لەوێدا کۆترێکی مردارەوەبوو لە ئاوەڕۆیەکی سەر شەقامێکدا ببینین. بەهیچ شێوەیەکیش نەدەبوایە کۆترێکی سپی بێت. هەردووکمان تێر گریاین. ئەو کۆترە سپیە نیشانەیەکی شوومبوو.

که گەڕامەوە بۆ ئۆسلۆ دیسانەوە سەرنجم خستەوە سەر خوێندنەکەم. دەبوایە نەهێڵم وانەکان بەسەرمدا کەڵەکەبکەن، ئەو حەفتەیە چەند وانەیەکی گرنگم لەدەستچووو، جگەلەوەش لە چەند مانگی پێشوودا هەندێ وانەی ترم بەهۆی خلیسکێنەی سەربەفر و گەڕانی ناو شاردا لەدەستدا. بەڵام لە هەمان کاتدا چیتر پێویستم بەوە نەبوو کە بچمە ناو شار و بەدوای کچەی پرتەقاڵی پڕ نهێنیدا بخولێمەوە، هەر لەبەرئەوەش کاتێکی زۆری زیادەم لەبەردەستدا بوو. هەڵبەتە پێویستم بەوەش نەبوو زۆر لەخۆمبکەم و هەوڵی دۆزینەوەی دەستگیرانێک بدەم. زۆربەی قوتابیەکانی هاوەڵم کاتێکی زۆریان بەو جۆرە شتانەوە دەکوشت.
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ بینینی هەموو پاڵتۆیەکی ڕەشی ئافرەتێکدا دادەچڵەکیم، دواتریش کە هێدی هێدی دونیا بەرەو گەرما دەچوو، هەموو ماکسیەکی سوری هاوینە سەرنجی ڕادەکێشام. هەموو کەرەتێک کە پرتەقاڵێکم دەبینی، بیرم لە فیرۆنیکا دەکردەوە. تاوتاوێکیش کە دەچووم بۆ بازاڕ، لەبەردەم ڕەفەی میوەکاندا دۆشدادەمام و چاوم دەبڕیە پرتەقاڵەکان. لەوەبەدواوە زۆر باشتر دەمبینی کە هیچ دوو پرتەقاڵێک وەک یەک نین. هەر زۆر بە ئارامیەوە بەرامبەریان دەوەستام و لێیان ورددەبوومەوە. خۆ ئەگەر بشمکڕیبانایە، ئەوا هەر زۆر بەڕاشکاوی دەکەوتمە هەڵبژاردنیان و باشترینیانم هەڵدەگرت. جارجارێک ئاوەکەیانم دەگوشی و دەمکرد شەربەت، یەک کەڕەتیش شیرینیەکی تایبەتیم پێدروستکرد و دەرخواردی 'گۆنار' و چەند برادەرێکی ترم دا. ئەو ئێوارەیە بۆ خۆمان لە باڵەخانەکە دانیشتبووین و چوارقۆڵێ یاری کاغەزمان دەکرد.

گۆنار لەکۆلیجی ڕامیاریبوو و ساڵی دووهەمی بوو، بەشێوەیەکی گشتی ئەو خواردنی لێدەنا نەک من. هەمیشە خواردنی خۆشی وەک گۆشتی سورەوەکراو و ماسی بۆ ئامادەدەکردین. هەرچەندە قەت چاوەڕوانی ئەوە نەبوو لە بەرامبەردا شتێکی بۆ بکەم، بەڵام پێمخۆشبوو تاوناتاوێک سەرییسوڕمێنم و بۆ نمونە شیرینیەکی بەتامی پرتەقاڵی بۆ دروستبکەم. من بەدڵ و بەگیان ئەو شیرینیەم دروستدەکرد. وەختی خۆی دایکم، واتە نەنەی تۆ، یارمەتیدام و شێوەی دروستکردنی ئەو شیرینیەی لە کتێبێکی کۆنی چۆنیەتی دروستکردنی خواردەمەنیدا بۆ دۆزیمەوە. لەوەش زیاتر، ئامادەیی خۆی نیشاندا کە ئەو شیرینیە تایبەتیەم بۆ دروستبکات، بەڵام خۆ ئەو نەیدەزانی کە من چێژم لە ئامادەکردنی دەبینی و مەبەستم بوو خۆم دروستیبکەم. پێشم وانیە بە هیچ شێوەیەک هەستی بەوە کردبێت کە ئەو شیرینیە پەیوەندیەکی بە فیرۆنیکاوە هەبوو.

بەهەرحاڵ جۆرج، دواتر گەڕایەوە بۆ نەرویج. لەناوەڕاستی مانگی حەوتدا لە ئیشبیلیاوە گەڕایەوە. من بۆ پێشوازیکردنی خۆم گەیاندە فرۆکەخانەی 'فۆرنبیو'. بەخۆی و دوو جانتای گەورە و کۆمەڵێک تابلۆ و هێڵکاری زۆرەوە لە بەشی گومرگی فرۆکەخانە هاتە دەرەوە، لەوێدا خەڵکانێکی زۆر بوونە شاهیدی پێک گەیشتنە گەورەکەمان. لەپێشدا هەروا بۆ ماوەی نیو خولەکێک وەستابووین و تەماشای یەکتریمان دەکرد. هەردەتووت دەمانەوێت بیسەلمێنین کە دەتوانین ساتێکی تریش دان بەخۆماندا بگرین. بەڵام ئیدی پاش نەختێک لە باوەش پێداکردنێکی گەرم و گوڕدا توواینەوە. دەبێت دان بەڕاستیەکدا بنێم و بڵێم هەرچەندە لە فرۆکەخانەیکدا بووین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەڕادەبەدەر بەگەرموگوڕی باوەشمان بەیەکدا کرد. ئافرەتێکی بەتەمەن بەلاماندا تێپەڕی، ئەویش بەو بۆنەیەوە ڕای خۆی دەربڕی

و وتی؛ "ئەوە شەرم ناکەن!" بەڵام ئێمە بەقسەکەی پێکەنین، چونکە هیچ شتێکمان نەدەبینی کە مایەی شەرمەزاری بێت. ئێمە شەش مانگبوو چاوەڕوانی یەکتر بووین.
هەر لە هۆڵێ پێشوازی فرۆکەخانەکەدا فیرۆنیکا تابلۆکانی کردەوە و ئیشەکانی نیشاندام. بەپەلە پۆرترێتەکەی 'یان ئۆلاو'ی هەڵدایەوە، هەرچەندە بۆ ساتێکی زۆر کەم بینیم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیسانەوە سەرنجم چووەوە سەر چاوەکانی تابلۆکە، لەوێشدا پێموابوو زیاد لەڕادە دەبریسکانەوە. من خۆم هیچ شتێکم لەو بارەیەوە نەگوت، بەڵام فیرۆنیکا هەندێ شتی خۆش خۆشی دەربارەی وێنەکانی تر وت. دەمی هەر لە چیکەنە دەچوو. بەئاشکرا شانازی بە کارە هونەریەکانیەوە دەکرد و نەشیدەویست ئەو لایەنەم لێبشارێتەوە. دەیویست نیشانم بدات کە لەماوەی شەش مانگی ڕابووردودا شتێک فێربووە.

باقی هاوینەکە بۆ خۆمان ڕامانبوارد. چووینە سەر دورگەکانی ئۆسلۆ، بەرەو باکوری وڵات سەفەرمانکرد، سەردانی مۆزەخانە و پێشانگای هونەریمان کرد. چەندەها شەوی درەنگ بەدڵێ خۆمان بەلای شەقامەکانی 'تۆسن'دا پیاسەمانکرد.
خۆزگە دەتبینی! خۆزگە لەو کاتانەدا دەتبینی کە خۆیدەکرد بە پێشانگایەکی هونەریدا. خۆزگە گوێشت لە قاقای پێکەنینەکانی دەبوو. پێکەنینەکەی ئەو منیشی دەگرتەوە. هێندەی من بزانم پێکەنین یەکێکە لەو شتانەی کە زۆر ساریە.
زوو زووش ڕاناوی 'ئێمە'مان بەکاردەهێنا. وشەیەکی سەیرە. خەڵکی دەڵێن 'سبەینێ ئەم شتە یان ئەو شتە دەکەم'. یان کەسێک لە یەکێکی تر دەپرسێت 'تۆ نیازت چیە؟'. ئەوانە شتێکی ئاساین. بەڵام

ئەوانە گۆڕان و لەپڕێکدا بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەمانوت 'ئێمە'. هەر بۆ نموونە ئەمانوت 'بەلەمەکە نەبەینە ناو ئاوەکەوە و مەلە بکەین؟'، 'لەماڵەوە بمینینەوە و کتێب بخوێنینەوە؟'، 'ئەرێ شانۆگەریەکەمان بەدڵبوو؟' تاوەکو ڕۆژێک وتمان؛ 'ئێمە بەختەوەرین!'.
لەو کاتانەدا کە ڕاناوی 'ئێمە' بەکاردەهێنین، دوو کەس دەخەینە پاڵ هەڵسوکەوتێکی هاوبەشەوە، هەروەک ئەوەی ئەو دوو کەسە بوونەوەرێکی ئاوێتەبن. زۆربەی زمانەکان ڕاناوێکی تایبەتی بۆ ئاماژەکردنی دوو کەس _وە تەنها بۆ دووکەس_ بەکاردەهێنن. بەو ڕاناوە دەوترێت 'ڕاناوی دوانە'، یان ئەو شتەی کە دوو کەس هاوبەشی تێدا دەکەن. من پێم وایە ئەوە دەستنیشان کردنێکی بەسوودبێت، چونکە هەندێ جار نە یەک کەسین و نە لە دوو کەسیش زیاترێکین. ئەو کاتە دەبین بە 'ئێمە هەردووکمان'، وەک ئەوەی ئەو 'ئێمە'یە شتێک بێت کە جودا نەکرێتەوە. ئابەو شێوەیە لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو ڕاناوەدا هەندێ یاسای ئەفسانەیی دەردەبڕین، هەر لەو کاتە دەچیت کە جادووگەرێک جادوویەک دەکات. "ئێستاکە خواردن دروستدەکەین"، "ئێستاکە بتلێک شەراب هەڵدەپچڕین"، "ئێستاکە دەڕۆینە جێگاوە". کەمێک مایەی شەرمەزاری نیە کە بەو شێوەیە قسە دەکەین؟ بەهەرحاڵ شتێکی تەواو جاوازترە وەک لەوەی بڵێین 'ئێستاکە دەبێت سواری پاس ببیت و بڕۆیتەوە ماڵەوە، چونکە خەوم دێت'.
لەگەڵ بەکارهێنانی ڕاناوی 'دوانە' یاخود 'دوو ژمارەیی'دا، یاسای نوێ دێنینە ئاراوە. "ئێستاکە دەڕۆین پیاسەیەک دەکەین!"، چەندە ڕستەیەکی سادەیە جۆرج، ڕاستە تەنها چوار وشەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەسفێکی تێروتەسەلی هەڵسوکەوتێکت بۆ دەکات کە کاریگەریەکی قوڵی لەسەر ژیانی دوو کەسی سەر ئەم زەویە هەیە.

لەو بارەیەشەوە تەنها لە وشەکاندا وزەیەکی کەم بەکارناهێنین؛ فیرۆنیکا دەڵێت 'خۆمان دەشۆین!'، 'نان دەخۆین!'، 'دەخەوین!'، لەو حاڵەتانەدا کە بەو شێوەیە قسەدەکەین، تەنها پێویستیمان بەیەک گەرماو هەیە، تەنها یەک چێشتخانە و یەک جێگای خەومان پێویستە.

من بەکارهێنانی ئەو وشەیە ڕایچڵەکاندم. کە وشەی 'ئێمە'م بەکاردەهێنا هەستمدەکرد بازنەیەک کۆتایی پێهاتووە. دەتگوت سەرتاپای جیهان لە یەکەیەکی باڵاتردا تواوەتەوە.

ئەوە گەنجێتیە جۆرج.. بێ خەیاڵیەکی گەنجانەیە!

بەڵام ئێوارەیەکی گەرمی مانگی هەشتم لەیادە کە لەسەر 'بیوگدیو' دانیشتبووین و تەماشای ئاوەکەمان دەکرد. لەپڕێکدا وتم؛ "تەنها ئەم کەرەتە لەم ژیانەداین"، خۆشم نازانم ئەو وشانەم لەکوێوە هێنا، بەڵام لە ناکاوێکدا لەدەمم دەرپەڕین.

فیرۆنیکاش هەر وەک ئەوەی بەلایەوە گرنگبێت کە شتێکم بیربخاتەوە وتی؛ "بەڵام ئێستاکە لێرەداین".

بەڵام من هەستمکرد فیرۆنیکا دەیەوێت ئەو شتەی کە من دەمویست گوزارشتی لێبکەم، بەفیزەوە ڕەتیبکاتەوە و وتم؛ "بیر لە چەند ئێوارەیەکی وەک ئەم ئێوارەیە دەکەمەوە کە ڕێگەم پێنادرێت بیان بینم..." من دەمزانی فیرۆنیکا ئەو دێڕە شیعرەی 'ئۆلاف بوول'ی بیستووە. لەوەوپێش پێکەوە ئەو شیعرەمان خوێندبووەوە.

فیرۆنیکا بەپەلە ئاوڕێکی لێدامەوە، بە دوو پەنجە پەڕەی گوێچکەی بادام و وتی؛ "بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت لێرەدا هەبوویت. هەی بەختەوەر!"

دەمەو پایز فیرۆنیکا لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان دەستی بە خوێندن کرد و منیش هەر لەسەر خوێندنی پزیشکیەکەی خۆم بەردەوامبووم. هەر لەپاش تەواوبوونی چەند خولی سەرەتای خوێندنەکەمەوە، خوێندنی پزیشکی زیاتر و زۆرتر سەرنجی ڕادەکێشام. هەتا بکرایە پاش نیوەڕوان و ئێواران پێکەوە دەبووین، هەوڵماندەدا هەر هیچ نەبێت ڕۆژانە یەکتری ببینین. بەڵام لەڕاستیدا ئەو دوو ڕۆژەی لێکێشامەوە کە قەرزاری بووم، ئەو دوو ڕۆژ بەتەنهابوو. وابزانم ویستی هەروا بۆ خۆشی کەمێک پەستم بکات، بەڵام خۆ ڕێشی تێدەچێت کە ویستبێتی چاوترسێنم بکات. هێشتا هەر ناچاربووین کە پێ بەپێی یاساکان بجوڵێینەوە، چونکە حەکایەتەکەمان نەک هەر تەواونەبووبوو، بەڵکو تازە دەستی پێکردبوو. هەرئەوەندەبوو کە زیاتر و زۆرتر لەچواردەورماندا گەورە دەبوو، بەو شێوەیەش بەردەوام یاسای نوێ دەهاتە کایەوە و دەبوایە پەیڕەویمان بکردنایە. جۆرج، بیرت دێت لەوەوپێش باسی ئەو جۆرە یاسایانەم بۆ کردیت؟ ئەو یاسایانە لە کۆمەڵێک شتی گرنگ پێکهاتوون کە یان دەبێت بیان کەین یان دەبێت نەیانکەین، بەڵام مەرج نیە لێیان تێبگەین. تەنانەت پێویست ناکات باسیشیان بکەین. فیرۆنیکا لە ئۆسلۆشدا ژورێک و چێشتخانەیەکی بچکۆلەی لەلای ئافرەتێکی بەتەمەن بەکرێ گرتبوو. کرێ خانوەکەشی تەنها ئەوەندەبوو کە لە هاویناندا چیمەنەکەی بۆ ببڕێت و لە زستانانیشدا بەفری بەرماڵەکەی بۆ ڕامالێت، جگەلەوانەش حەفتەی دووجار بازاڕی بۆ دەکرد و حەفتەی بتڵێک شەرابی پورتوغالیشی بۆ دەکڕی. ئافرەتە بەتەمەنەکە ناوی خاتوو 'مۆوینکڵ'بوو، ئەو بەوە ڕازیبوو کە من جارجارێک ئەو کارانەی بۆ هەڵسوڕێنم. من ئەوەم بەلاوە باشبوو، چونکە بەو شێوەیە بەرەبەرە بەلایەوە ئاساییبوو کە تاوناتاوێک

شەوانە لە ژورە بچكۆلەكەی فیرۆنیكادا بمێنمەوە. چونكە من بەپێی پێوانەكەی ئەو كرێ خانووی خۆم دابوو.
جەژنی لەدایكبوونی مەسیح هاتەوە و دیسانەوە بەمەبەستی ئامادەبوونی ئەو سروتە ئاینیە چووینەوە بۆ كڵێسە گەورەكەی شار، چونكە هەردووكمان پێمان وابوو كە قەرزارباری یەكتربین. فیرۆنیكا هەر هەمان پاڵتۆ ڕەشەكەی لەبەركرد و هەروەها هەمان تەوقە زیوینیە ئەفسوناویەكەشی لەقژی دا. لەوێدا دیسانەوە بەهۆی هۆیەكی نادیار و پڕنهێنیەوە بووم بە بەشێك لە حەكەیاتەكە. بێگومان ئەو ساڵە هەردووكمان لەسەر هەمان كورسی دانیشتین، هیچ پێویستیشی نەدەكرد تەماشای پیاوەكانی ناو كڵیسەبكەم و نیگەرانی ئەوەبم بە چ لایەكدا ئاوڕدەدەنەوە. بەلامەوە ئاسایی بوو ئاوڕ لە فیرۆنیكا بدەنەوە، هەندێكیشیان بەڕاستی ئاوڕیان لێدایەوە، بەڵام من شانازیم پێوەدەكرد. فیرۆنیكاش هەروەك خۆر دەدرەوشایەوە و دڵشاد و كەیف خۆشبوو. بێگومان منیش دڵم خۆشبوو. پێم وابێت ئەویش كەمێك هەستی بەشانازیدەكرد.
پاش تەواوبوونی سروتە ئاینیەكە ڕێك هەروەك ساڵی پێشوو بەهەمان ڕێگادا ڕۆیشتینەوە. لەوەوبەر لەسەر ئەوە ڕێك كەوتبووین. ئێمە هەر لەو كاتەوە پەیڕەوی هەندێ داب و نەریتی خۆمان دەكرد. بێ ئەوەی هیچێكی وا بڵێین بەرەو پاركی قەڵا سەركەوتین. ڕاستە لەوەوپێش باسمان لەوە نەكردبوو كە ئاوها بەبێدەنگی پیاسەبكەین، بەڵام ئیدی بێدەنگیەكەمان شتێك بوو كە خۆی لە خۆیەوە هاتە پێشەوە.
وەستاین و بۆ ماوەیەكی زۆر باوەشمان بەیەكداكرد، ڕێك لەهەمان ئەو شوێنەدا وەستابووین كە پار تێیدا وەستاین و ئەو سواری تەكسیەكە بوو، ئەو ساڵەش دەبوایە دیسان جودا بووینایەتەوە.

فیرۆنیکا دەبوایە لە 'سکیللەبێک' لە ماڵی پورێکی بەتەمەنیدا چاوی بە باوکی بکەوتایە و وایان دانابوو لەوێوە هەموویان بە ماشێن بڕۆن بۆ ماڵی باوکی کە لە 'ئاسکار'بوو. منیش لەلای خۆمەوە نیازمبوو ئەو جەژنە لە هوملەفایدا لەگەڵ دایک و باوک و مامە ئاینەدا بەسەربەرم.

دیمەنەکە هەروەک ساڵی پێشوو بوو. لە 'وێرگەلانسفای'دا دەبوایە خواحافیزیمان لەیەکتر بکردایە، چاوەڕوانی تەکسیەکی بەتاڵبووین کە بێت و فیرۆنیکا سواری ببێت. بەڵام ئاخۆ لەدوای ڕۆیشتنی تەکسیەکەوە چی ڕوودات؟ بڵێیت حەکایەتەکەمان کۆتایی پێبێت؟ تۆ بڵێیت لە پڕێکدا جادووەکە باتاڵ ببێتەوە؟ ئێمە باسی ئەوانەمان نەکرد. شەش مانگی پێشوو هەموو ڕۆژێک یەکتریمان بینی، هەڵبەتە جگە لەو دوو ڕۆژە تاڵەی کە سزای دام. کچەی پرتەقاڵ پەیمانە شکۆدارەکەی خۆی بردەسەر. بەڵام ئاخۆ ساڵی داهاتوو چ جۆرە یاسایەکمان دەبێت؟

ئاو وهەوا لەکاتی ئەو جەژنەدا لەساڵی پار ساردترێک بوو، فیرۆنیکا لەسەرمادا هەڵدەلەرزی. باوەشم پێدا کرد و دەستم بە پشتیدا هێنا. ئەوجا باسی ئەوەم بۆکرد کە گۆنار، ئەو کوڕەی کە باڵەخانە بچکۆلەکەی لەگەڵدا گرتبووم، لە سەرەتای ساڵی داهاتووەوە دەگوێزێتەوە. وتم دەیەوێت لەشاری 'بێرگن' خوێندنەکەی تەواوبکات، لەبەرئەوە ناچارم قوتابیەکی تر بدۆزمەوە کە لەگەڵمدا بژی و نیوەی کرێ خانوەکە بدات.

جۆرج، من زۆر ترسنۆکبووم. پێموابێت ئەویش هەستی بەوە کردبوو. کەمێک هەڵچوو. گۆنار دەگوێزێتەوە؟ کەواتە دەبێت قوتابیەکی تر بدۆزمەوە کە لەگەڵمدا بژی؟ ئاخر بڵێت بەڕاستی بەبێ ئەوەی هیچ شتێکم لای ئەو باسکردبێت، پلانم بۆ ئەوە نەکێشابێت؟ هەستمکرد

تورە دیارە، لەوە دەترسام ئەو جەژنە بەناخۆشی جودا ببینەوە. کەچی وتی؛ "باشە.. من دەتوانم بگوێزمەوە لات و لەگەڵتا بژیم. مەبەستم لەوەیە پێم وابێت دەتوانین بەیەکەوە بژین. یان ئۆلاو، تۆ پێت وانیە بتوانین پێکەوە بژین؟"
منیش کتومت ئەوەم دەویست. بەڵام من لەو ترسنۆکتر بووم. لەوە دەترسام یاساکان بشکێنم.
هەروەک دار پرتەقاڵێکی گۆڕەپانی "ئەلیانزا" دەدرەوشایەوە، چونکە هەر پاش نەختێک لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین لەسەرەتای مانگی یەکدا بگوێزێتەوە بۆ باڵەخانەکەی ئادەمستوون و لەگەڵمدا بژی. ساڵی داهاتوو هەر ئەوە نەبوو کە هەموو ڕۆژێک پێکەوە بین، بەڵکو هەموو شەوێکیش پێکەوە دەبووین. یاسا نوێکان بەو جۆرە بوون.
بەڵام هێندەی پێنەچوو لەناکاودا جۆرە نیگەرانیەکەم لەسەر دەموچاوی بینی. بەخۆمم وت ڕەنگە گومانێکی هەبێت، لەوانەیە هێشتا کێشەیەکی بچکۆلەی هەبێت. یان ڕەنگە هیوایەکی هەبێت و نەیەوێت دەریبخات؟ کێ دەزانێت؟ ئیدی وەک جاران نەمابووم و باشم دەناسی، لەبەرئەوە بە چرپەچرپێک وتم؛ "چیتە فیرۆنیکا؟"
لەوەڵامدا وتی؛ "کەواتە ژورەکەی گۆنار چۆڵ دەبێت"
سەرێکم بۆ لەقاند، هەرچەندە نەمزانی بۆچی دیسانەوە ئاماژەی بۆ دەکاتەوە. خۆ من کەمێک لەمەوبەر خۆم پێموت کە گۆنار دەگوێزێتەوە.
کەمێک دواتر وتی؛ "ئاخر خۆ نیازمان نیە هەریەکە و لە ژورێکدا بخەوین"
هێشتا هەر لەمەبەستی تێنەگەیشتم، بەڵام وتم؛ "بێگومان نەء"
ئەوجا گومانەکانی ڕەوینەوە و ڕاستەوخۆ بەڕاشکاوی مەبەستەکەی خستەڕوو و وتی؛ "دەکرێت ژورەکەی ئەو بۆ مەبەستی وێنەکێشان

بەکاربهێنم؟". بۆ ساتێکی کەم تەماشایەکی کردم، تەنها بۆ ئەوەی بزانێت من بە چ شێوەیەک قسەکەی هەڵدەسەنگێنم. منیش هەر زۆر بەئاسانی دەستێکم خستە سەر تەوقەکەی پشت ملی و وتم؛ "هەر زۆر شانازی بەوەوە دەکەم کە لەگەڵ هونەرمەندێکدا بژیم".
پاش یەک دوو دەقە تەکسیەکی بەتاڵ هات، دەستێکی بەرزکردەوە و تەکسیەکەی گرت. ئەو جارەیان پاش ئەوەی لە تەکسیەکەدا دانیشت، ئاورێکی لێدامەوە و زۆر بەگوڕەوە هەر دوو دەستی بۆ ڕاوەشاندم. بزانە.. هەر تەنها پاش ساڵێک چەندە شت گۆڕابوو!
تەکسیەکە ڕۆشت و هیچ پێویستیەکم بەوە نەبوو بەدوای تاکە پێلاوێکی بەجێماودا بگەڕێم. چیتر هیچ کێشەیەک لە حەکایەتەکەماندا نەمابوو. چیتر نەبەسترابووینەوە بەچەند یاسایەکی پڕنهێنیەوە کە کۆمەڵێک فریشتەی پاک بۆمان دارێژن و کردن و نەکردنی شتەکانمان بۆ دەستنیشان بکەن. لەوێ بەدواوە بەختەوەربووین.
بەڵام ئاخر مرۆڤ چیە جۆرج؟ بەهای مرۆ چەندێکە؟ ئایا ئێمە گەردین و گەردەلول ئاسا بەهەموو کون و قوژبنێکی دونیادا بڵاودەبینەوە؟
لەم کاتەدا کە ئەم دێڕانە دەنوسم، تەلیسکۆبی هۆبڵ لە خولگەیەکدا بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە. ئێستاکە وا چوار مانگە لەوێدایە و لەکۆتایی مانگی پێنجەوە توانی چەندەها وێنەی پڕبەهای گەردوونمان بۆ ڕەوانەبکات، مەبەستم لە وێنەی ئەو شوێنە چۆڵ و هۆڵە مەزنەیە کە لە بنەڕەتدا ئێمەی لێوە هاتووین. بەڵام هەر پاش ماوەیەکی کەم هێندەش ڕونبووەوە کە تەلیسکۆبەکە هەڵەیەکی گەورەی لە پێکهاتەکەیدا هەیە. هەر لە ئێستاشەوە دەنگۆی ئەوە هەیە کە کەشتیەکی ئاسمانی و کۆمەڵێک پسپۆڕ ڕەوانەی

ئاسمانبکەن بۆ ئەوەی هەڵەکەی ڕاستبکەنەوە، بەو شێوەیەش تەلیسکۆبەکە دەتوانێت تێگەیشتنێکی باشترمان دەربارەی گەردوون پێببەخشێت.
تۆ ئاگات لە تەلیسکۆبەکەی هۆبڵە؟ دەزانی چی بەسەرهات؟ چاکیان کردەوە؟
زۆرجار ئەو تەلیسکۆبەی ئاسمان هەر وەک چاوێکی گەردوون دەبینم، چونکە ئەو چاوەی کە هەموو گەردوون ببینێت تاڕادەیەک شایانی ئەوەیە کە پێی بگوترێت چاوی گەردوون. تۆ لە مەبەستم تێدەگەیت؟ خۆی هەر گەردوون خۆی ئەو ئامێرە سەیروسەمەرەیەی بەرهەمهێناوە. تەلیسکۆبی هۆبڵ ئۆرگانی هەستیی گەردوونە.
ئەو ئەفسانە مەزنە چیە کە ئێمەی تێدا دەژین و هەر یەکەمان بۆ ماوەیەکی کەم ڕێگەی پێدەدرێت کە بیبینێت؟ ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو تەلیسکۆبەی ئاسمان یاریدەمان بدات و کەمێک زیاتر سروشتی ئەو ئەفسانەیەمان بۆ ڕوونبکاتەوە. پێیدەچێت وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت مرۆڤ چیە، لە پشتی گەلەهەسارەکانەوە بێت.
وابزانم چەند جارێکی زۆر وشەی 'مەتەڵ'م لەم نامەیەدا بەکارهێنا. لەوانەیە بتوانین هەوڵدانی تێگەیشتنی گەردوون لەگەڵ کۆکردنەوە و دانانەوەی چەندەها پارچەی بچکۆلەی وێنەیەکی مەزندا بەراوردبکەین. خۆ ڕێشی تێدەچێت کە هاوکات مەتەڵێکی ئەقڵانی یان ڕۆحی بێت و زۆر لەوانەشە کە وەڵامەکەی لەناوەوەماندا بدۆزینەوە، چونکە ئێمە لێرەداین، بگرە ئێمە خۆمان گەردوونین.
کێ دەزانێت، لەوانەیە هێشتا بەتەواوەتی بوونمان پێنەگەیشتبێت. بێگومان دەبێت لایەنی پێگەیشتنی فیزیاوی مرۆڤ پێش لایەنی پێگەیشتنی دەروونی مرۆ کەوتبێت. خۆ ڕەنگە سروشتی فیزیاوی

گەردوون شتێک بێت کە تەنها ڕوخسارێک بێت و هیچی تر، مادەیەکی پێویست بێت بۆ تێگەیشتن لە حیکمەتی ناواخنەکەی.
من مەزەنەیەکی شێتانەم لا گەڵاڵەبووە؛ کاتی خۆی 'نیوتن' لەپڕێکدا بۆیدەرکەوت کە هێزێکی ڕاکێشانی گەردوونی بوونی هەیە. شتێکی جوانە. 'داروین'یش بەهەمان شێوە لەناکاوێکدا هێندەی بۆ دەرکەوت کە گەشەکردنێکی بایۆلۆجی لەسەر ئەم زەویە ڕوویداوە. باشە، هەر زۆر باشە. ئینجا 'ئەنیشتاین' هات و پەیوەندیەکی لە نێوان 'مادە و وزە' و 'خێرایی تیشک'دا دۆزیەوە. هەر زۆر زۆر نایابە! وە لە ساڵی 1953دا 'کریک' و 'واتسۆن' سەلماندیان کە مۆلکیولی 'DNA'، واتە مادەی بۆماوەی ڕوەک و گیانەوەر، بە چ شێوەیەک هەڵچنراوە. هەر زۆر زۆر قەشەنگە! کەواتە ڕێشی تێدەچێت مەزەنەی ئەوە بکەین کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ـ جۆرج، ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێک دەبێت!ـ ڕۆحێکی پڕ لەحیکمەت بێت و لە ساتێکی بینینی ڕوندا مەتەڵی ئەم گەردوونە پڕنهێنیە هەڵبهێنێت. من خۆم لەو بڕوایەدام کە شتێکی ئاوها لەناکاوێکدا ڕوبدات (لەو ڕۆژەشدا زۆرم پێ خۆشدەبێت سەرنوسەری ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی بەناوبانگ بم!).
بیرت ماوە کە لە سەرەتای ئەم نامەیەدا وتم دەمەوێت پرسیارێکت ئاڕاستەبکەم؟ زۆر مەبەستمە بزانم بە چ شێوەیەک وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەیتەوە. بەڵام هێشتا شتم ماوە کە بۆتی باسبکەم.

تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ! ئەوە دیسان هاتەوە پێشەوە. لەوێدا دڵنیابووم کە پرسیارە گەورەکەی باوکم پەیوەندیەکی بە گەردوونەوە هەیە.
لەسەر جێگاکەم بەرزبوومەوە و لە پەنجەرەکەوە تەماشایەکی دەرەوەم کرد. هێشتا هەر بەفر دەباری. بەڵام لەدڵی خۆمدا وتم 'هیچ گرنگیەکی نیە'. چونکە تەنانەت ئەگەر هەموو ڕوی زەویش بە هەور

داپۆشرابێت، هێشتا تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ دەتوانێت وێنەی زۆر ورد و ڕونی گەلەهەسارەکانی تر بگرێت کە چەندەها ملیارد ساڵی تیشکی لە گەلەهەسارەی کاکێشانی خۆمانەوە دورن. بەدەر لەوەش تەلیسکۆبەکە شەو و ڕۆژ کاردەکات و وچانی نیە. تا ئێستاکە بەسەدان هەزار وێنەی بۆ ناردووینەتەوە و زیاتر لە دە هەزار تەنی ئاسمانی شیکردۆتەوە. بڕی ئەو 'داتا'یەی ڕۆژانە دەینێرێتەوە 'هارد دیسکی'کۆمپیوتەرێکی ئاسایی مالآن پڕدەکاتەوە.
بەلآم بۆچی باوکم دیسانەوە دەربارەی تەلیسکۆبەکەی ئاسمانی نوسیەوە؟ من لەوە تێنەدەگەیشتم، نەمدەزانی ئەو تەلیسکۆبە چ پەیوەندیەکی بە کچەی پرتەقالەوە هەیە؟ بەلآم ئەوە گرنگترین شت نەبوو. لەوە گرنگتر ئەوەبوو کە باوکم بەشێوەیەکی گشتی ئاگای لەو تەلیسکۆبە بوو. ئەو هێندە تێگەیشتبوو کە گرنگیەکی مەزنی بۆ مرۆڤایەتی هەیە. ئەو بەرلەوەی نەخۆشبکەوێت و بمرێت، فریای هێندە کەوتووە. ئەو تەلیسکۆبە دواهەمین شتبووە کە سەرقاڵی بووە.
چاوی گەردوون! من هەرگیز لەوەوبەر بەو شێوەیە بیرم لە تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ نەکردبۆوە. وەک پەنجەرەیەکی مرۆڤایەتی دەمبینی کە بەسەر گەردووندا دەیڕوانی. بەلآم لە ڕاستیدا هیچ زیادەڕۆییەک ناکەین گەر ئەو تەلیسکۆبەی ئاسمان بە 'چاوی گەردوون' ناوزەند بکەین.
لە کاتی خۆیدا خەڵکی لەرادەبەدەر سەرسامی یەکەمین هێڵی قیتاری نەرویجی نێوان 'ئۆسلۆ' و 'ئایدسفۆل' بوون، دەتوانین بڵێین کەمێک بەزیادەڕۆییەوە لێیان دەڕوانی. ژمارەی دانیشتوانی نەرویج لەیەک لەسەر هەزاری دانیشتوانی سەر زەوی تێناپەڕێت، وە لەوانەیە ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارانەی نێوان 'ئۆسلۆ' و 'ئایدسفۆل' لە ساڵی 1880دا یەک لەسەر دەی ئەو بەشەی پێک

هێنابێت. بەڵام لەگەڵ تەلیسکۆبەکەی هۆبڵدا هەموو دانیشتوانی سەر زەوی دەتوانن سەفەر بە ناو هەموو گەردووندا بکەن. شەش مانگێک بەر لەوەی باوکم بمرێت ئەو تەلیسکۆبەیان ناردە ئاسمان کە بەدەوری زەویدا بخولێتەوە، ئەو کاتە 2،2 ملیارد دۆلاری تێچووبوو. من حسابمکردووە گەر ئەو پارەیە بەسەر هەموو دانیشتوانی زەویدا دابەشبکەین، هەر کەسە و چوار کرۆنێکی بەردەکەوێت، ئەوەش بەبڕوای من بلێتێکی هەر زۆر هەرزانە بۆ ئەوەی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری هەموو گەردوون سەفەربکەیت. هەر بۆ بەراوردکردن ئەمڕۆکە بلیتێکی ئەم سەرو ئەو سەری نێوان دوو شاری 'ئۆسلۆ' و 'ئایدسفۆل' نزیکەی دوو سەد کرۆنە. من پێم وانیە هێندە هەرزان بێت، ئەگەر خەڵکی تریش هەمان بڕوای منیان هەیە، ئەوا دەتوانن سکاڵایەک ڕەوانەی سکەی قیتاری نەرویجی بکەن. (من مەبەستم نیە بەخراپە باسی سکەی قیتاری نەرویجی یان قیتارە بچکۆلە کۆنەکەی نێوان 'ئۆسلۆ' و 'ئایدسفۆل' بکەم. بەڵام من دەمەوێت بڵێم تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ گرنگترێکە بۆ مرۆڤایەتی، تەنانەت لەوانەیە بەلای جوتیارەکانی مەملەکەتی ڕۆمیشەوە گرنگ بێت. بەڕاستی زیادەڕۆیی نیە گەر بڵێین تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ چاوی گەردوونە. بەهەرحاڵ باوکم لەو بڕوایەدا نەبووە، بەمەرجێک هێندەشی نەبینی کە چاویلکەی نوێیان بۆدانا!)

ئەو نوسیبووی "تەلیسکۆبی هۆبڵ ئۆرگانی هەستیی گەردوونە"، وابزانم بەتەواوەتی لەمەبەستی تێدەگەم. تاڕادەیەک دەتوانین بڵێین ناردنی تەلیسکۆبی هۆبڵ بۆ ئاسمان هەنگاوێکی بچکۆلەبوو کە مرۆڤایەتی هەڵیهێنا، چونکە لە ساڵی 1990دا تەلیسکۆبێکی زۆر بەهێز و کەشتی ئاسمانیشمان هەبوو. بەڵام هاوکات هەنگاوێکی مەزن بوو کە گەردوون هەڵیهێنا! چونکە لەبنەڕەتدا هەر

لەبەرخاتری سەرتاپای گەردوونە کە مرۆڤایەتی هەوڵدەدات وەڵامی نهێنی گەردوون بدۆزێتەوە. نەلەوە زیاتر و نەکەمتریش! **گەردوون پێویستی بە پانزە ملیارد ساڵبووە بۆ ئەوەی بتوانێت شتێکی هێندە گرنگی وەک چاوێک بەرهەم بهێنێت کە لە ڕێگەیەوە بتوانێت خۆی خۆی ببینێت** (نزیکەی سەعاتێکم پێچوو تاوەکو ئەو ڕستەیەم نوسی، هەر لەبەرئەوەشە کە بەڕەش دەینوسم و دەریدەخەم!)
لەدڵی خۆمدا وتم "خەریکە نزیکدەبمەوە". بەپەلە دەستمکردەوە بە خوێندنەوە، هێندەی نەمابوو ببمە شاهیدی لەدایک بوونی خۆم. ئەوەم زۆر بەلاوە تایبەتی بوو. هەموو منداڵێک لە ئاهەنگێکی 'کۆکتێل'دا لەدایک نابن.
دە فەرموو بابە بەردەوام بە لەسەر چیرۆکەکەت. مەبەستم نەبوو قسەکانت پێببڕم. تۆ بویت کە پرسیارت دەربارەی تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ لێکردم و وتت چی بەسەرهاتووە، منیش ناچاربووم وەڵامت بدەمەوە.

**لە ئێستا بەدواوە دەبێت لە کورتی ببیڕمەوە، ناچارم وابکەم چونکە خەریکە کاتم نامێنێت. سبەینێ کارێکی گرنگم هەیە، لەبەرئەوە دایکت دەتباتە باخچەی ساوایان.**

**پێکەوە لە باڵەخانە بچکۆلەکەی ئادەمستووندا بۆ ماوەی چوار ساڵ پێکەوە ژیاین. فیرۆنیکا پەیمانگای هونەرە جوانەکانی تەواوکرد و وەک دەزانیت بەردەوامبوو لەسەر وێنە کێشان، بەرەبەرەش وەک مامۆستایەک دەستی بەکارکردن کرد _وانەی شێوە و ڕەنگی لە قوتابخانەیەکی دواناوەندیدا دەوتەوە. من خۆشم خوێندنەکەم**

تەواوکرد و بووم بەو شتەی کە پێی دەڵێن پزیشکی یاریدەدەر، واتە دەبوایە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە خەستەخانەیەکدا ئیشم بکردایە.
بێگومان تۆ خۆت دەزانیت کە نەنە و باپیرە لە شاری 'تۆینسبێرگ'دا لەدایکبوون. کتومت لەو سەردەمەدا دەیانویست خەونێکی کۆنیان بهێننە دی و لەکاتی خانەنشینیاندا بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ. ڕۆژێکیان لەپڕێکدا وتیان خانویەکی بچکۆلەی ڕۆمانسیمان لە 'نۆردبیو'دا کڕیوە. براکەشم، واتە مامە ئاینە، هێندە نەبوو کە پەیوەندی بە جیهانی دەریاوانیەوە کردبوو و بوو بوو بە دەریاوان، وابزانم هەر لەدەست خەفەتی ئەزموونێکی دڵداری تاڵ ڕایکردبوو. بەو شێوەیەش من و فیرۆنیکا گواستمانەوە بۆ خانوەکەی هوملەفای. بێگومان ناچاربووین قەرزێکی زۆری بۆ بکەین، بەڵام لەو کاتەدا داهاتێکی باشمان هەبوو.
یەکەمین ساڵ کە گواستمانەوە بۆ هوملەفای، دەستێکی باشمان بە باخچەکەدا هێنا. بێگومان هەردوو دار سێوەکەمان هێشتەوە، هێندە دەستکاری دار هەرمێکە و دار گێلاسەکەشمان نەکرد، هەر ئەوەندەبوو کە کەمێک لقە زیادەکانمان بڕی و نەختێک سەمادمان پێوەکردن. دەوەنی توترکەکەشمان وەک خۆی هێشتەوە، دڵیشمان نەهات دەوەنی ترێ ڕێویەکە و ڕێواسەکان و توترکەسورەکان ببڕینەوە. بەڵام گوڵە لەیلاق و گوڵە موعینی و هایدرانجیا[1]مان ڕوان. ئەو شتانە بە ئارەزووی فیرۆنیکابوو. من نزیکەی هەموو ژیانم لەو باخچەیەدا ژیابووم، بەڵام وا لەپڕێکدا ئەو بووە خاوەنی. لە ڕۆژە خۆشەکاندا کەرەسەی وێنەکێشانی دەبردە باخچەکەوە و وێنەی ئەو گوڵ و دارانەی دەکێشا کە لە باخچەکەدا سەوزدەبوون.

---

[1]هایدرانجیا؛ درەختێکە ڕەگەزێکی یابانی هەیە، گوڵی سور و پەمەیی دەگرێت، گەڵاکەی وەک دڵ وایە و پەڕەکەی لە کوپی ئاو دەچێت.و

کەرەتێکیان چووینە باخەکەوە کە توترک لێبکەینەوە، لەناکاودا هەنگێکی گەورە لەسەر گوڵە سێپەڕێکەوە بەرزبووەوە و بەخێراییەکی زۆر بەرەو ئاسمان فڕی. لەوێدا بیرم لەوە کردەوە کە هەنگێکی گەورە لە فڕۆکەیەکی جامبۆ خێراترێک دەفڕێت، هەڵبەتە بەپێی کێشی لەشە بچکۆلەکەی خۆی. ئەو باسەم لای فیرۆنیکا کردەوە و کەوتینە پێوانەکاریەکی سادە. وامانزانا کە کێشی هەنگێکی گەورە نزیکەی بیست گرامێک دەبێت و بەلایەنی کەمەوە دە کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا دەبڕێت. ئەوجا فڕۆکە جامبۆکە؛ فڕۆکەیەکی وا 800 کیلۆمەتر کە کاتژمێرێکدا دەبڕێت، واتە لەچاو هەنگێکی گەورەدا هەشتا جار خێراترێک دەفڕێت. بەڵام هەشتا کەرەت بیست گرام دەکاتە 1،6 کیلۆ. من و فیرۆنیکا گومانمان نەبوو کە فڕۆکەیەکی بۆینگی 747 کێشەکەی هەر زۆر زۆر لەوە زیاترێکە. لەبەرئەوە هەنگێکی گەورە بەپێی کێشی خۆی، لەچاو فڕۆکەیەکی جامبۆدا، چەندەها هەزار جار خێراتر دەفڕێت. جگەلەوەش فڕۆکەیەکی بۆینگی 747 چوار ماتۆڕی هەیە و هەنگی گەورە شتی وای نیە. هەنگێکی گەورە لە فڕۆکەیەکی پەروانەداری ساکار دەچێت! پێکەنین، هەردووکمان پێکەنینمان بەوە دەهات کە هەنگێکی گەورە دەتوانێت بەو خێراییە زۆرە بفڕێت، بەوەش پێدەکەنین کە لە شوێنێکدا دەژیاین کە پێیان دەوت 'هۆملەفای'، هۆملەفای واتە 'شەقامی هەنگی گەورە'.

فیرۆنیکا فێری ئەوەی کردم کە بەچاوێکی تیژەوە تەماشای وردەکاریە جوانەکانی سروشت بکەم، ئەو وردەکاریە بچکۆلانانەش لە ڕادەبەدەر زۆربوون. هەر بۆ نمونە گوڵێکی ئەنیمۆن یان گوڵە شەوبۆیەکمان لێدەکردەوە و تەماشامان دەکرد، بۆ چەند ساتێک لەو

پەرجووە بچۆکۆلانانە ورد دەبوینەوە. مەگەر جیهان ئەفسانەیەکی سەرسوڕهێنەر نەبێت؟

ئەمڕۆ، واتە لەم کاتەدا کە ئەم شتانە دەنوسم، دڵتەنگ دەبم کە بیر لەو هەنگە گەورەیە دەکەمەوە کە کاتی خۆی لەچەند ساتێکی کەمدا هەڵهات و فڕی، ئێمە ئەو پاشنیوەڕۆیە بۆ ئەوە چووبوینە باخەکەوە کە توتڕک لێبکەینەوە. جۆرج، ئەو کاتە ئێمە بەتەواوەتی خۆمان دابووە دەست ژیان، هەر زۆر بێ خەمبووین و بۆ هەموو شتێک کراوەبووین. ئومێدەوارم تۆش ئەو مێشکە کراوەیەت لە ئێمەوە بۆ مابێتەوە و بتوانیت ئەو نهێنیە بچکۆلانانە ببینیت، چونکە ئەو شتە وردانە لە ئەستێرە و گەلەهەسارەکانی ئاسمان کەمترێک مێشک ناوروژێنن. من پێموایە ئافراندنی هەنگێکی گەورە زیرەکیەکی زیاتری دەوێت وەک لە دروستکردنی کونێکی ڕەشی ئاسمان.

من هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە هەمیشە ئەم جیهانەم وەک جادوویەکی سەرنجڕاکێش بینیوە، تەنانەت زۆر پێش ئەوەی کە لە شەقامەکانی ئۆسلۆدا بکەومە سیخوڕیکردنی کچەی پرتەقاڵ. ئێستاش وا هەست دەکەم من شتێکی وەهام بینیوە کە کەسی تر چاوی پێنەکەوتووە. بۆم سەختە بتوانم بەچەند وشەیەکی سادە گوزارشت لەو هەستەم بکەم، بەڵام مەزەنەی ئەو کاتەی جیهان بکە کە هێشتا ئەو شتە مۆدێرنانەی وەک یاساکانی سروشت و تیۆری گەشەکردن و ئەتۆمەکان نەهاتبوونە ئاراوە، ئەو کاتە بهێنە بەرچاوت کە هێشتا باسی مۆلکویلی 'DNA' و کیمیای بایۆلۆجی و خانە دەماریەکان نەدەکرا.. بەڵێ، وێنای ئەو سەردەمە بکە کە هێشتا زەوی نەدەخولایەوە و نەبووبوە 'ئەستێرەیەکی' ئاسمان، مەزەنەی ئەو کاتە بکە کە هێشتا لەشی ئەم مرۆڤە لوتبەرزە دابەشنەکرابوو بەسەر دڵ و سی و گورچیلە و جگەر و مێشک و سوڕی

خوێن و ماسولکه و گەدە و ڕیخۆڵەدا. من باسی ئەو کاتە دەکەم کە مرۆڤ مرۆڤ بووە، مەبەستم لەوەیە کە مرۆڤێکی پڕاوپڕ و پڕشانازیبووە، نە هیچ شتێک زیاتر و نە کەمتریش. ئەو کاتە جیهان ئەفسانەیەکی پرشنگداربووە.
لەپڕێکدا ئاسکە کێویەک لەقەراغی دارستانەکەوە بەهەڵبەزودابەز دێتەدەرەوە، بۆ ماوەی چرکەیەک بەگوڕ تەماشات دەکات و دواتر بۆی دەردەچێت. چ ڕۆحێکە کە ئەو گیاندارە دەجوڵێنێتەوە؟ ئەو وزە پڕنهێنیە چیە کە ئەم زەویە بەگوڵ دەڕازێنێتەوە و هەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەی پێوە دیارە، ئەو وزە نادیارە چیە کە ئاسمانی شەو لەوێنەی نەخش ونیگارێکی مەزندا بەئەستێرەی پرشنگدار دەڕازێنێتەوە؟
وێنەی هەستکردنێکی ئاوها ڕاستەوخۆ و ڕون بۆ سروشت لە حەکایەتە میلیەکاندا دەیانبینینەوە، هەر بۆ نمونە لە حەکایەتی برایانی گریمسدا. جۆرج، ئەو حەکایەتانە بخوێنەرەوە. حەکایەتە ئیسلاندیە کۆنەکان بخوێنەرەوە. میتۆلۆژیای یۆنانی و وڵاتانی ئەسکەندەنافی کۆن بخوێنەرەوە. پەیمان نامەی کۆنیش بخوێنەرەوە. جۆرج، تەماشای دونیابکە، بەرلەوەی فیزیا و کیمیایەکی زۆر فێرببیت تەماشای دونیابکە.
"هاردەنگیرفیدا" بەناوبانگە بە ڕەشەباکەی، ئا لەم ساتەدا ڕەوەیەک 'ئاسکە ڕنە'ی کێوی بەوێدا تێدەپەڕن. ئێستاکە لەدوا مەنزڵی ڕوباری 'ڕۆنە'دا لە 'ئیلا دی لا کامارگیو'دا و لە نێوان هەردوو لقی ڕوبارەکەدا هەزارەها 'فلامینکۆ'ی ڕەنگ ئاڵ هێلانە دروستدەکەن. لە دەشتەکانی ئەفریقاشدا چەندەها ڕەوە ئاسکی لەشولار ناسک بەشێوەیەکی بێوێنە هەڵدەبەزنەوە. چەندەها هەزار بەتریق لە قەراغ دەریای 'ئەنتراکیس'دا بەرامبەر یەکتری وەستاون و

پێکەوە قسەدەکەن، نەک هەر خراپی ناگوزەرێنن، بەڵکو پێشیان خۆشە. بەلام لێرەدا تەنها ژمارەکان گرنگ نین. بۆ نمونە گاکێویەکی وریای تەنیا سەری لەدارستانە پرسنەوبەرەکەی 'ئیوستەلاند'ەوە دەردەهێنێت. ساڵێک لەمەوبەر یەکێکیان ڕێگەی لێتێکچوبوو و تا ناو هوملەفای هاتبوو. 'لیمینگ'ێکی لەترسا تۆقیو لەنێوان کۆڵەکەی ئەمبارەکانی 'فایستیولن'دا دێت و دەچێت. سەگێکی ئاوی قەڵەو بەسکدا خۆی فرێدەداتە ناو دەریاچە بچکۆلەکانی 'تیونسبێرگ'.

قەت پێم نەڵێیت کە سروشت پەرجوویەک نیە. قەت پێم نەڵێیت کە جیهان ئەفسانەیەک نیە. ئەو کەسەی لەژیانیدا لەوە تێنەگیشتبێت، ڕەنگە لە ساتەوەختی کۆتایی ئەفسانەکەدا لێی تێبگات. چونکە لەوێدا دواهەمین دەرفەتمان دێتە بەردەست کە چاوبەندەکەمان دامالین، دواهەمین بوارمان بۆ دەڕەخسێ کە لە سەرسامیدا چاومان هەڵگلۆفین، دواهەمین دەرفەتمان بۆ دێتە پێشەوە کە خۆمان بدەینە دەست ئەو پەرجووەی کە خەریکە ماڵئاوایی لێدەکەین و جێی دەهێڵین.

جۆرج، بڵێیت تۆ لەو شتە تێبگەیت کە من دەمەوێت دەریببڕم؟ هیچ کەسێک تا ئێستا بە قورگێکی پڕلەگریانەوە ماڵئاوایی نەکردووە لە زانستی ئەندازەی 'هێرقلید' یاخود لە سیستمی پۆلێنکردنی ئەتۆمەکان. کەس فرمێسک هەڵناڕێژێت بۆ جیابوونەوەی لە خشتەی لێکدانی ژمارەکان یان بۆ جیابوونەوەی لە ئینتەرنێت. جیهانە کە ماڵئاوایی لێدەکەین، خواحافیزی لە ژیان و ئەفسانە دەکەین. هەڵبەتە ماڵئاواییشە لەو کۆمەڵە کەسە کەمەی کە خۆشمان دەوێن.

هەندێ جار ئاواتەخوازبووم لەو کاتەدا بژیابامایە کە هێشتا خشتەی لێکدانی ژمارەکانیان نەدۆزیبووەوە، یان بەلایەنی کەمەوە بەرلەوەی کیمیا و فیزیای مۆدێرن بێنە ئاراوە، چونکە ئێستاکە وا خۆمان

دەردەخەین کە لە هەموو شتێک تێگەیشتبین _مەبەستم لە جیهانی پڕلەجادووی ڕاستەقینەیە! بەڵام ڕێک لەم ساتەدا کە بەرامبەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە دانیشتووم و ئەم دێڕانەت بۆ دەنوسم، ژیانم لەناو جیهانێکی پڕلەجادووی ئاوهادا دەبینم. من خۆم کەسێکم کە ئەهلی زانستم و نکۆڵی لە هیچ زانستێک ناکەم، بەڵام هاوکات بینینێکی ڕۆحیشم بۆ ژیان هەیە، بگرە تاڕادەیەک تێڕوانینێکی 'ئەنیمیسیتیسک'[1]م هەیە. من هەرگیز پێموانەبووە کە نیوتن یان داروین پەردەیان لەسەر خودی نهێنی ژیان هەڵماڵیبێت (ئەگەر وشەیەکت توشبوو و لێی تێنەگەیشتیت، بڕۆ سەیرێکی فەرهەنگە گەورەکە بکە. فەرهەنگێکی گەورەی مۆدێرن لە ژوری دانیشتنەکەدایە. بەڕاست.. لەکاتی ئێستادا کە ئەم شتانە دەنوسم فەرهەنگێکی وامان هەیە، بەڵام ڕەنگە ئێستاکە بەلای تۆوە یەکجار هێندە مۆدێرن نەبێت)

با نهێنیەکت پێبڵێم؛ من بەر لەوەی دەستبکەم بە خوێندنی پزیشکی، دوو شتی ترم لە خەیاڵدابوو؛ دەمویست یان ببمە نوسەر، واتە کەسێک کە بە وشە گوزارشت لەم ژیانە پڕلەجادووە دەکات کە تێیدا دەژین، پێم وابێت لەوەوپێش باسی ئەوەم بۆ کردیت. یاخود دەمویست ببمە پزیشک، واتە کەسێک کە خزمەتی ژیان دەکات. هەروا بۆ دڵنیایی خۆم لە پێشدا بڕیارمدا ببمە پزیشک.

ڕاستە من فریا نەکەوتم ببمە نوسەر، بەڵام هێندە دەرفەتم بۆ ڕەخسا کە ئەم نامەیەت بۆ بنوسم.

زۆرم پێخۆشبوو کە لە خەستەخانەوە دەهاتمەوە و کچەی پرتەقاڵم دەدی لەناو باخەکەماندا خەریکی وێنەکردنی گوڵە گێلاسێکبوو،

---

[1] تێڕوانینێکە کە پێیان وایە هیچ شتێکی بێ ڕۆح بوونی نیە.و

هەردەتوت خەونێکی گەورەی ژیانم هاتۆتە دی. ڕۆژێکیان هاتمەوە ماڵەوە و لە باخچەکەدا بینیم، لە خۆشیاندا کردمە باوەشم و تا ژوری نوستنەکەی سەرەوە دامنەنا. پێکەنی، ئای کە پێکەنی! ئینجا لەسەر جێگای خەوەکە پاڵمخست و فریومدا کە پێکەوە بخەوین. من پێم شەرم نیە باسی ئەم لایەنی ئاسودەییەشت بۆ بکەم کە تێیدا دەژیاین. بۆ شەرم بکەم؟ ئەوە وەک پەتێکی سور خاڵێکی سەرەکی و دیاری ئەم چیرۆکەیە.

هەر دوای یەک دوو مانگێک کە خانوەکەمان نوێکردەوە، بڕیارماندا بەهیچ شێوەیەک ڕێگە لە منداڵبوون نەگرین. ئێمە هەر لە یەکەمین شەوەوە کە لەو خانوەدا بردمانەسەر، ئەو بڕیارەماندا. لەو شەوەوە دەستمانکرد بە دروستکردنی تۆ.

بەوشێوەیەش جۆرج کە تۆ لەدایکبوویت، ساڵ و نیوێک بوو کە گواستبوومانەوە هوملەفای. زۆر شانازیم بەخۆمەوە دەکرد کە یەکەمین کەڕەت تۆم کردە باوەشم. وەک کوڕێک لەدایک بوویت، وابزانم گەر کچبوویتایە ناومان دەنایت 'ڕانفی'. خۆت دەزانیت لەیەکێک لە خەیاڵەکانمدا ئەوە ناوی کچە بچکۆلەکەی کچەی پرتەقاڵبوو.

فیرۆنیکا هیلاک و ماندوو و ڕەنگ پەڕیووبوو لەدوای منداڵبوونەکەی، بەڵام خۆشبەختبوو. وابزانم نەدەکرا لە هێندە زیاترێک ئاسودەبین. لەوێوە ئیدی سەردەمێکی نوێ دەستیپێکرد و کۆمەڵێک یاسای تازە هاتە ئاراوە.

دەمەوێت لەم بارەیەوە نهێنیەکت بۆ بگێڕمەوە. لەو خەستەخانەیەدا هاوەڵێکی پزیشکی خۆمی لێبوو. کە تۆ لەدایک بوویت شەمپانیای بۆ من و دایکت هێنایە ناو قاوشەکەوە. هەڵبەتە ئەوە ڕێگەی پێنەدەدرا، بگرە هەر زۆر قەدەغەش بوو. بەڵام پەردەی ئەو

پەنجەرەیەمان دادایەوە کە بەسەر مەمەرەکەدا دەیڕوانی، هەر سێکمان بە خۆشی ئەو ژیانە نوێیەی کە تۆ دەستتپێکردبوو، پەرداخێک شەمپانیمان نۆشکرد. بێگومان شەمپانیامان نەدا بە تۆ، بەڵام هەر زوو تۆمان خستە بەر مەمکی فیرۆنیکا، ئەو زۆری نەخواردبووەوە بەڵام بەلایەنی کەمەوە یەک دوو قومی بچکۆلەی فڕکردبوو.

کاتی خۆی کە کچەی پرتەقاڵ بۆ بەرێکردنم لەگەڵمدا هاتە فرۆکەخانەکەی ئیشبیلیا، چاومان بە کۆترێکی سپی مردارەبوو کەوت، لەسەر ئاوەڕۆی تەنیش شەقامەکەدا کەوتبوو. ئەوە نیشانەیەکی شوومبوو. لەوانەشە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە من پەیڕەوی هەموو یاساکانی حەکایەتەکەم نەکرد.
ئەوەت لە یادە کە لە جەژنی 'پاک'دا چووین بۆ خانوە هاوینەکەمان؟ ئەو کاتە تۆ تەمەنت نزیکەی سێ ساڵ و نیوبوو. بەڵام بێگومان هیچ شتێکی ئەو کاتەت بیرنەماوە. قوتابیانی بەشی پزیشکی کەمێک دەروونناسیش دەخوێنن. زۆر دەگمەنە ئەو شتانەمان بیربکەوێتەوە کە لە پێش تەمەنی چوار ساڵیماندا ڕویانداوە.
لەیادمە من و تۆ پاڵمان بەدیوارەکەوە نابوو، پرتەقاڵێکمان لەت کردبوو و یەکی لەتێکیمان دەخوارد. بیرمە فیرۆنیکا بە کامێرەی فیدیۆکە ئەو دیمەنەی گرت. دەتووت هەستیکردووە کە شتێک بەرەو کۆتایی دەچێت. بەیارمەتیت لێی بپرسە و بزانە ئەو کاسێتەی نەماوە؟ ڕەنگە پێی خۆشنەبێت کە نیشانت بدات، بەڵام لەگەڵئەوەشدا تۆ هەر پرسیاری لێبکە.
لەدوای جەژنی 'پاک'ەوە بۆمدەرکەوت کە زۆر بە قورسی نەخۆشم. فیرۆنیکا باوەڕی پێنەدەکردم، بەڵام من خۆم هیچ گومانێکم نەبوو.

لەلێکدانەوەی نیشانەدا کۆڵێک زیرەکم. هەروەها لەدەست نیشانکردنی نەخۆشیشدا کارامەم.
دواتر چوومە لای برادەرێکی پزیشکم، بەڕاست.. هەر ئەو کوڕەبوو کە کاتی خۆی لە ڕۆژی لەدایکبوونی تۆدا شەمپانیاکەی بۆ هێنایین. لەپێشدا چەند تاقیکردنەوەیەکی خوێنی بۆکردم و دواتر سۆنەرێکی 'CT'بۆ کردم، هەڵبەتە ئەو سۆنەرە جۆرە شێوەیەکی ئەشیعەیە. پاشان ئەویش گەیشتە هەمان ئەنجام، هەردووکمان کتومت هەمان بڕوامان هەبوو.
لەوێوە ئیدی ڕۆژانێکی تەواو نوێ سەریان هەڵدا. نەخۆشیەکەم کارەساتێک بوو، هەم بۆ من و هەم بۆ فیرۆنیکاش، بەڵام ناچاربووین هەتا بکرێت تۆ لە مەودای ئەو کارەساتە دوربخەینەوە. دیسانەوە لەناکاوێکدا کۆمەڵێک یاسای نوێمان بەسەردا درا و دەبوایە پەیڕەویمان بکردنایە. کۆمەڵێک وشەی وەک تاسە و سەبر و بیرکردن بەتەواوەتی مانایەکی تریان دەبەخشی. چیتر نەماندەتوانی پەیمان بەیەکتری بدەین کە هەموو ڕۆژێکی ساڵی داهاتوو پێکەوەبین. نەماندەتوانی پەیمانی هیچ شتێک بەیەکتری بدەین. لەپڕێکدا ماتەمینیەکی قورس دایگرتین و هەستماندەکرد زۆر ڕوت و ڕەجاڵین. یەک و دوو ڕاناوی شیرینی 'ئێمە' قڵیشێکی گەورەی تێکەوت. چیتر نەماندەتوانی داوای هیچ شتێک لەیەکتر بکەین، چیتر نەدەکرا هیوای ڕۆژانی داهاتوو پێکەوە دابەشبکەین.

لەپاش خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕانە، کەمێک ئاشنای چیرۆکی ژیانی من دەبیت. لایەنی کەم دەزانیت من چ کەسێکم، هەرئەوەش خۆی لە خۆیدا دڵشادم دەکات.

بەو شێوەیەش لەچاو زۆربەی ئەو کەسانەدا کە منیان ناسیوە، تۆ باشترێک من دەناسیت، هەرچەندە لەو کاتەوەی کە تەمەنت کەمێک لەخوار چوار ساڵەوەبوو، من و تۆ ڕاستەوخۆ پێکەوە قسەمان نەکردووە. من لەم نامەیەدا زۆر بەڕاشکاوی باسی خۆمم بۆت کردووە، هەمیشە لەگەڵ خەڵکانی تردا ئاوها قسەم نەکردووە. بێگومان لەوەش تێدەگەیت کە کاتی خۆی چەندە بەلای منەوە سەختبووە کە بەزۆرەملێ یاسا نوێکان پەسەند بکەم. من خۆم زۆر بەباشی دەمزانی ڕێگاکەم بەرەو کوێوە ملدەنێ و ناچاربووم هێدی هێدی خۆم لەسەر ئەوە ڕابهێنم کە بەڕاستی لەماوەی داهاتوودا تۆ و فیرۆنیکا بەجێدەهێڵم.

بەڵام جۆرج، پرسیارێک مێشکی وشیووم و زۆرم پێخۆشە ئاڕاستەتی بکەم. وابزانم چیتر خۆم پێڕاناگیرێت. بەڵام با لە پێشدا باسی ئەو شتەت بۆ بکەم کە چەند حەفتەیەک لەمەوبەر لێرە لە هوملەفایدا ڕویدا.

فیرۆنیکا هەموو پێش نیوەڕوانێک دەچێتە قوتابخانە، لەوێ خوێندکارە گەنجاکەن فێری وێنەکێشانی پرتەقاڵ دەکات. من خۆم داوالێکرد کە بەدرێژایی ڕۆژەکە لەماڵەوەدا لەلام نەمێنێتەوە. ئێمە نانی بەیانیان پێکەوە دەخۆین، ئینجا من تۆ دەبەمە باخچەی ساوایان. دواتر چەند سەعاتێک بە تەنها دەمێنمەوە، لەبەردەم کۆمپیوتەرەکەی ژوری دانیشتندا دادەنیشم و ئەم نامە دوورودرێژەت بۆ دەنوسم. زۆرجار بۆئەوەی پێ لە پارچەی شەمەنەفەرە تەختەینەکەت نەنێم، ناچارم بەزورەکەدا بە بازبازۆکێ هەنگاوبنێم. خۆ ئەگەر جێگۆڕکێمان بە پارچەیەکی بکردبایە، یەکسەر هەستت پێدەکرد.

تاوناتاوێک ناچارم لەماوەی ئەو چەند سەعاتەدا پاڵکەوم و سەرخەوێک بشکێنم، بەڵام نەک لەبەرئەوەی کە ئازارم هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە شەوانە پەرێشانم و ئارامیم لەبەر براوە. شەوان بیرکردنەوەکان وروژمم بۆ دێنن و بەتەواوەتی لەتوپەتم دەکەن. ڕێک لەو کاتانەدا کە پاڵدەکەوم و دەمەوێت بخەوم زۆر بەقوڵی هەموو ئەو مەتەڵە غەمگینانە دەبینم، زۆر بەقوڵی ئەو حەکایەتە ناپۆڵایە دەبینم کە هیچ پەریەکی میهرەبانی تێدا نیە، تەنها پڕە لە نیشانەی شوم و دێو ودرنج و ڕۆحی تۆقێنەر. لەبەرئەوە باشترێکە بەشەو نەخەوم و لەبری ئەوە هەموو ڕۆژێک بەیانیان کە دونیا ڕوناکە لەسەر قەنەفەکە سەرخەوێک دەشکێنم.

من ئەو خەو زڕانەم بەلاوە سەخت نیە، چونکە دەزانم تۆ و فیرۆنیکا لە ماڵەوەن و هەردووکتان خەوتوون. هێندەش دەزانم گەر بمەوێت دەتوانم فیرۆنیکا خەبەربکەمەوە. جارجارێک خەبەری دەکەمەوە و بەدیارمەوە دادەنیشێت. چەند کەڕەتێکی کەمیش هەردووکمان بەدرێژایی شەو پێکەوە دانیشتوین و ڕۆژمان کردۆتەوە. لەو شەوانەدا هێندە قسەمان نەدەکرد. هەر ئەوەندەبوو کە پێکەوە دادەنیشتین و هیچی تر. چایەکمان لێدەنا و پارچە نانێکمان بە قاژێک پەنیرەوە دەخوارد. ژیانمان بەو شێوەیەبوو جۆرج. یاسا نوێکان بەو جۆرە بوون.

ئێمە دەتوانین بۆ ماوەی چەندەها کاتژمێر دانیشین و دەستی یەکتر بگرین. هەندێجار تەماشایەکی دەستی دەکەم. زۆر نەرم و جوانە. سەیری دەستی خۆشم دەکەم، تەماشای پەنجەیەک یان نینۆکێکی خۆمدەکەم و لەدڵی خۆمدا دەڵێم 'ئاخۆ تا کەی ئەم پەنجەیەم هەبێت؟'. هەندێجاریش دەستی بەرزدەکەمەوە بۆ لای لێوم و ماچیدەکەم.

نیازمە دەستی ئەو هەتا دواهەمین چرکە لەناودەستمدا بێت، ڕەنگە لەو کاتەدا دەستی بگرم کە لە خەستەخانە دەکەوم، پێدەچێت ڕێک هەتا ئەو کاتەی لەدواجاردا دەستم شلدەبێت و دەستی بەردەدەم، بۆ ماوەی چەندەها و چەندەها سەعات دەستی لەناو دەستما بێت. هەردووکمان هەر لە ئێستاوە لەسەر ئەوە ڕێک کەوتووین کە بەو شێوەیە بێت، ئەویش خۆی پەیمانی داومەتێ. من ئەوەم بەلاوە خۆشە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هێندە ناخۆشە کە ناتوانم بە وشە دەریببڕم. ئەو کاتەی کە دەست لەم گەردوونە بەردەدەم، دەستی گەرم و پڕلەژیانی کچەی پرتەقاڵ بەردەدەم.

جۆرج.. مەزەنەی ئەوە بکە لەلاکەی تریشدا دەستێک هەبوایە و بمانتوانیبایە بیگرین! بەڵام من لەو بڕوایەدا نیم لایەکی تر بوونی هەبێت. تاڕادەیەکی زۆر دڵنیام لەوە. ئەو شتانەی کە بوونیان هەیە، هەتا ئەو کاتە دەمێننەوە کە هەموو شتێک کۆتاییان پێدێت. بەڵام زۆرجار دەستێکی تر دواهەمین شتە کە دەستمانی پێوەیە.

لەوەوپێش نوسیبووم 'هێندەی من بزانم پێکەنین یەکێکە لەو شتانەی کە زۆر ساریە'. پێدەچێت دڵتەنگیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بچێت. بەڵام ترس و دڵەڕاوکێ شتێکی جیاوازە. هەروا بە ئاسانی هەروەک پێکەنین و دڵتەنگی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ناچێت و هەروەک خۆی دەمێنێتەوە. ترس و دڵەڕاوکێ تا ئەندازەیەکی یەکجار زۆر لەلای خۆمان دەمێنێتەوە.

جۆرج، من دەترسم.. لەوە دەترسم لەم جیهانە بکرێمە دەرەوە. لە چەند ئێوارەیەکی وەک ئەم ئێوارەیە دەترسم کە ڕێگەم پێنادرێت بیان بینم.

بەڵام شەوێکیان تۆ خەبەرت بووەوە.. بەڕاست خۆ من ویستم باسی ئەوەت بۆ بکەم. من لەبەرهەیوانەکە دانیشتبووم، لەپڕێکدا بینیم بە هێواشی لە ژورەکەتەوە هاتیتە دەرەوە و خۆتکرد بەژوری دانیشتندا. چاوێکت بۆ هەڵگلۆفی و تەماشایەکی چواردەورەکەت کرد. بەشێوەیەکی ئاسایی کە خەبەرت دەبووەوە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتیت و دەهاتیتە ژوری نوستنەکەی ئێمە. بەڵام ئەو شەوە لە ژوری دانیشتنەکەدا وەستایت، وابزانم هەر لەبەرئەوە بوو کە ئەو هەموو گلۆپەت بەداگیرساوی بینی. هاتمە ژوری دانیشتنەکەوە و لەباوەشما دامنایت. تۆ وتت 'خەوم لێناکەوێت'، من و دایکت جارجارێک دەمانوت 'بابە خەوی لێناکەوێت'، پێم وابێت تۆش لاسایی ئەوەت دەکردەوە.

لێت ناشارمەوە لەوێدا کەبینیم خەبەرت بۆتەوە و هاتیت بۆلای من هەستم بە خۆشیەک کرد کە ناتوانم وەسفیبکەم، ڕێک لەو کاتەدا هاتیت کە لەڕادەبەدەر پێویستیم پێت بوو. هەر لەبەرئەوە هیچ هەوڵمنەدا کە بتخەمەوە ناو جێگا.

زۆرم حەزدەکرد باسی هەموو شتێکت بۆ بکەم، بەڵام زۆر باشیش دەمزانی کە ناتوانم، چونکە تۆ زۆر بچکۆلەبوویت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێندە گەورەبوویت کە دڵنەواییم بدەیتەوە. گەر هەر ئەوەندە بتتوانیبایە بەخەبەربیت و خەوت لێنەکەوتایە، پێم خۆشدەبوو ئەو شەوە چەند سەعاتێک لەگەڵتدا دابنیشم. یەکێک بوو لەو شەوانەی کە دامنابوو فیرۆنیکا خەبەربکەمەوە. گەر تۆ بتوانیبایە، وازم لەو دەهێنا بۆ خۆی بخەوتایە.

ئەو شەوە ئاسمان سافبوو، هەر لە بەرهەیوانەکەوە ئاسمانی پڕئەستێرەم دەدی. لە نیوەی دووهەمی مانگی هەشتدابووین و وابزانم لەوەوپێش هەرگیز ئاسمانی پڕ ئەستێرەت نەدیبوو، بەلایەنی

کەمەوە لەشەوانی ڕوناکی ئەو هاوینەدا نەتدیبوو و ساڵی پێشووتریش هەر زۆر وردبوویت. بلوسێکی گەرم و پانتۆڵێکم لەبەرکردیت و خۆشم قەمسەڵەیەکم لەبەرکرد. ئەوجا من و تۆ چوینە بەرهەیوانەکە بۆی دانیشتین. گڵۆپی ژورەوەم کوژاندبۆوە، پاشئەوەی کە چووینە بەرهەیوانەکە گڵۆپەکانی دەرەوەشم کوژاندەوە.
لەپێشدا ئاماژەم بۆ مانگ کرد، هەروەک دەمی چەقۆیەک تەنک دەهاتە بەرچاو. لەلای ڕۆژهەلاتەوە لەخواروی ئاسمانەوە دیاربوو. ڕوی بەلای ڕاستدا وەرچەرخاندبوو، واتە مانگی پڕنەبوو. من ئەوانەم بۆ باسکردیت.
لەسەر باوەشم دانیشتبوویت و هەموو ئەو ئارامیەی چواردەورت بۆ خۆت هەڵدەمژی، منیش لەو ئارامیەم خواردەوە کە لە تۆوە بەلێشاو دەهاتە دەرەوە. دواتر پەنجەم بۆ هەموو ئەستێرە و هەسارەکانی ئاسمان ڕاکێشا. هەر زۆرم پێخۆشبوو باسی هەموو شتێکت بۆ بکەم، باسی ئەو حەکایەتە گەورەیەت بۆ بکەم کە ئێمەش بەشداربووین تێیدا، پێمخۆشبوو باسی ئەو وێنە مەزنەت بۆ بکەم کە من و تۆ دوو بەشی هەر زۆر زۆر بچکۆلەیمان پێکدەهێنا. ئەو حەکایەتەش هەندێ یاسا و ڕێسای خۆی هەیە، کە ناتوانین لێیان تێبگەین، هەندێ لەو یاسایانەمان پێخۆشە و هەندێکی تریانمان بەلاوە خۆش نیە، بەلام لە هەموو بارێکدا ناچارین قبوڵیان بکەین.
من دڵنیابووم و دەمزانی پاش ماوەیەکی کەم دەبێت بەجێت بهێڵم، بەلام نەمدەتوانی ئەوەت پێبڵێم. من دەمزانی کە خەریکبوو لە تەواوی ئەو حاکایەتە گەورەیەدا دەهاتمە دەرەوە کە من و تۆ ڕێک لەو کاتەدا تەماشامان دەکرد، بەلام نەمدەتوانی ئەوەت لەلا بدرکێنم. لەبری ئەوە باسی ئەستێرەکانم بۆ کردیت، لەسەرەتادا بەشێوەیەک باسمکرد کە تۆ لێی تێبگەیت، بەلام هێندەی نەبرد

کەوتمە گەرمەی باسەکەوە و نەختە نەختە بەڕاشکاوی کەوتمە باسکردنی گەردوون، هەر ڕێک دەتوت بۆ کوڕێکی گەورە قسەدەکەم. جۆرج، تۆ ڕێگەت پێدام قسەبکەم. پێتخۆشبوو کە ئەو شتانەت بۆ باسبکەم، هەرچەندە نەتدەتوانی هەموو ئەو نهێنی و مەتەڵانە لێکبدەیتەوە کە من باسم دەکردن. ڕەنگە برێکی زیاتر تێگەیشتبیت وەک لەوەی من مەزەندەم دەکرد. بەهەرحاڵ نە قسەکانت پێبڕیم و نە خەویشت لێکەوت. وادەهاتە بەرچاوم کە ڕێک لەو شەوەدا هێندەت دەزانی کە نابێت پشتم لێهەڵماڵیت. وابزانم هەستت بەوەدەکرد کە لە بنەڕەتدا من لەلات دانەنیشتووم بۆ ئەوەی ئاگام لێت بێت، بەڵکو تۆ بەدیار منەوە دانیشتبوویت. تۆ ئاگات لە من بوو. پێموتیت ئێستاکە شەوە، چونکە گۆی زەوی بەدەوری تەوەرەی خۆیدا دەخولێتەوە و لەم کاتەدا پشتی لە خۆر کردووە. دواتر بۆم ڕونکردیتەوە و وتم تەنها لەو کاتانەدا کە خۆر هەڵدێت یان ئاوادەبێت هێندە دەبینین کە زەوی دەخولێتەوە. وابزانم لەوە تێگەیشتیت، هەرچەندە جارجارێک ئێواران گۆرانیەکمان دەوت کە شیعرەکەی بەم شێوەیە دەستی پێدەکرد؛ "ئێستاکە خۆر چاوی دەنوقێنێت، پاش ماوەیەکی تر منیش چاوم دەنوقێنم.. ئەو گۆرانیەت لەیاد ماوە؟

پەنجەم بۆ ئەستێرەی فینۆس ڕاکێشا و وتم ئەو ئەستێرەیەش هەر کتومت وەک زەوی لە خولگەیەکدا بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە. لەو کاتەی ساڵدا فینۆس لەلای ڕۆژهەلاتەوە لەخوارووی ئاسماندا دەبینرێت، چونکە لەو کاتەدا بەهەمان شێوەی زەوی تیشکی خۆری بەردەکەوێت. ئەوجا نهێنیەکم لا درکاندیت و وتم هەموو کەرەتێک کە تەماشای فینۆس دەکەم بیر لە فیرۆنیکا دەکەمەوە، چونکە فینۆس وشەیەکی کۆنە و مانای خۆشەویستی دەبەخشێت.

دواتر شتی ترم بۆ ڕونکردیتەوە و وتم هەموو ئەو خاڵە پرشنگدارانەی کە لە ئاسماندا دەیانبینین ئەستێرەی ڕاستەقینەن و ئەوانیش هەروەک خۆر ڕوناکی پەخشدەکەنەوە، چونکە هەر یەکێک لەو ئەستێرە بچکۆلانەی ئاسمان خۆرێکی ئاگرینە. دەزانیت لەوێدا تۆ وتت چی؟.. وتت؛ "بەڵام تیشکی ئەستێرەکان ڕەنگی پێستمان قاوەیی ناکەن".

ئەو هاوینە زۆر گەرمبوو جۆرج، ناچاربووین لەشت بە کرێمی باش چەوربکەین بۆ ئەوەی لە تیشکی خۆر بتپارێزین. من تۆم نوساند بە خۆمەوە و بەچرپەچرپێک وتم "ئاخر لەبەئەوەیە کە ئەستێرەکان هەر زۆر زۆر لێمانەوە دورن".

ئالەم کاتەدا کە دانیشتووم و خەریکی نوسینم، تۆ بە ژورەکەدا دەخولێیتەوە و شتێکی نوێ بەشەمەندەفەرە تەختەینەکەت دروستدەکەیت.

لەدڵی خۆمدا دەڵێم "ئەمە پیشەی ڕۆژانەیە، ئەمە هەقیقەتە، بەڵام هاوکات دەرگای چوونەدەرەوە لەو هەقیقەتە بەتەواوەتی کراوەتەوە و خراوەتە سەرپشت".

چەندە زۆرن ئەو شتانەی کە دەبێتماڵئاواییان لێبکەین! لەدوای خۆمانەوە لەڕادەبەدەر شتی زۆر بەجێدەهێڵین.

کەمێک لەوەوپێش هاتیتە لامەوەو وتت "ئەوە چی لەسەر کۆمپیوتەرەکە دەنوسیت؟" منیش لەوەڵامدا وتم "نامەیەک بۆ برادەرێکی هەرە ئازیزی خۆم دەنوسم".

وابزانم بەلاتەوە سەیربوو کە بە ماتەمینیەکەوە وتم نامەیەک بۆ برادەرێکی هەرە ئازیزم دەنوسم، لەبەرئەوە وتت؛ "نامە بۆ دایە دەنوسیت؟".

دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم سەرێکم بۆ ڕاوەشاندیت و وتم؛ "دایە دەستگیران و خۆشەویستی منە.. برادەری ئازیز و دەستگیران دوو شتی جیاوازن"

ئەوجا پرسیت؛ "ئەی من چی تۆم؟"

منت کرد بەتەڵەوە. بەرزمکردیتەوە و لەباوەشمدا بەرامبەر کۆمپیوتەرەکە دامنایت، نوساندمیت بە سنگمەوە و وتم "تۆ ئازیزترین برادەری منیت".

خۆشبەختانە لەوەندە زیاتر هیچ پرسیارێکی ترت نەکرد. وابزانم باوەڕت نەدەکرد کە نامەکە بۆ تۆ بێت. منیش بەلامەوە سەیربوو وێنەی ئەو ڕۆژە بهێنمە بەرچاوم کە تۆ ئەم نامەیەی تێدا دەخوێنیتەوە.

کات جۆرج.. کات چیە؟

هەرچەندە سور دەمزانی کە چیتر لە وشەکانم تێناگەیت، بەڵام من بەردەوامبووم لەسەر قسەکانم.

وتم "تەمەنی گەردوون هەر زۆر زۆرە، ڕەنگە پانزە ملیارد ساڵ ببێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستاکە هیچ کەسێک سەر لەوە دەرناکات کە بە چ شێوەیەک هاتۆتە بوون. ئێمە هەموومان لە یەک ئەفسانەی گەورەدا ژیانمان بەسەردەبەین و کەسمان پەی بە نهێنیەکانی نابەین. ئێمە لە جیهانێکدا سەمادەکەین و یاریدەکەین و قسەدەکەین و پێدەکەنین، بەڵام هیچمان نازانین بە چ شێوەیەک سەریهەڵداوە". ئینجا وتم "ئەو سەما و یاریکردنە مۆسیقای ژیانە. لە هەموو شوێنێکدا دەیبینیت کە مرۆڤی تێدابێت، هەروەک توتەتوتی تەلەفون وایە، لە هەموو تەلەفونەکانی دونیادا هەیە.

کەمێک سەرت بردە دواوە و تەماشایەکت کردم. بەلایەنی کەمەوە لەوەدەچوو لە باسی توتەتوتی تەلوفونەکە تێگەیشتبیت، چونکە زۆر کەیفت لەوە دەبینی تەلەفونەکە هەڵبگریت و گوێ لەو دەنگە بگریت.

دواتریش جۆرج.. دواتریش پرسیارێکم لێکردیت و هەر هەمان ئەو پرسیارەیە کە دەمەوێت ئێستاکە ئاڕاستەی تۆی بکەمەوە، چونکە ئێستا دەتوانیت بەڕاستی لێی تێبگەیت. هەر بەهۆی ئەو پرسیارەوەبوو کە ئەم چیرۆکە دورودرێژەی کچەی پرتەقاڵم بۆ گێڕایتەوە.

وتم؛ "وێنای ئەوەبکە کە کاتی خۆی چەند ملیارد ساڵێک لەمەوبەر، ئەو کاتەی کە هەموو شتێک ئافەریدەکرا، تۆ لەبەردەم ئەم حەکایەتەدابوویتایە. مەزەندەی ئەوە بکە کە بڕیاری لەدایکبوونت بۆ ناو ژیانی ئەم سەر زەویە لەدەستی خۆتدا بوایە. نە دەزانیت کەی دەژیت و نە دەشزانیت بۆ ماوەی چەندێک دەژیت، بەڵام لە هەموو بارێکدا ماوەی ژیانت لە چەند ساڵێک زیاتر تێناپەڕێت. تەنها ئەوەندە دەزانیت ئەگەر بڕیاربدەیت ڕۆژێک لە ڕۆژان بێیتە ناو ئەم ژیانەوە (یان وەک دەڵێن کە 'کات پڕدەبێت' یاخود 'لە کاتی خۆیدا لەدایک ببیت)، دەبێت بەناچاری ڕۆژێک لە ڕۆژانیش هەموو شتێک بەجێبهێڵیت. پێیدەچێت ماتەمینیەکی گەورە داتبگرێت، چونکە خەڵکانێکی زۆر پێیان وایە ژیانی ناو ئەو حەکایەتە گەورەیە هەر زۆر زۆر خۆشە، تەنانەت بە بیرکردنەوە لەوەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت بەجێیبهێڵن فرمێسک بەچاویاندا دێتەخوارەوە. ڕەنگە سەرتاپای شتەکانی ژیان باش و نایاب بن، ئەو کاتە هەر بیرکردنەوە لەوەی کە ڕۆژانی تری بەدوایدا نایەت، لەڕادەبەدەر ئازارت دەدات".

زۆر بەبێدەنگی لەسەر کۆشم دانیشتبوویت، دواتر وتم؛ "ئەو کاتە کامیانت هەڵدەبژارد جۆرج؟ مەبەستم لەوەیە ئەگەر هێزێکی وا گەورە هەبوایە و ئەو هەڵبژاردنەی بخستایەتە دەستی خۆتەوە؟ خۆ دەتوانین لە حەکایەتێکی وا گەورە و پڕنهێنیدا مەزەنەی فریشتەیەکی گەردوونی بکەین. بەڵام تۆ ژیانی سەر ئەم زەویەت هەڵدەبژارد؟ گەر ژیانت کورت بوایە یان درێژ؟ گەر سەد هەزار ساڵ بوایە یان سەد ملیۆن ساڵ؟".

وابزانم بەرلەوەی لەسەر باسەکەم بەردەوامبم، یەک دوو هەناسەی قوڵم هەڵکێشا و ئینجا بەتوندی وتم؛ "یاخود یاساکانی ئەو یاریەت پێ پەسەند نەدەکرا و لەبەرئەوە نەتدەویست بەشداری بکەیت؟"

هێشتا هەر زۆر بە بێدەنگی لەسەر کۆشم دانیشتبوویت. خۆزگە دەمزانی بیرت لە چی دەکردەوە. هەر لە پەرجوویەکی ڕاستەقینە و زیندوو دەچوویت! هەستمدەکرد قژە ڕەنگ گەنمیەکەت بۆنی لالەنگی لێدێت. فریشتەیەکی پرژیان بوویت و لە خوێن و ئێسقان دروستبووبویت.

ڕاستە خەوت لێنەکەوت، بەڵام هیچیشت نەگوت.

دڵنیابووم کە گوێت لە هەموو وشەکانم بوو، وابزانم باشیش گوێت بۆ شلکردبووم، بەڵام نەمدەزانی بیر لە چی دەکەیتەوە. لەسەر باوەشم دانیشتبوویت و زۆر لەیەکەوە نزیکبووین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ناکاوێکدا لەڕادەبەدەر لەیەک دورکەوتینەوە.

زیاترێک تۆم بە سنگمەوە نوساند، لەوانەیە وات هەستکردبێت کە نەهێڵم سەرمات بێت. بەڵام پاش نەختێک نائومێدمکردیت جۆرج، دڵم شکاندیت.. چونکە دەستم کرد بە گریان. مەبەستم نەبوو بگریم، یەکسەریش هەوڵمدا خۆمڕاگرم، بەڵام نەمتوانی و گریام.

من لەماوەی چەند حەفتەی ڕابووردودا هەمان ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکرد. بڵێیت ژیانی سەر زەویم هەڵببژاردایە، هەرچەندە ئەگەر بمزانیبایە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە پڕێکدا لێمدەسەندنەوە، بگرە لەوانەیە لە کاتێکدا بێت کە لەو پەڕی ئاسودەیدابم؟ یان هەر لەسەرەتاوە دەموت 'نەء سوپاس، بەلای منەوە ئەو یاری 'بگرە و بەردە'یە شتێکی بێئەقڵیەی و نامەوێت؟ بەڵام ئێمە یەک کەڕەت دێینە ناو ئەم ژیانەوە. دەخرێینە ناو حەکایەتێکی مەزنەوە و تەواو.. هەروەک چۆن لە کۆتایی حەکایەتەکاندا دەڵێن "منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ!
نەخێر.. بەدڵنیاییەوە نەمدەزانی کام دانەیەیانم هەڵدەبژارد. پێمواببیت نکۆڵیم لە مەرجەکان دەکرد. ڕەنگە هەر زۆر بەئەدەبەوە بمگوتایە نەخێر سوپاسی پێشنیارەکەتان دەکەم، بەڵام نامەوێت بێمە ناو ئەو حەکایەتە گەورەیەوە، چونکە هەروا بۆ سەردانێکی کورت و کەمخایەنە، خۆ پێشی دەچوو بەشێوەیەکی ناشیرین وەڵامم بدایەتەوە. ڕەنگە بەدەنگێکی بەرز بەتوڕەییەوە هاوارمبکردایە و بمگوتایە ئەوە موسیبەتە و پڕلە بیرۆکەی شەیتانیە، لەبەرئەوە نامەوێت هیچ وشەیەکی ترم لەو بارەیەوە گوێ لێبێت. من وام زانی بەو شێوەیە دەبێت. لەو کاتەدا کە لەبەرهەیوانەکە لەباوەشمدا دانیشتبوویت، دڵنیابووم ئەو پێشنیارەم ڕەتدەکردەوە.
هەڵبەتە ئەگەر ئەو دانەیەیانم هەڵبژاردایە و هەرگیز خۆم فڕێنەدایەتە ناو حەکایەتە گەورەکەوە، ئەوا ئەو کاتە نەمدەزانی چ شتێکم لە کیس دەچێت. تۆ لە مەبەستم تێدەگەیت؟ هەندێ جار ئێمەی مرۆڤ شتێکی خۆشەویست لەدەستدەدەین، بەڵام ئەوەمان بەلاوە خراپترە وەک لەوەی کە هەرگیز ئەو شتەمان نەبوایە. دە تۆ گوێ بگرە با بۆت باسبکەم؛ ئەگەر کچەی پرتەقاڵ ئەو پەیمانەی

نەبردایەتە سەر کە وتی بۆ ماوەی شەش مانگی پاش سەفەرەکەی ئیسپانیا هەموو ڕۆژێک یەکتری دەبینین، ئەو کاتە بەلای منەوە وا باشتربوو کەهەرگیز ئەو کچەم نەدیبایە. لە حەکایەت و ئەفسانەکانی تریشدا هەر هەمان شت دەبینین. تۆ لەو بڕوایەدایت سەندرێلا بیویستایە ببێتە شازادەی کۆشک ئەگەر بیزانیبایە تەنها بۆ ماوەی حەفتەیەک ڕێگەی پێدەدەن لەو یاریەدا بێت؟ بەبڕوای تۆ هەستی بە چیدەکرد کە دەگەڕایەوە بۆ لای مقاشی خەڵوز و خۆڵەمێش و ئاگردانەکەی؟ هەستی بە چی دەکرد کە دەگەڕایەوە بۆ لای زڕدایکەکەی و زڕخوشکەکانی؟

ئێستاکە ئیدی نۆبەی تۆیە وەڵام بدەیتەوە جۆرج، پاش نەختێک سەرەی تۆیە قسەبکەیت. من ئەو شەوەی کە لەبەر هەیوانەکەدا لەژێر ئەستێرەکانی ئاسماند دانیشتبووین، بڕیارمدا ئەم نامە دوورودرێژەت بۆ بنوسم. ڕێک لەو کاتەدابوو کە لەناکاودا دەستمکرد بە گریان. من تەنها لەبەرئەوە نەگریام کە دڵنیابووم تۆ و کچەی پرتەقاڵ بەجێدەهێڵم، بەڵکو لەبەرئەوەش گریام چونکە تۆ زۆر بچکۆلەبوویت.. لەبەرئەوە گریام چونکە من و تۆ نەماندەتوانی بە جدی پێکەوە قسەبکەین.

دیسانەوە دەپرسمەوە. ئەگەر بەدەستی خۆت بوایە کامیانت هەڵدەبژارد؟ دەتویست بۆ ماوەیەکی کەم لەسەر ئەم زەویە بژیت و پاش چەند ساڵێک هەموو شتێکت لێبسێنن و هەتاهەتاشە نەیەیتەوە؟ یان بەسوپاسەوە پێشنیارەکەت ڕەتدەکردەوە؟

هەر تەنها ئەو دوو بوارەت لەبەردەستایە، چونکە یاساکان بەو شێوەیەن. ئەگەر ژیان هەڵببژێریت، کەواتە دەبێت مردنیش هەڵببژێریت.

بەڵام پەیمانم بدەرێ کە بەڕاشکاوی بیری لێبکەیتەوە ئەوجا وەڵامم بدەیتەوە.

وابزانم زیاد لەڕادە چوومە قوڵایی ناختەوە، لەوانەیە زیاد لەڕادە چووبێتمە ناوەوەت، ڕەنگە لە بنەڕەتدا مافی ئەوەم هەر نەبێت. بەڵام ئاخر وەڵامی ئەو پرسیارەم هەر زۆر زۆر بەلاوە گرنگە، چونکە من ڕاستەوخۆ بەرپرسیارم لەوەی کە تۆ لێرەدا بوونت هەیە. ئێ ئەگەر من نەمهێشتایە تۆ لەدایکببیت، خۆ تۆ خۆت نەتدەتوانی بێیتە ئەم جیهانەوە.
تاوناتاوێک هەست بە گوناح ئەکەم، چونکە منیش بەشداربووم لە هێنانی تۆدا بۆ ئەم جیهانە. بەشێوەیەک لە شێوەکان من ئەم ژیانەم پێبەخشیت، یان وردتریێک بیڵێم من و کچەی پرتەقاڵ تۆمان هێنایە ئەم دونیایەوە. بەڵام بە هەمان شێوەش هەر ئیمە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو ژیانەت لێدەسەندینەوە. ژیان بەخشین بە منداڵێک هەر ئەوەندە نیە کە جیهانی مەزنی بەدیاری بدەیتێ، بەڵکو لەهەمان کاتدا لێسەندنەوەی ئەو دیاریە پڕنهێنیەشە.
جۆرج، من دەمەوێت زۆر ڕاستگۆبم لەگەڵتا. ئەگەر ئەو پێشنیارەیان بخستایەتە بەردەستم، ئەوسا بەسوپاسەوە ڕتم دەکردەوە و دەموت نەء سوپاس نامەوێت بەشێوەیەکی ئاوها کورت و سەرپێیی بێمە ناو ئەو حەکایەتە گەورەیەوە و 'ئاشنابم بە جیهان'. من خۆم ئاوهام دەگوت و ئەگەر تۆش وەک من بیردەکەیتەوە، ئەوا هەست بەگوناح ئەکەم چونکە بەشداریم لە هێنانی تۆدا کردووە و تۆم هێناوەتە ناو ئەم جیهانە.
من ڕێگەم بەخۆمدا کچەی پرتەقاڵ فریوم بدات.. خۆشمدایە دەست خۆشەویستی و ڕازیبووم منداڵمان ببێت. ئێستاکەش ویژدانم

ئازارمدەدات و هەستدەکەم پێویستیم بە ئاشتبوونەوە و تەبابوونە. خۆم بەخۆم دەڵێم 'بڵێیت هەڵەیەکم کردبێت؟' ئەو پرسیارە دەمهەژێنێت و کێشەوبەرەی ویژدانیم بۆ دەخوڵقێنێت، لێرەشەوە ناچارم دیسانەوە شتەکان بەرێک و پێکی بخەمەوە شوێنی خۆیان.

بەلام جۆرج.. لێرەدا کێشە و گۆبەنگێکی نوێ دێتە پێشەوە، ڕەنگیشە هەروەک ئەوەی پێشوو سەخت نەبێت _یان وەک ئەوەی پێشوو سەیروسەمەرە نەبێت. ئەگەر تۆ لە وەلامدا بڵێیت 'بەڵێ' هەرچەندە بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت دەمویست بێمە ئەم جیهانەوە، ئەوساکە هەر لەبنەڕەتەوە من مافی ئەوەم نەدەبوو کە بڵێم خۆزگە نەهاتمایەتە ئەم ژیانەوە!

ئابەو جۆرە دەکرێت شێوە هاوسەنگیەک لە پێوانەکاندا دەرکەوێت و هاوکێشەکە لاسەنگ نەبێت. بێگومان من خۆم ئومێدەوارم بەو شێوەیە بکەوێتەوە.. بەڕاست، خۆ من هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەم نامەیەت بۆ دەنوسم.

هەڵبەتە ناتوانیت ڕاستەوخۆ وەلامی ئەو پرسیارەم بدەیتەوە، بەلام دەتوانیت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وەلامم بدەیتەوە. دەتوانیت لە ڕێگەی ئەو ژیانەوە وەلامم بدەیتەوە کە هەڵیدەبژێریت، ژیانی تۆ لەو کاتەوە دەستیپێکرد کە من و فیرۆنیکا و پزیشکێکی لاسار لە خەستەخانەیەکدا بە نۆشکردنی شەمپانیا پێشوازیمان لێکرد. ئەو پزیشکەی شمپانیاکەی هێنا فریشتەیەکی باشبوو بۆ تۆ، من هیچ گومانێکم لەوەدا نیە.

ئێستاکە ئیتر دەتوانیت ئەم سەلامەم لەلای خۆت بهێڵیتەوە، ئێستاکە ئیدی نۆبەی تۆیە کە بژیت.

من خۆشم بۆ بەیانی دەبێت لە خەستەخانە بکەوم، کارە گرنگەکەی من ئەوەبوو، هەربۆیە وتم بەیانی دایکت دەتباتە باخچەی ساوایان، ئیدی لەمەودوا ئەو دەتبات.
بەپێویستم زانی ئەوەشت بۆ بنوسم. جگەلەوەش دەمەوێت بڵێم.. ناتوانم پەیمانت بدەمێ کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەڕێمەوە هوملەفای.

جۆرج! یەک پرسیاری تریشم ماوە؛ دەکرێت دڵنیابم لەوەی هیچ جۆرە ژیانێکی تر لەدوای ئەم ژیانەوە بوونی نیە؟ بڵێیت بەتەواوەتی لەو قەناعەتەدابم کە ئەو کاتەی تۆ ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە، من لە شوێنێکی تردا نەبم؟ نا.. من ناتوانم بەتەواوەتی دڵنیابم لەوە. چونکە هەر ئەو ڕاستیەی کە جیهان هەیە، سنوری هەموو ئەو شتانەی بەزاندووە کە ڕێیان تێناچێت. لەمەبەستم تێدەگەیت؟ من هەر ئێستا تائەوپەڕی ڕادە سەرسامی ئەوەم کە ژیان بوونی هەیە، هێندە سەرسامم کە چیتر بوونی ژیانێکی تر لەدوای ئەم ژیانە سەرسامم ناکات.
یەک دوو ڕۆژێک لەمەوبەر هەردووکمان چەند سەعاتێکمان بە یاریەکی کۆمپیوتەرەوە کوشت. وابزانم من زیاترێک چێژم لەو یاریە بینی، چونکە زۆر پێویستم بەوەیە کە لە هەموو بیرکردنەوەیەک دوربکەومەوە. هەموو کەرەتێک کە لە یاریەکەدا 'دەمردین' یەکسەر لاپەڕەیەکی نوێی یاریەکە دەهاتە سەر شاشەکە و سەرلەنوێ دەستمان پێدەکردەوە. چۆن بزانین کە ڕۆحیشمان 'لاپەڕەیەکی نوێی یاری' ئاوهای نیە؟ من خۆم لەو بڕوایەدانیم، بەڕاستی بڕوام پێنیە. بەڵام خەوبینینیش بە شتێکەوە کە ڕێیتێناچێت ناوێکی هەیە، ئێمە بەو شتە دەڵێین 'هیوا'.

**ئەو شەوەی بەرهەیوانەکەم باش لەیادە!** ئەوشەوە لە ناو مۆخی بڕبڕەی پشتمدا شوێنی خۆی کردۆتەوە. هەردەڵێیت لەناو دڵمدا وەکو کوتان هەڵکەنراوە. لەو کاتەشدا کە دەربارەی ئەو شەوەم خوێندەوە، چەند جارێک ئارەقی سارد بە پشتمدا هاتە خوارەوە.
تا ئەو کاتە بەشێوەیەک لە شێوەکان هەموو شتێکم لەیادکردبوو، ئاخر ئەگەر شتێکم دەربارەی نەخوێندایەتەوە قەت ئەو شەوەم بیرنەدەکەوتەوە کە ئاسمان پڕبوو لە ئەستێرە، بەڵام ئێستاکە تاڕادەیەک زۆر بەڕونی دێتەوە بەرچاوم. **ڕەنگە ئەوە تەنها یادوەرییەکی ڕاستەقینەبێت کە دەربارەی باوکم هەمە.**
هیچ یادگاریەکی ئەوم لە 'فێلستیۆلن'دا نایەتەوە خەیاڵ. هەرچی دەربارەی پیاسەکانی دەورەبەری 'سۆگنسقان'یشە هیچێکی وام نایەتەوە بیر، هەرچەندە تا ئەو پەڕی ڕادە هەوڵمدا بییانهێنمەوە بەرچاوم. بەڵام ئەو شەوە ئەفسوناویەی بەرهەیوانەکەم بەباشی لەیادە. مەبەستم لەوەیە کە من بەشێوەیەکی تر دێتەوە یادم، وەک ئەفسانەیەک یان وەک خەونێکی پڕلەڕەنگ و ڕوناکی دێتەوە خەیاڵم.
ئەو شەوە خەبەرم بووەوە و چوومە ژوری دانیشتنەکە. پاش نەختێک باوکم لەبەرهەیوانەکەوە هاتەلام و بەرزیکردمەوە بۆ ئاسمان. وتی با بڕۆین بۆ خۆمان بفڕین. وتی دەڕۆین سەیری ئەستێرەکان دەکەین، دەڕۆین بە ئاسماندا دەفڕین. هەرلەبەرئەوەش دەبوایە جلی گەرمم لەبەربکردبایە، چونکە ئاووهەوای ئاسمان هەر زۆر زۆر ساردبوو. باوکم دەیویست ئەستێرەکانی ئاسمانم پیشانبدات. ناچاربوو، چونکە ئەوە تەنها فرسەتێک بوو لەبەردەستماندا و نەدەبوایە بەفیڕۆی بدەین.

من دەمزانی باوکم نەخۆشە! بەڵام ئەو نەیدەزانی کە من ئەوە دەزانم. دایکم ئەو نهێنیەی لا درکاندم. دایکم وتی 'دڵم زۆر تەنگە چونکە لەوانەیە باوکت لەخەستەخانە بکەوێت' پێموابێت هەر هەمان پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژەبوو کە ئەو قسەیەی پێوتم. وابزانم هەر لەبەرئەوەشبوو کە خەبەرم بووەوە، هەر بەهۆی ئەوەوەبوو کە نەمتوانی بخەوم.

ئێستاکە زۆر بەڕونی ئەو شەوەم بیردەکەوێتەوە کە لە بەرهەیوانەکەوە لەگەڵ باوکمدا ئەو سەفەرە دورودرێژەمان بە ئاسماندا کرد. پێموابێت من وا تێگەیشتبووم کە باوکم سەفەردەکات، بەلآم لەپێشدا دەیویست ئەو شوێنەم نیشانبدات کە سەفەری بۆ دەکرد.

دواتریش _ئێستاکەش کە ئەم دێڕانە دەنوسم، هێشتا ئارەقێکی سارد بە پشتمدا دێتە خوارەوە_ دواتریش کە سەفەرمان بە ئاسماندا دەکرد، باوکم لە پڕێکدا دایە پرمەی گریان. من دەمزانی ئەو بۆچی دەگری، بەڵام ئەو نەیدەزانی کە من ئەوە دەزانم. هەرلەبەرئەوەش بوو کە نەمتوانی هیچ شتێک بڵێم. ناچاربووم زۆر بەبێدەنگی دابنیشم. قسەکردن لەسەر ئەو شتەی کە پاشتر ڕویدەدا بابەتێکی زۆر ترسناکبوو.

شتێکی تریش؛ لەو شەوەوە هێندە فێربووم کە متمانە بە ئەستێرەکانی ئاسمان ناکرێت. بەلایەنی کەمەوە ناتوانن لە هیچ شتێک ڕزگارمان بکەن. ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت ماڵئاوایی لە ئەستێرەکانیش بکەین و جێیان بهێڵین.

لەو کاتەی کە من و باوکم بە ئاسماندا سەفەرمان دەکرد و لەپڕێکدا دەستیکرد بە گریان، هێندە تێگەیشتم کە هیچ شتێک لەم ژیانەدا نیە کە متمانەی پێبکرێت.

وا دواجار لەپاش ئەوەی چەند لاپەڕەی کۆتایی نامەکەم خوێندەوە، لەوە تێگەیشتم بۆچی من هەمیشە بەو شێوەیە خولیای ئاسمان بووم. باوکم چاوی کردبوومەوە و ئەو ڕەهەندەی نیشاندابووم. ئەو فێری ئەوەی کردبووم کە تەماشای هەموو شتە نارێک و جارڕسکەرەکانی سەر ئەم زەویە نەکەم. من زۆر لەپێش ئەوەی خۆشم بزانم بۆ، بووبووم بە ئەستێرەناسێکی ئارەزومەند.

کەواتە هێندە سەیرنەبوو کە من و باوکم هێندە سەرقاڵی تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ بووین. من ئەو شتەم لەوەوە بۆ مابووەوە. تەنها ئەوەندەبوو کە من لەو شوێنەوە دەستم پێکرد کە ئەو بەجێی هێشتبوو. جۆرێکبوو لە جۆرەکانی بۆماوە. ئێ هەمیشەش هەر وا نەبووە؟ یەکەمین ئامادەکاری تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ لە سەردەمی چاخە بەردینەکاندا ڕویدا. نا، لەڕاستیدا هەرە یەکەمین ئامادەکاری چەند میکرۆچرکەیەک لە پاش تەقینەوە گەورەکەوە ڕویدا، ئەو کاتەی کە شوێن و کات ئافەریدەکران.

ئەوە ئەو شتەیە کە پێی دەڵێن "چاندنی تۆوێک" باوکم بەرلەوەی بمرێت فریای ئەوە کەوت. بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەو بابەتی پرۆژە تایبەتیەکەی پێبەخشیبووم. من پێم وانیە باوکم هێندە بایەخی بە یاری فتبۆڵین دابێت. خۆشبەختانەش فریای گۆرانیبێژانی نوێی 'پۆپ' نەکەوت. نازانم ڕای ئەو بەرامبەر کتێبەکانی 'هاری پۆتەر' چی دەبوو.

خوێندنەوەی نامەکەم تەواوکرد. دانیشتم کەمێک بیربکەمەوە و لەو کاتەدا دایکم دیسانەوە لەدەرگای دایەوە، زۆر بە ئاسانی وتی؛

"جۆرج؟"

منیش وتم هەموویم خوێندەوە.
"دە کەواتە کەمێکی تر دێیتە دەرەوە یان چی؟"
منیش وتم "خۆت وەرە ژورەوە".
دەرگاکەم کردەوە و کردمە ژورەوە. خۆشبەختانە یەکسەر بەدوای خۆیدا دەرگاکەی بە کلیل داخستەوە.
بەهیچ جۆرێک شەرمم لەوە نەکرد کە فرمێسک لەچاومدا قەتیس بووبوو. دایکیشم کاتی خۆی کە بۆ یەکەمین جار باوکمی بینی فرمێسک بەچاویدا هاتە خوارەوە. لەوێدا من باوکمم بینی.
دەستم کردە ملی کچەی پرتەقاڵ و وتم؛ "باوکم بەجێیهێشتین".
دایکم منی نوساند بە سنگیەوە و ئەویش دەستیکرد بە گریان.
کەمێک لەسەر قەراغی جێگاکە دانیشتین. پاشان کەوتە قسە و دەیویست بزانێت باوکم چی بۆ نوسیوم، ئەوجا وتی "تۆ خۆت دەزانی کە چەندە بەپەرۆشم، لەسەرێکیشەوە کەمێک دەترسم.. تاڕادەیەک ناوێرم بیخوێنمەوە"
پێموت باوکم نامەیەکی دورودرێژی خۆشەویستی نوسیووە، بێگومان یەکسەر وایزانی کە نامە خۆشەویستیەکەی بۆ من نوسیبێت. دەیویست هەموو وردەکاریەک بزانێت. پێموت "باوکم نامەیەکی دڵداری بۆ تۆ نوسیووە.. بۆ کچەی پرتەقاڵ".
هەروەها وتم؛ "من ئازیزترین برادەری باوکم بووم، بەڵام تۆ دەستگیران و خۆشەویستی ئەو بوویت. برادەری ئازیز و دەستگیران دوو شتی جیاوازن".
بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر قەراغی جێگای خەوەکەم بەبێدەنگی مایەوە. پاشئەوەی چیرۆکە دورودرێژەکەی کچەی پرتەقاڵم خوێندەوە، ئەوجا زانیم دایکم چەندە جوانە. باوکم ڕاستیدەکرد،

شێوەی کەمێک لە سمۆرە دەچوو. بەڵام ڕێک لەو کاتەدا لە باڵندەیەکی تازەپێگەیشتوو دەچوو، دەنوکیم دەدی کە دەیدا بەیەکدا.
لێم پرسی؛ "باوکم کێ بووە؟"
دایکم داچڵەکی. ئێ خۆ ئەو کتومت نەیدەزانی لە ماوەی ئەو چەند کاتژمێرەی پێشوودا من چیم خوێندبووەوە.
لەوەڵامدا وتی؛ "بێگومان 'یان ئۆلاو' باوکی تۆیە".
"بەڵێ بەڵام یان ئۆلاو کێ بوو؟ مەبەستم لەوەیە چ جۆرە کەسێک بوو؟"
"ئاه.."
لەو کاتەدا کە بیری لە پرسیارەکەم دەکردەوە، هەروەک مۆنالیزا زەردەخەنەیەکی بچکۆلەی خستە سەر لێوانی. بە نیگایەکی کەمێک تەماویەوە تەماشایەکی کردم. بەدەر لەوەش لەوێدا شتێکی تریشم بۆ ڕونبووەوە کە باوکم چەندها جار سەرنجیدابوو. هێندەم بینی کە جارجارێک زۆر ورددەڕوانێت. سەرنجمدایە شێوەی تروکاندنی چاوە قاوەییەکانی؛ تاوێک نەسرەوت دەهاتە بەرچاوم و تاوێکی تر بەشێوەیەکی نائارامانە سەمایان دەکرد.
وتی؛ "باوکت هەر زۆر زۆر میهرەبان بوو... بەڕاستی مرۆڤێکی کەم وێنە بوو. جگەلەوەش کەسێکی خەیاڵاوی بوو، دەتوانم بڵێم ئەفسانەی دادەهێنا.. بەردەوام دەیوت ژیان ئەفسانەیە، وابزانم بەڕاستیش هەمیشە لەناو ژیانێکی ئاوها.. لەناو هەستێکی ئاوها ئەفسوناویدا دەژیا. لەسەروئەوەشەوە تابڵێیت پیاوێکی ڕۆمانسیبوو، لەڕاستیدا هەردووکمان ڕۆمانسی بووین. دواتر نەخۆشکەوت و لێت ناشارمەوە بە غەم و پەژارەیەکی یەکجار قوڵەوە پێشوازی لە مەرگ کرد. من بینینی ئەو دیمەنەم زۆر بەلاوە ناخۆشبوو، هەر زۆر تاڵ بوو. زۆر دڵی بە من خۆشبوو.. زۆر دڵێ بە تۆش خۆشبوو.. بەڵێ

بەڕاستی هەروەک خوا دەیپەرستیت. نەیدەتوانی هەروا بەئاسانی لێمان جیاببێتەوە، بەڵام هاوکاتیش لەتوانایدا نەبوو بەرەنگاری نەخۆشیەکەی ببێتەوە، مردن بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە و بێبەزەییانە لە ئێمەی فڕاند. ئەو ڕازینەبوو بە چارەنوسی خۆی، هەتا دوا هەناسەش هەر وا مایەوە. لەبەرئەوە ئەو بۆشاییەی بەدوای ئەودا بۆمان جێما هەر زۆر گەورەبوو.. ئائێستاکە بەدوای وشییەکی تایبەتیدا دەگەڕێم کە بیڵێم.."

"کاتێکی باشم لەبەردەستدایە"

"کەسێکی پڕ لەخەون و خەیاڵی بوو، بەڕاست ئەو وشەیەبوو کە بەدوایدا دەگەڕام و دەمویست بیڵێم".

لەوێدا من خەندە گرتمی. وتم؛ "کەسێکی ڕاستگۆش بوو و خۆشی باش دەناسی. پیاوێکبوو بەرامبەر خۆشی ئایرۆنی بەکاردەهێنا. هەموو کەسێک ئەو سیفەتەی تێدا نیە".

دایکم سەریسوڕما لە قسەکەم و وتی؛ "لەوانەیە، بەڵام تۆ لە کوێوە ئەوە دەزانیت؟"

ئاماژەم بۆ لاپەڕەکانی نامەکرد و وتم؛ "لەداهاتوودا کە ئەمانەت خوێندەوە ئەوجا لەمەبەستم تێدەگەیت".

دیسانەوە کچەی پرتەقاڵ ڕوی وەرچەرخاندەوە. بەڵام خۆ نەدەکرا لەوەندە زیاترێک لەژورەوە دانیشین و قسەبکەین. ئاخۆ یۆرگن خەیاڵی بۆ چ شتێک بچێت؟ بەهەرحاڵ من ئیرەییم پێنەدەبرد.

وتم؛ "ئیتر دەبێت بڕۆینە دەرەوە بۆلای ئەوانی تر"

چوومە ژوری دانیشتنەکەوە و لەو کاتەدا هەستم دەکرد چەند ساڵێک لەتەمەنم زیادیکردووە، چەند ساڵێک پیرتربووم لەو کاتەی بەر لە چەند سەعاتێک بەخۆم و نامەکەی باوکمەوە خۆمکرد بە ژورەکەی

خۆمدا. هەستمدەکرد گەورەبووم و هیچ گوێم بەو هەموو نیگا پڕلە پەرۆشیەی ئەوان نەدا کە تێیان دەگرتم.
سەر مێزی نانخواردنە گەورەکەیان بە هەندێ خواردنی سارد ڕازاندبووەوە. مریشک و توێژاڵی گۆشتی بەراز و زەڵاتەی 'والْدۆرف'[1] بە قاژی پرتەقاڵ و قاپێکی گەورەی زەڵاتەی کاهویان دانابوو. هەر پێنجمان لەسەر مێزەکە دانیشتین، من لە کۆتایی مێزەکەدا دانیشتم. زۆرجار کە بەو شێوەیە میوانمان دەهات، دایکم دەیوت "با یەکێکمان مێزەکە بەرێت بەڕێوە". لەوێدا هەستم کرد بەو شێوەیە و منیش مێزەکەم دەبرد بەڕێوە، چونکە هەموان سەیری منیان دەکرد. بەشێوەیەک لە شێوەکانیش من کەسایەتی سەرەکی دانیشتنەکەبووم. کەمێک پاش ئەوەی کە دانیشتین تەماشایەکی هەر چواریانم کرد و وتم؛ "نامە دورودرێژەکەی باوکمم خوێندەوە، ئەو کەمێک بەر لە مردنی بۆی نوسیبووم. دەشزانم هەمووتان پەرۆشی ئەوەن بزانن چی نوسیووە..."
هەر هەموویان بێدەنگ بوون. چی بڵێم؟ لە کوێوە دەست پێبکەم؟ بەردەوامیم بە قسەکانمدا و وتم؛ "واتە نامەکە بۆ من هاتووە. بەڵام جگە لەمن خەڵکانێکی تریش باوکمیان خۆشویستووە. ئێستاکە هەواڵێکی باش و هەواڵێکی خراپم پێیە. من لە هەواڵە باشەکەوە دەستپێدەکەم. ڕێگە بە هەمووتان دەدەم کە تەواوی نامەکە بخوێننەوە. یۆرگنیش. هەواڵە خراپەکەشم ئەوەیە کە هیچ کەسێکتان نابێت ئەم ئێوارەیە بیخوێنێتەوە".
نەنکم زۆر بە پەرۆشەوە بەسەر مێزەکەدا خۆی چەماندبووەوە، بەڵام لەدوای قسەکانمەوە شێوە نائومێدیەک کەوتە سەر سیمای. هەر ئەو نائومێدیەی هێندەی بۆ سەلماندم کە نامەکەی نەخوێندۆتەوە، نە

---

[1] زەڵاتەیەکە کە سێو و ترێ و کەرەوز و گوێزی تێدەکرێت و کەمێک کرێمی بەسەردا دەکەن.و

لەو کاتەدا بینیویەتی و نە پێش یانزە ساڵیش لەمەوبەر. کەواتە بەڕاستی نامەکەی لەناو ئەو ماشێنی یاریە کۆنەدا مابووەوە.
وتم؛ "بەهەقی خۆمی دەزانم بەرلەوەی هەمووتان بکەونە باسکردنی نوسینەکەی باوکم، لە ناواخنی نامەکەی تێبگەم و هەزمی بکەم. جگە لەوەش پێویستیم بە کەمێک کاتە تا بتوانم وەڵامی پرسیارێکی هەر زۆر گرنگی بدەمەوە. بەتایبەتیش ناچارم شێوازی چۆنیەتی وەڵامی ئەو پرسیارەی بدۆزمەوە".
بەئاشکرا دیاربوو هەموویان لەسەر قسەکانم ڕازیبوون. هیچ کەسێکیان نەیوت دەمەوێت بزانم باوکت چی نوسیووە. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو یۆرگن هەستایە سەرپێ و هاتە لامەوە. وەک برادەرێک دەستی کێشا بە شانمدا و وتی؛ "قسەکەت هەر زۆر بەجێیە جۆرج. منیش لەو بڕوایەدام وا باشتربێت کە لە پێشدا لەتەواوی ناواخنی نامەکە تێبگەیت و هەزمی بکەیت".
دواتریش وتم؛ "ئێ جگەلەوەش وا کاتژمێر بەرەو دوانزە دەڕوات. کاتی خۆیەتی کەمێک بخەوین"
خۆشم هەستم دەکرد کە بەشێوەیەکی گەورە ئاسا و بەڕێزەوە قسەکانم دەردەبڕم. لەوێدا ئیدی وەک کەسێکی گەورە وابووم.

بەڵام ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم. زۆر دوای ئەوەی کە هەمووان بەتەواوەتی بێدەنگبوون، من لە جێگادا پاڵکەوتبووم و تەماشای کەنتۆرە سپیەکەم دەکرد. دەمێک بوو بەفرەکەش خۆشی کردبووەوە.
نیوەشەو هەستام و خۆم گۆڕی، قەمسەڵەیەکی ئەستورم لەبەرکرد. کڵاوێکم کردە سەرم و ملپێچێکم لەملمەوە ئاڵاند، جوتێ دەستکێشیشم بۆ لەدەستکرد. ئینجا لە ژوری دانیشتنەکەوە خۆم گەیاندە

بەرهەیوانەکە. پاشئەوەی گڵۆپەکەی دەرەوەم کوژاندەوە، بەفری سەر جۆلانە ئاسنینەکەم ماڵی و لەسەری دانیشتم.

تەماشای ئەستێرە پرشنگدارەکانی ئاسمانم دەکرد و هەوڵمدەدا جەوی ئەو کاتە بهێنمەوە یادم کە باوکم لەسەر کۆشی دایناببووم. وابزانم ئەوەم بەبیردەهاتەوە کە توند نوساندمی بە سنگیەوە. پێموابێت هەر لەبەرئەوەشبوو کە لە کەشتیە ئاسمانیەکە نەکەومە خوارەوە، من ئاوها دێتەوە یادم.. پاش نەختێکیش ئەو پیاوە گەورە دەنگ گرە لەناکاودا دەستیکرد بە گریان.

هەوڵمدەدا بیر لەو پرسیارە گرنگە بکەمەوە کە ئاراستەی کردم، بەڵام نەمدەزانی بە چ شێوەیەک وەڵامی بدەمەوە.

ئاخر ئەوە یەکەمین جاربوو لە ژیانمدا کە درکم بەو ڕاستیەکرد کە منیش ڕۆژێک لە ڕۆژان لەم جیهانە دادەبڕێم و هەموو شتێک بەدوای خۆمدا بەجێدەهێڵم. بیرکردنەوەش لەو حاڵەتە نەک هەر شتێکی خۆش نەبوو، بگرە نەمدەتوانی بەرگەشی بگرم. من خۆم باوکم چاوی کردمەوە و ئەو هەموو شتانەی پێناساندم. ئەوەیانم بەلاوە باشبوو. پێمخۆشبوو بزانم ڕووبەڕوی چی دەبمەوە. هەروەک ئەوە وابوو کە بزانم چەندە پارەم لە بانکدا هەیە، خۆشیەکەشی لەوەدابوو کە هێشتا تەمەنم پانزە ساڵ بوو.

بەڵام لەگەڵئەوەشدا ڕەمبێکم وا باشترێک بوایە کە هەر قەت لەدایک نەبوومایە، چونکە هەر لەو کاتەوە خەیاڵی بەجێهێشتی ئەم ژیانەم لەداهاتوودا لەڕادەبەدەر دڵی تەنگ دەکردم. بەڵام بڕیارمدا هەر ڕێک بەو شێوەیە بکەم کە باوکم لە نامەکەیدا بۆی نوسیبووم. دەمویست بەڕاشکاوی لەو پرسیارە سەختە ڕابمێنم و هەڵیبسەنگێنم، ئەوجا وەڵامی بدەمەوە.

سەرم بۆ دواوە لارکردەوە تا هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان ببینم. هەوڵمدا مەزەنەی ئەوەبکەم کە لە کەشتیەکی ئاسمانیدا دانیشتووم. چەند کەرەتێکیش ئەستێرەم بینی کە دەکشا. بۆ ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە مامەوە.
پاش ماوەیەک گوێم لە دەنگی دەرگاکەبوو کە کرایەوە و دایکمم بینی بەرەو بەر هەیوانەکە بەرەورووم دەهات. کتومت لەو کاتەدابوو کە دونیا رووناک بووەوە.
هەرچەندە چاوی لێمبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرسی؛ "ئەوە لێرە دانیشتوویت؟"
منیش هەروا بە ئاسانی وتم؛ "خەوم لێنەکەوت"
"منیش خەوم زڕاو و نەمتوانی بخەوم"
سەرم هەڵبڕی و تەماشایەکم کرد، ئەوجا وتم؛ "دایە، برۆ هەندێ جلی گەرم لەبەربکە و وەرە لەلامەوە دابنیشە"
هەر زۆر زوو هاتەوە لام. پاڵتۆ زستانەییە رەشەکەی لەبەرکردبوو، لەوەتەی من بەبیرم بێتەوە ئەو پاڵتۆیەی هەر هەبووە. بێگومان دڵنیا نەبووم هەر هەمان ئەو پاڵتۆیەبوو کە کاتی خۆی لە کڵێسە گەورەکەدا لەبەریکردبوو یان نا، بەڵام کە لەسەر کورسیەکە دانیشت وتم؛
"هەر تەنها تەوقە زیوینیە گەورەکەی قژت نوقسانە"
دەستێکی خستە سەر دەمی. دواتر وتی؛ "دەربارەی ئەوەی بۆ نوسیویت؟"
لەوەڵامی پرسیارەکەیدا ئامارژەم بۆ هەسارەیەکی گەورەکرد، لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو ئاسمان بەرزدەبووەوە. زۆر دڵنیابووم کە هەسارەیەک بوو، چونکە وەک ئەستێرەکانی تر نەدەدرەوشایەوە، من لەسەدا 99 دڵنیابووم کە فینۆس بوو، ئەوجا وتم؛ "ئا ئەو

هەسارەیەی ئاسمان دەبینی؟ ئەوە ناوی فینۆسە، بەڵام پێشی دەڵێن 'ئەستێرەی بەیانیان'. کاتی خۆی هەموو کەرەتێک کە باوکم تەماشای ئەو ئەستێرەیەی کردووە، تۆی هاتۆتە بەرچاو".

کاتێک کە مێشکمان لێوانلێو دەبێت لە ئەندێشەی گەورە، یان دەکەوینە قسەکردن یاخود بێدەنگ دەمێنینەوە. دایکم بێدەنگی هەڵبژارد.

نەختێک دواتر وتم؛ "بەرلەوەی باوکم لە خەستەخانە بکەوێت، شەوێکیان ئا لێرەدا پێکەوە بەدریژایی شەوەکە دانیشتین. دواتر خۆشت دەتوانیت زیاترێک دەربارەی ئەوە لەنامەکەیدا بخوێنیتەوە. بەڵام ئێستاکە وا هەردووکمان لێرەدا دانیشتووین".

ئینجا دایکم وتی؛ "جۆرج.. من زۆر پەرۆشی خوێندنەوەی ئەو نامەیەم، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆر دەترسم. دەمەوێت لەو کاتەدا کە دەیخوێنمەوە تۆ لەماڵەوە بیت. پەیمانی ئەوەم دەدەیتێ؟"

دەستم بۆ ڕاکێشا و پەیمانمدایە. منیش وام پێباشبوو لەو کاتەدا کە ئەو نامەکەی باوکم دەخوینێتەوە لە نزیکیەوەبم. ئێ خۆ نەدەکرا لەپاش خوێندنەوەی نامەیەکی دورودرێژی 'یان ئۆلاو'، یۆرگن بێت و دڵنەوایی کچەی پرتەقاڵ بداتەوە. بەڵام با یۆرگنیش بۆ خۆی بیخوێنێتەوە، ئەوە ئاسانترین شێوەی بەردەستمبوو کە یارمەتی بدەم.

وتم؛ "ڕێک ئەو شەوەی کە لێرەدا دانیشتبووین باوکم وتی ماوەیەکی تر بەجێتان دەهێڵم".

بەپەلە ئاوڕێکی لێدامەوە و وتی؛ "جۆرج، نازانم لێمتێدەگەیت یان نا.. بەڵام من دڵنیانیم کە بتوانم ئا ئێستاکە لە ئەمەندە زیاتر لەسەر ئەو باسە بڕۆم.. پێموابێت باشترێکە ئەوەم لێ قبوڵبکەیت. ئەزانی تۆش برینێکی کۆن دەکولێنیتەوە.. لەوە تێناگەیت؟".

خەریکبوو تورەبێت، بگرە تورەبوو.
"با.. لەوە تێدەگەم".
بۆ ماوەیەکی دورودرێژ دانیشتبووین بەبێ ئەوەی هێندە زۆر بلێین. وابزانم بۆ ماوەی سەعاتێک بەو شێوەیە ماینەوە. من سەرم لەوە سورمابوو، چونکە دایکم هەمیشە ئاخ و داخی بوو کە سەرمابردەڵەیە.
هەموو کەرەتێک کە شتێکی نوێ لە ئاسماندا دەردەکەوت، من خێرا پەنجەم بۆ رادەکێشا. بەڵام هێندەی پێنەچوو ئەستێرەکان نەختە نەختە کاڵبوونەوە و دواتریش لەگەڵ روناکبوونەوەی دونیادا بەتەواوەتی ونبوون.
بەرلەوەی هەریەکەمان بەلایەکدا برۆین، دیسانەوە ئاماژەم بۆ ئاسمان کردەوە و وتم؛ "لەو ئاسمانەدا چاوێکی گەورە دەخولێتەوە. کێشەکەی لەسەرو یانزە تەنەوەیە، ئەندازەشی هێندەی مەکینەی راکێشانی شەمەندەفەرێک دەبێت و بەهۆی دوو باڵی درێژەوە دەجوڵێتەوە".
سەرنجمدا دایکم واقیورمابوو، هەستمدەکرد لە دڵی خۆیدا دەڵێت "ئاخۆ مەبەستی لەو قسانە چی بێت؟".
من مەبەستم نەبوو کە بیترسێنم، نە لەخەیاڵیشمدا بوو چیرۆکی جنۆکە و منۆکەی بۆ بگێرمەوە. هەر بۆ ئەوەی ئارامی بکەمەوە، خێرا وتم؛ "تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ. ئەوە چاوی گەردوونە".
خەندە تایبەتیەکەی خۆی گرتی و دواتر ویستی دەستێک بەسەرمدا بهێنێت، بەڵام من لەژێر دەستی دەرچووم. بەبرِوای ئەو من هێشتا هەر منداڵبووم. وابزانم لە خەیاڵی خۆیدا هێشتا هەر بیرم لە پرۆژە تایبەتیەکەم دەکردەوە.

نەختێک دواتر وتم؛ "ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت لە هەموو ئەم شتانە تێبگەین".

ئەو ڕۆژە ڕێگەیان پێدام لەماڵەوە بمێنمەوە و نەڕۆمەوە مەکتەب. نەنکم هەر زۆر بەئاسانی پێی وابوو کتومت هەموو ڕاستیەکە بە ماموٚستاکەم بڵێم و تەواو. وتی بڵێ باوکم یانزە ساڵ لەمەوبەر مردووە، بەڵام وا نامەیەکم لەوەوە بۆ هاتووە. هەروەها وتی باشترین شت لەو حاڵەتانەدا ئەوەیە کە پشویەکی بۆ بدەیت.
لەدڵی خۆمدا وتم 'لەو حاڵەتانەدا'. من پێم وانەبوو شتێکی ئاسایی بێت گەر نامەیەکت لە دایک و باوکێکی مردووەوە پێبگات.
نەنکم و باپیرەم بەرلەوەی نامەکە بخوێننەوە گەڕانەوە بۆ 'تیوسنبێرگ'. پەیمانم دانێ کە لە ماوەی حەفتەیەکدا نامەکەیان بۆ بنێرم. نەنکم کەمێک توڕەبوو، چونکە دەبوایە هێندە زۆر چاوەڕوانی بکردایە. ئێ خۆ لەڕاستیشدا ئەو نامەکەی دۆزیبۆوە، هەر ئەویش بڕیاریدابوو کە بێن بۆ ئۆسلۆ. بەڵام باپیرەم قسەکانی یۆرگنی هێنایەوە یاد.
بەیانی زووی ئەو ڕۆژە یۆرگن چووە سەر کار و هەر هێندە فریاکەوتم کە بۆ ساتێک ببینم، بەڵام من و دایکم لە ماڵەوەماینەوە. پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ هەر لەسەر قەنەفە زەردەکە خەوم لێکەوت، هەڵبەتە بەهۆی ئەوەوەبوو کە شەوی پێشوو خەو نەچووبوە چاومەوە. هەر کە خەبەرم بووەوە، چووینە ئەمبارەکەوە و بەدوای شتەکاندا گەڕاین.
داوام لەدایکم کرد هەموو ئەو تابلۆیانە بدۆزێتەوە کە کاتی خۆی لە ئیشبیلیادا کێشابووی. خۆشبەختانە هیچ دانەیەکی فڕێ نەدابوو، بەڵام دیسانەوە لەوێشدا ئامارژەی بۆ ئەوەکردەوە کە ئەو لەو جۆرە

تابلۆیانە 'تێپەڕیووە'. ئەو قسەیەی ڕێک لەو کاتەدا کرد کە دەستی دایە وێنەی پۆرترێتەکەی باوکم، ئەو وێنەیەی کە کاتی خۆی هەر بەخەیاڵ کێشابووی. نە من و نەدایکیشم هیچ شتێکمان دەربارەی ئەو وێنەیە گوت، بەڵام کە بینیم سەرمسوڕما. من لەوەوپێش لە ژیانمدا نیگایەکی ئاوها شینی پرشنگدارم لە تابلۆیەکدا نەبینیبوو. خۆم بەخۆمم وت 'لەوانەیە بڕێکی زۆر لە مادەی 'کۆباڵت' لەو ڕەنگە شینەدا بووبێت. هەر بەخەیاڵی خۆم دەموت 'ئەو دوو چاوە شتێکیان بینیوە کە هیچ کەسێکی تر نەیدیووە'.

"بەڵام خۆ هێشتا هەر گرنگی بە باوکم دەدەیت و بەسەر ئەودا تێنەپەڕیوویت؟"، من ئەو ڕستەیەم زیاتر وەک فەرمانێک وت نەک وەک پرسیارێک.

قەناعەتم پێکرد کە وێنەی دار پرتەقاڵەکان لە هەمان شوێنە کۆنەکەی خۆی لە ژوری دانیشتنەکەماندا هەڵواسێتەوە. لەپێشدا چووین وێنەکەی ترمان لێکردەوە و ئەوجا وێنە کۆنەکەمان لە شوێنیدا هەڵواسی، ڕێک هەروەک ئەو کاتەی کە باوکم لەسەر مێزی کۆمپیوتەرەکەی دانیشتبوو و شتی نوسیوە. لەو ماوەیەدا بووە کە بە هەڵبەزودابەز بە ژورەکەدا هاتوچۆی کردووە بۆ ئەوەی پێی لە سکەی قیتارە تەختەیینەکەی من نەکەوێت. ئەو کاتە سەردەمێکی تر بووە و لەگەڵ ئێستادا جیاوازبووە.

بەلای منەوە وێنەی دار پرتەقاڵەکانمان لە باشترین شوێندا هەڵواسیبوو، دیمەنێکی جوانیشی هەبوو، لەبەرئەوە بەدایکمم وت 'دەبێت یۆرگن بەم گۆڕانکاریە بچکۆلەیە ڕازیبێت، هەرچەندە گەڕانەوەیەکیشە بۆ جاری جاران'.

شەمەنەفەری 'بیرۆکەمان دۆزیەوە، لەناو سندوقێکی گەورەدا لە ئەمبارەکەدا دانرابوو. کۆمپیوتەرە کۆنەکەشمان بینیەوە. من خۆم

هێنامە خوارەوە و لەژوری دانیشتنەکە دامنا، وایەری شاشەکەم بەست و وایەری کۆمپیوتەرەکەشم کرد بە کارەباکەدا، ویستم یەکسەر بچمە ناو بەرنامەی نوسینەکەیەوە. کۆمپیوتەرە کۆنەکان بوو کە سیستمی 'دۆس'ی هەبوو و بەرنامەی نوسینەکەشی ناوی 'ورد پێرفێکت'بوو. باوکی کورێکی هاوەڵم هێشتا لەسەر کۆمپیوتەرێکی ئاوها کۆن (یان وەک دەڵێن 'کۆمپیوتەری مۆزەخانە') دەنوسێت و چەندەها جار منیش دامگیرساندووە.

بەڵام نەمتوانی یەکسەر بچمە ناو دەکومێنتەکانی باوکمەوە، چونکە پرۆگرامەکە داوای کۆدێکی کرد کە نەدەبوایە لە هەشت پیت زیاترێک بێت. هەر ئەو کۆدەبوو کە کاتی خۆی بەر لە یانزە ساڵ لەمەوبەر نەیانتوانیبوو بیدۆزنەوە.

لەو کاتەدا کە خەریکی کۆمپیوتەرەکەبووم، دایکم لە پشتمەوە وەستابوو. وتی "کاتی خۆی چەندەها وشەی جیاوزجیاوازمان نوسی، چەندەها ژمارەشمان تاقیکردەوە، هەر بۆ نمونە ڕۆژی لەدایک بوون و ژمارەی سەیارە و ژمارەی پێناسنامە، بەڵام بۆمان نەدۆزرایەوە".

من وای بۆ چووم کە کاتی خۆی خاوەنی فەنتاسیایەکی هێندە زۆر نەبوون. پاش کەمێک لە شوێنی کۆدەکەدا ئەم حەوت پیتەم نوسی؛ پ- ر- ت- ە- ق- ا- ڵ. یەکسەر بەدوایدا گوێم لێبوو کۆمپیوتەرەکە دەنگێکی لێوە بەرزبووە و وتی 'کلینگ'، دوای ئەوە یەکسەر چوومە ناو پەنجەرەی بەرنامەیەکی هاردیسکەکەوە کە پێی دەوترێت 'بەڕێوەبەر'.

دایکم نەک هەر سەریسوڕمابوو، بەڵکو واقی وڕمابوو، دەستێکی بە ناوچەوانیەوە گرتبوو و خەریکبوو دەبورایەوە.

لەکۆمپیوتەرە کۆنەکانەکاندا وشەی "dir" بەرامبەر وشەی 'مەلەف'ی کۆمپیوتەرەکانی ئەمڕۆ دەکەوێتەوە. مەلەفەکانیش ناویان هەبوو و

نەدەبوو لە هەشت پیت زیاترێک بێت. ناوی یەکێکیان 'فیرۆنیکا'بوو، هەر بە سەهمەکانی کیبۆردەکە چوومە سەر ناوەکە و پەنجەم نا بە 'ئینتەر'دا. کۆمپیوتەرە کۆنەکان 'ماوس'یان نەبووە. لەوێدا یەک دەکومێنت دانرابوو و ناوی 'georg.bre'بوو. دیسانەوە پەنجەم نایەوە بە 'ئینتەر'دا و یەکسەر کتومت ئەو تێکستە هاتەوە سەر شاشەکە کە ئێوارەی ڕۆژی پێشتر خوێندبوومەوە؛ **باش دانیشتوویت جۆرج؟ هەرچۆنێک بێت کەمێک گرنگە کە بە باشی دانیشتبیت، چونکە ئێستاکە دەمەوێت چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشت بۆ بگێڕمەوە...** ئینجا نوسیم "HOME،HOME" و پەنجەم بە سەهمەکەدا نا بۆ ئەوەی هەموو لاپەڕەکانی دەکومێنتەکە ببینم. هەر زۆری پێچوو، لایەنی کەم دە چرکەیەکی پێویستبوو. بەڵام تەواوبوو، دواهەمین ڕستەی دەکومێنتەکە نوسرابوو؛ **بەڵام خەوبینینیش بە شتێکەوە کە ڕێیتێناچێت ناوێکی هەیە، ئێمە بەو شتە دەڵێین 'هیوا'.**

بەسودترین لایەنی دۆزینەوەی نامەکەی باوکم لەو کۆمپیوتەرەدا لەو کاتە بۆم دەرکەوت کە بڕیارمدا ئەم کتێبەی لەگەڵدا بنوسم، چونکە یەکسەر تێکەڵکردنی نوسینەکانی خۆمم لەگەڵ نامەکەی ئەودا هاتە بەرچاو. بەو شێوەیە هەموو پرۆژەکەم هەر زۆر ئاسانترێک بوو وەک لەوەی من مەزەنەم دەکرد، چونکە هەر یەکسەر دەمتوانی بچمە ناو دەکومێنتە کۆنەکەی باوکمەوە و ڕاستەوخۆ بەئارەزووی خۆم شتێک لەپێش یان لەناوەڕاستی یان لەکۆتایی نوسەنەکەی باوکمدا بنوسم. بەو شێوەیەش هەستمدەکرد بەڕاستی کتێبێکم لەگەڵ باوکمدا نوسیوە.

دوای چەند هەوڵێک پرێنتەرە کۆنەکەشم خستەوە ئیش. لەو جۆرانەیە کە پێی دەڵێن 'پرێنتەری دەرزیدار'، شتێکی هەتا بڵێیت

عەنتیکەیە و زۆر ئەترسم کارمەندی نهێنی لە مۆزەخانەی تەکنیکیەوە بێن و بیدزن. ناڵەی هەر لە هەورەگرمە دەچێت و تا لاپەڕەیەک چاپ دەکات چوار خولەکی پێدەچێت. چونکە دەرزیە بچکۆلەکەی دانە دانە لە پیتەکان دەدات، لەوێشەوە بەر ڕۆڵەی ڕەنگەکە دەکەوێت و دواتر ڕەنگەکە دەچێتە سەر کاغەزەکە. یانزە ساڵ لەمەوبەر کە باوکم مرد، ئەم ئامێرە شتێکی مۆدێرن بوو!
لە کاتی ئا ئێستادا دانیشتووم و لەسەر ئەو کۆمپیوتەرە کۆنە شت دەنوسم. مەبەستم لەوەیە ڕێک لەم کاتەدا. دواهەمین شت کە نوسیم ئەمەبوو؛ *لە کاتی ئا ئێستادا دانیشتووم و لەسەر ئەو کۆمپیوتەرە کۆنە شت دەنوسم. مەبەستم لەوەیە ڕێک لەم کاتەدا.*

لەیەکێک لە قەوانەکانی دایکمدا گۆرانیەکی تێدایە ناوی 'قەت لەیاد ناکرێت'ە. هەتا بڵێیت ئەو گۆرانیە بێوێنەیە، چونکە لەوێدا 'ناتالی کول' پێکەوە لەگەڵ باوکە بەناوبانگەکەیدا 'نات کینگ کول' گۆرانی دەڵێن. ڕەمبێکم ئەوە هێندە سەرسورهێنەر نەیەتە بەرگوێ، بەڵام گرنگیەکەی لەوەدایە کە ناتالی کول لەدوای تێپەڕبوونی سی ساڵ بەسەر مردنی باوکیدا ئەو گۆرانیەی لەگەڵدا دەڵێت. وەک لایەنی تەکنیکی شتێکی سەخت نیە. هەر ئەوەندەیە کە ناتالی کول تۆمارە کۆنەکەی باوکی لەپاش چل ساڵ هێناوەتەوە و گۆرانیەکەی خۆی لەسەر تۆمارکردووە. هەروەک ئەوەیە کە دەنگی باوکی گواستبێتەوە سەر 'لاپەڕەیەکی نوێ' و زیندووی کردبێتەوە.
واتە وەک لایەنی تەکنیکی گۆرانی وتن لەگەڵ پیاوێکدا کە نزیکەی سی ساڵیک لەمەوبەر مردووە شتێکی هێندە سەیروسەمەرە نیە. زیاتر لە کارێکی ڕۆحانی دەچێت، بەڵام گۆرانیەکەیان پێکەوە شتێکی نایابە. بەڕاستی 'قەت لەیاد ناکرێت'.

هیچ مەبەستێکم نیە کە زیاترێک بە سەرتاپای ئەم چیرۆکەدا هەڵسووم، بەڵام هێشتا دوو شت ماونەتەوە باسیان لەسەر بکرێت. یەکێکیان وەڵامی ئەو پرسیارە سەختەیە کە باوکم ئاڕاستەی کردم. شتێکی تریش ماوە و نیازمە لەو یەکەیانەوە دەست پێبکەم، چونکە بڕیارمداوە کە دواهەمین نوسراوی ناو ئەم کتێبە دەبێت وەڵامی پرسیارە گرنگەکەی باوکم بێت.
پاشئەوەی بەوریاییەوە کەمێک دەستکاری کۆمپیوتەرە عەنتیکەکە و تابلۆکانمانکرد، دایکم چووە چێشتخانەکەوە بۆ ئەوەی جۆرە سەمونێکی تایبەتیمان بۆ دروستبکات، گویزی هیندی پێوەدەکردن. ئەو دەیزانی کە من زۆر حەزم لەو سەمونەیە، هەربۆیە ڕیک لەو ڕۆژە تایبەتیەدا دروستیکردن. بەڵام مەریەمیش شێتی ئەو جۆرە سەمونانەبوو.
کە بۆن و بەرامەی سەمونی گەرم گەیشتە ژوری دانیشتن، خۆم گەیاندە چێشتخانەکەمان. لەدڵی خۆمدا وتم بەشکم سەمونێکی گەرمم بداتێ. جگەلەوەش پرسیاریک لە مێشکمدابوو و دەمویست لە دایکمی بکەم، دەربارەی بابەتێکی بەجێهێڵراوی ناو چیرۆکەکەی کچەی پرتەقاڵ بوو. دایکم تا ئەو کاتە هێشتا نەیخوێندبووەوە.
هێندە نەبوو شیلەی شەکری کردبوو بە یەک دوو سەمونەوە. لەسەر مێزی نانخواردنەکەش کیسەیەک گوێزی هاڕاوی هندی دانابوو ونەختە نەختە ئەیکرد بەسەر شیلەی شەکرەکەدا.
وتم؛ "ئەی ئەو پیاوەی ناو تیۆتا سپیەکە کێبوو؟"
من هەروا بۆ خۆشی پرسیم، هەروا ویستم کەمێک سەری بکەمەسەر. جگەلەوەش من دەمزانی کە ئەو پیاوە کۆنە دەستگیرانێکی بووە. بەهەرحاڵ لە چیرۆکەکەدا ئاوها بە باوکم دەڵێت.

بەڵام پرسیارەکەم حەپەساندی، لەپێشدا ئاورێکی لێدامەوە و وەک دەڵێن 'ڕەنگی پەڕیبوو'، ئەوجا لەسەر کورسیەکی تەنیشت مێزەکەوە بۆی دانیشت.
هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی؛ "کەواتە باسی ئەوەشی بۆ کردوویت!"
منیش وتم؛ "وابزانم کەمێک غیرەی لێت کردووە"
بۆ ماوەیەک بێدەنگ دانیشتبوو، لەبەرئەوە لێمپرسیەوە؛ "باشە ناتوانیت هەر ئەوەندەم پێبلێیت کە کێ لەناو تیۆتا سپییەکەدابوو؟"
بە نیگایەکی ڕەق و پڕئەندێشەوە سەیرێکی کردم. دەتوت خەریکە بڕیاربدات کە دیوارێکی پۆڵایین ببڕێت.
هەر زۆر بەدەنگێکی کزەوە وتی؛ "یۆرگن بوو"
سەرم گێژی دەخوارد، وتم؛ "یۆرگن؟"
سەرێکی بۆ لەقاندم. زیاترێک سەرم گێژی خوارد. کیسەی گوێزە هندیەکەم هەڵگرت و بەسەر زەویەکەدا پەرش و بڵاوم کردەوە. دواتر کیسەکەم هەڵگێڕایەوە و گوێزی هیندی بەسەر داروبەردی ئەوناوەدا بڵاوبووەوە.
وتم؛ "بەفر ئەبارێت"
دایکم لەسەر کورسیەکە هەڵنەسا. تازە هەموویم بڵاوکردبووەوە و هیچی پێنەدەکرا. هەروا بە ئاسانی وتی؛ "بۆ واتکرد؟"
هاوارمکرد و وتم؛ "چونکە شێت بوویت! دوو دەستگیرانت لە یەک کاتدا هەبووە!"
بەڵام زۆر بەتوندی نکۆڵی لەوە کرد و وتی؛ "بەو شێوەیە نەبوو. لەو ڕۆژەوەی کە 'یان ئۆلاو'م بینی هەر ئەو دەستگیرانم بوو"
هێشتا هەر بۆنی شتێکم دەکرد، بۆنی سەمونەکانیش نەبوو.
وتم؛ "لەو ڕۆژەشەوە کە 'یان ئۆلاو' مرد، ئیتر هەر 'یۆرگن'ت هەبوو ها؟"

وتی؛ "نەء، ئەوەشیان وا نەبوو. چەند ساڵێک تێپەڕی و ئینجا 'یۆرگن'م بینیەوە. لەو چەند ساڵەشدا هەر من و تۆ پێکەوە بووین، خۆ خۆشت ئەوە باش دەزانیت. بەڵام کە 'یۆرگن'م بینیەوە، دیسانەوە دڵم بۆی لێیدایەوە. ماوەیەکی زۆرمان پێچوو تا بڕیارماندا پێکەوە بژین، بەڕاستی ماوەیەکی زۆری پێچوو".

سوکە بەزەییەکم بەو بەچکە تەیرە بەسالاچووەدا دەهاتەوە، هێشتا هەر ڕەنگ زەردبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتم؛ "ئەی بۆم هەیە لێت بپرسم کامیانت زیاترێک خۆشویستووە؟"

بێ سێ و دوو وتی؛ نەخێر، نەخێر بۆت نیە"

تورەنەبوو، بەڵام لەسەر قسەکەی خۆی سوربوو. دواتر دەستیکرد بە گریان.

وازم لەو پرسیارە هێنا بێ وەڵام بمێنێتەوە، ئەوەش شتێک بوو کە لە باوکمەوە فێربووم؛ هیچ مافی ئەوەم نەبوو کە بچمە ناو شتێکەوە کە هی من نەبوو. دەبوایە وریابومایە و زۆر لەو حەکایەتە نزیک نەکەوتمایەتەوە کە یاساکانی پەیوەندیان بە منەوە نەبوو.

بەڵام لە هەمان کاتدا مافی خۆم بوو کە خاوەنی بیرکردنەوەی خۆمبم.

من ئەو قسانەم بەدڵ نەبوو کە بەر گوێم کەوتن، چونکە هەر ئەو پیاوەی ناو تیۆتا سپیەکە لە کۆتایدا بردیەوە. خەتای ئەویش نەبوو. وابزانم خەتای کەس نەبوو، بەڵام پێم خۆشبوو کە باوکم قەت بەوەی نەزانی.

لەڕاستیدا ڕەمبێکم خەتای باوکم بووبێت، چونکە نەیتوانی پەیڕەوی یاساکان بکات. نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێت و شەش مانگێک چاوەڕوانی کچەی پرتەقاڵ بکات. لەبەرئەوە هێندەی پێنەچوو کە

کۆترێکی مردارەوەبووی لەسەر ئاوەڕۆی تەنیش شەقامەکەدا بینی، چ کۆترێکیش.. کۆترێکی سپی.
من بۆ هەمیشە باوکمم وەک کۆترێکی سپی دێتە بەرچاو. بەڵام زۆر دڵنیا نیم و نازانم باوەڕم بە چارەنوس هەیە یان نا. پێشم وانیە باوکم باوەڕی پێ بووبێت. گەر وا بوایە ئەوسا سەرقاڵی تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ نەدەبوو.
پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ لەگەڵ یۆرگن و مەریەمدا سەمونمان بە وردە شوکلاتەوە خوارد. دوو سەمونیش گوێزی هیندی پێوەبوو. مەریەم و یۆرگن خواردیان. چونکە هەستمکرد قەرزاربارڕیانین.

چەند ڕۆژێک بەسەر خواردنی ئەو سەمونانەدا تێپەڕی و من هێشتا خۆم بەسەر کۆمپیوتەرە کۆنەکەدا چەمانۆتەوە. ناچارم وەڵامێکی پرسیارە سەختەکەی باوکم بدەمەوە. من لای خۆمەوە کاتێکی دیاریکراوم بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە داناوە و تا بەیانی دەبێت شتێک بنوسم. تا ئێستاکە ڕێگەم بەکەس نەداوە نامەکەی باوکم بخوێنێتەوە، بەڵام بۆ بەیانی نەنکم و باپیرەم بۆ نانخواردنی ئێوارە دێنە لامان. ئیدی سبەینێ ماوەی وەڵامدانەوەم تەواو دەبێت.
ئەم چەند ڕۆژەی پێشوو بەردەوام هەر بیرم لەو هەڵبژاردنە سەخت و دژوارە دەکردەکەوە کە باوکم خستبوویە بەردەمم. چوار کەڕەت هەموو نامە دورودرێژەکەم خوێندەوە و هەموو کەڕەتێک لەخەیاڵی خۆمدا دەڵێم؛ ئای باوکە بێ بەختەکەم.. باوکە بەستەزمانەکەم. بەڕاستی بەلامەوە حەیفە کە چیتر لێرەدا نیە. بەڵام خۆ ئەو شتەی کە نوسیویەتی هەر پەیوەندی بە خۆیەوە نیە، بەڵکو پەیوەندی بە هەموو مرۆڤەکانی سەرتاپای جیهانەوەیە؛ ئەوانە دەگرێتەوە کە لە

پێش ئێمەدا لێرەبوون، ئەوانەش کە ئێستاکە لەگەڵماندان و ئەوانەش دەگرێتەوە کە لە دوای ئێمەوە دێن.
باوکم نوسیویەتی "تەنها ئەم کەرەتە لەم جیهانەداین". چەند جارێکیش نوسیویەتی تەنها بۆ ماوەیەکی کەم لێرەدا بوونمان هەیە. من بەتەواوەتی دڵنیانیم کە ئەو لایەنە بەهەمان شێوەی ئەو ببینم. من خۆم وا پانزە ساڵە لەم ژیانەدام و بەڕاستی پێموانیە ئەو ساڵانە 'ماوەیەکی کەم' بووبن.
بەڵام وابزانم لە مەبەستی باوکم تێدەگەم. ژیان بەلای ئەو کەسانەوە کورتە کە بەڕاستی هێندە تێدەگەن کە ئەم جیهانە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەتەواوەتی کۆتایی پێدێت. هەموو کەسێک لەو هەقیقەتە تێناگات. هەموو کەسێک لەڕاستیدا نازانێت مانای بەجێهێشتن و ماڵئاوایی هەتاهەتایی چیە. گەلێک شت هەن دەبنە ڕێگرمان و ناهێڵن ئەو هەقیقەتە ببینین، هەر سەعاتێک، هەموو دەقەیەک شتێک دەبێتە ڕێگر.
باوکم لە نامەکەدا دەڵێت؛ "وێنای ئەوەبکە کە کاتی خۆی چەند ملیارد ساڵێک لەمەوبەر، ئەو کاتەی کە هەموو شتێک ئافەریدەکرا، تۆ لەبەردەم ئەم حەکایەتە دابوویتایە. مەزەندەی ئەوە بکە کە بڕیاری لەدایکبوونت بۆ ناو ژیانی ئەم سەر زەویە لەدەستی خۆتدا بوایە. نە دەزانیت کەی دەژیت و نە دەشزانیت بۆ ماوەی چەندێک دەژیت، بەڵام لە هەموو بارێکدا ماوەی ژیانت لە چەند ساڵێک زیاتر تێناپەڕێت. تەنها ئەوەندە دەزانیت ئەگەر بڕیاربدەیت ڕۆژێک لە ڕۆژان بێیتە ناو ئەم ژیانەوە (یان وەک دەڵێن کە 'کات پڕدەبێت' یاخود 'لە کاتی خۆیدا' لەدایک ببیت)، دەبێت بەناچاری ڕۆژێک لە ڕۆژانیش هەموو شتێک بەجێبهێڵیت.."

تا ئێستاش ناتوانم بڕیارێک بدەم. بەڵام وا هێدی هێدی خەریکە لەگەڵ باوکمدا تەبادەبم. ڕەنگە منیش ئەو پێشنیارەم ڕەتبکردایەتەوە و بمگوتایە 'نەء نامەوێت لەدایکبم'. بەسەربردنی کاتێکی کورت لەم ژیانەدا هەر زۆر زۆر کەم دەبێت لەچاو ئەو هەموو کاتە هەتاهەتاییەدا کە لەپێش و لەدوای لەدایکبوونمەوە بوونیان هەیە.
ئەگەر بمزانیبایە شتێک خۆشترین تامی هەیە و ڕێگەیان پێنەدامایە لە میلی گرامێک زیاتر بخەمە دەممەوە، ئەو کاتە بەئەدەبەوە ڕەتم دەکردەوە و دەموت سوپاس ناخۆم.

من ماتەمینیەکی قوڵم لە باوکمەوە بۆ ماوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت ئەم جیهانە جێبهێڵم. هێندەش فێربووم کە 'بیر لە چەند ئێوارەیەکی وەک ئەم ئێوارەیە بکەمەوە کە ڕێگەم پێنادرێت بیان بینم'. بەڵام هەر لە باوکمەوە تێڕوانینێکم بۆ ماوەتەوە و هێندە دەزانم کە ژیان چەندە شتێکی سەرسامە. لە هاویندا کۆمەڵێک لێکۆڵینەوەی ورد لەسەر هەنگە گەورەکان دەکەم (کاتژمێرێکم هەیە کە زۆر بەوردی کات دەژمێرێت و لەو بڕوایەدام بەتەواوەتی خێراییەکانیان بپێوم، جگەلەوەش دەبێت کێشیان بزانم). هیچ لاریەکم لەوەش نیە کە بە مەبەستی پشکنین سەفەرێکی جەنگەڵەکانی ئەفریقا بکەم. لەلایەکی تریشەوە هێندە فێربووم کە تەماشای سەرەوەم بکەم و لەهەموو ئەو شتانەی ئاسمانی بەرین ڕابمێنم کە بە ملیارد ساڵی تیشکی لێمانەوە دورن. من ئەو کاتەی فێری ئەوەبووم هێشتا چوار ساڵم پڕنەکردبووەوە.
بەڵام من ناتوانم لەو شوێنە دورانەوە دەست پێبکەم. لەبەرئەوە دەبێت لە شوێنێکی ترەوە هەوڵی خۆم بدەم و بیکەمە خاڵێکی

سەرەتا. لەوانەیە ناچاربم لەسەر شێوازی تایبەتی خۆم هەڵبژاردنەکەم دەستنیشانبکەم.
ئەگەر چیرۆکی کچەی پرتەقاڵ فیلمێکی سینەمابوایە و منیش لەسەر کورسیەکی دوای دواوە دابنیشتمایە و تەماشامبکردایە، وە بشمزانیبایە لەدایکبوونی من پەیوەستە بە یەکتربینینی 'یان ئۆلاو' و کچەی پرتەقاڵەوە، ئەوا ئەو کاتە بێگومان هوتافم بۆدەکێشان و ئومێدەواردەبووم کە هەروا بەلای یەکتریدا تێنەپەڕن، ئاواتم دەخواست هەست بەیەکتری بکەن. ئەو کاتە دادەنیشتم و دڵم لە مستمدا دەبوو. لەوە دەترسام یەکێکیان کافر بێت و ئامادەی دوعای ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح نەبێت. ڕەمبێکم لەو کاتەدا کە کچەی پرتەقاڵ لەگەڵ پیاوێکی دانیمارکیدا دێتە گۆڕەپانی 'ئەلیانزا'، تێر تێر بەکوڵ بگریامایە. دواتریش کە 'یان ئۆلاو' و کچەی پرتەقاڵ بوونە دەستگیرانی یەکتری، بچوکترین شەڕ و دەمەبۆڵەی نێوانیان لەڕادەبەدەر نیگەرانی دەکردم. چونکە پێیدەچوو شەڕێکی گەورەی نێوانیان دەمودەست ڕەهەندێکی گەردوونی لەسەر من جێبهێڵێت و ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر بوون و نەبوونی من بکردایە.

جیهان! ئەو کاتە قەت لەدایک نەدەبووم و نەدەهاتمە ئێرە.. ئەو کاتە ئەو نهێنیە گەورەیەم بەچاوی خۆم نەدەدی.
گەردوون! قەت قەت نەمدەتوانی تەماشای ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمان بکەم.
خۆر! هەرگیز نەمدەتوانی پێ بخەمە سەر تاشەبەردە گەرمەکانی "تیونسبێرگ"، نەمدەتوانی بەسنگدا خۆم هەڵبەمە ناو ئاوەکەوە و هەست بەو خۆشیە گەورەیە بکەم.

ئێستاکە تێدەگەم.. لەناکاوێکدا لە ئاکامی شتەکان تێدەگەم و دەیانبینم. تەنها ئێستاکە بە ڕۆح و بەگیان لەمانای نەبوون تێدەگەم. ئەوەش واملێدەکات هەست بە سک ئێشەیەکی گەورە بکەم، واملێدەکات هێڵنج بدەم. بەڵام تورەشم دەکات.
تورەدەبم کە بیرلەوە دەکەمەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت بە ناچاری ئەم جیهانە جێبهێڵم ـدەبێت بڕۆم و دوربکەومەوە، بۆ ماوەی حەفتەو دوو حەفتەش نیە، بۆ ماوەی چوار ساڵ و چوارسەد ساڵیش نیە، بەڵکو بۆ هەتاهەتایە دەبێت ماڵئاواییبکەم.
هەستدەکەم بوومەتە قوربانی ساختەکاری و هەڵخڵەتێنراوم. چونکە لە پێشدا کەسێک دێت و دەڵێت؛ فەرموو لەم جیهانەدا بۆ خۆت وەرە و بچۆ و ڕاببوێرە. ئەوە شەقشەقەی تۆیە و ئەوەش قیتاری 'بریۆکەتە، ئەوەش قوتابخانەیە و ئەم پایزە بۆ خۆت دەستبکە بە خوێندن. چرکەیەک دوای ئەوەش هەر ئەو کەسە بەدەم قاقای پێکەنینەوە دەڵێت؛ هاهاها، بەڕاستی هەڵمانخڵەتاندیت! ئیدی هەموو جیهانم لێدەسەندرێتەوە.
هەستدەکەم هەموو شتێک پشتی لێهەڵماڵیوم. هیچ شتێک شکنابەم کە دەستی بدەمێ. هیچ شتێک ناتوانێت ڕزگارم بکات.
من تەنها جیهان لەدەست نادەم، تەنها هەموو شتێک و هەموو کەسێکی تر لەدەست نادەم کە خۆشم دەوێن، بەڵکو خۆشم لەدەستدەدەم.
یەک و دوو ـو وندەبم و تەواو!

زۆر تورەم، هێندە تورەم خەریکە دەڕشێمەوە. چونکە بەچاوی خۆم شەیتانم بینی. بەڵام نامەوێت دوا وشە لە زاری شەیتانەوە بێتە دەرەوە. پێشئەوەی شەیتانی بەد دەسەڵاتم بەسەردا بگرێت، پشتی

لێدەکەم. ژیان هەڵدەبژێرم. ئەو گۆشە بچکۆلەیەی لا باشەکە هەڵدەبژێرم کە پێم دەبەخشرێت، خۆ ڕەنگە شتێکیش هەبێت کە پێی بگوترێت 'باشە'. کێ دەڵێت خوایەک بەسەر هەموو شتەکاندا نەچەماوەتەوە؟

دەزانم شتێکی بەد بوونی هەیە، چونکە گوێم لە سۆناتەی 'تریفە'ی بیتهۆفن بووە. بەڵام هێندەش دەزانم کە شتێکی باشەش بوونی هەیە. دەزانم گوڵێکی قەشەنگ لەنێوان ئەو لایەنە دژبەیەکەدا سەوزدەبێت، پاش نەختێکیش هەنگێکی گەورەی کەیفخۆش لەسەر ئەو گوڵەوە بەرزدەبێتەوە و دەفڕێ.

دەبینن! ئەوە من قسەی خۆمم کرد. خۆشبەختانە ئاوازێکی خێرای خۆشیش (ئەلیگریتۆ) لەم پەیوەندیەدا بوونی هەیە. لەنێوان ئەو دوو تراجیدیایەدا بەشێکی مەکراوی شانۆگەریەکی بوکەڵە نمایش دەکرێت، منیش دەمەویت ئەو نمایشەم لە کیس نەچێت و بیبینم. من ئامادەم هەموو شتێکم وەک گرەوێک لەسەر بەشی دووهەمی ئەو شانۆگەریە دابنێم! شتێک هەیە پێی دەڵێن 'ئیشتیهای ژیان'، من دوای ئەوە دەکەوم و واز لەو دوو لایەنە دژبەیەکە دەهێنم و نامەوێت بیانبینم. بوونیان نیە، بەلای منەوە بوونیان نیە. تەنها شتێک کە بوونی هەیە ئاوازێکی دڵفڕێنی خێرایە (ئەلیگریتۆ).

پێم وایە ڕێک لەم کاتەدا بەشێوەیەکی ژیرانە بیردەکەمەوە، من خۆم دان بەوەدا دەنێم. 'فرانز لیست'بوو کە ناوی "گوڵێک لە نێوان دوو لایەنی دژبەیەک'دای بەسەر بەشی دووهەمی سۆناتەی تریفەدا داهێنا. ڕێک لەم کاتەدا هەستدەکەم توانیبێتم لە تەواوی گێژاوە گەورەکەی 'لیست'دا بێمەدەرەوە.

وادیسانەوە هەوڵدەدەم چەند ملیارد ساڵێک بگەڕێمەوە دواوە. هەر ئێستاکە دەبێت بڕیاری خۆم بدەم و یان ئەوە هەڵببژێرم کە پاش

چەند سەد ملیۆن ساڵێک لەسەر زەویدا لەدایک ببم، یاخود ئەوەیان هەڵببژێرم کە لەدایک نەبم، چونکە یاساکانم پێ قبوڵ ناکرێت. بەڵام ئێستاکە هەر هیچ نەبێت هێندە دەزانم کە چ کەسێک دەبێتە دایک و باوکم. ئێستاکە دەزانم ئەو چیرۆکە بە چ شێوەیەک دەستی پێکردووە. ئەوەش دەزانم کە لەداهاتوودا کامیانم خۆشدەوێت.
هەنوکە کاتی وەڵامەکەمە. ئێستاکە ئەو هەڵبژاردنە پڕشکۆیە دەست نیشاندەکەم. من دەنوسم؛

باوکی ئازیزم! زۆر سوپاست دەکەم کە ئەو نامەیەت بۆ ناردم. نامەکەت هەژاندمی و لەلایەکەوە بووە مایەی دڵخۆشیم و لەلایەکی تریشەوە ئازاریدام. بەڵام وا سەئەنجام بڕیاری خۆممدا و یەکیک لە هەڵبژاردنە سەختەکان دەستنیشان دەکەم. لەسەدا سەد دڵنیام کە ژیانی سەر زەویم هەڵدەبژارد، هەرچەندە بۆ 'ماوەیەکی کەم'یش بێت. ئیدی لە ئێستا بەدواوە دەتوانیت ئارامبیت و چیتر لەو بارەیەوە خەمت نەبێت. هەرووەک دەڵین 'بۆ هەتاهەتایە بێخەم پاڵکەوە'. سوپاست دەکەم کە تاسەر دوای کچەی پرتەقاڵ کەوتیت!
دایکم ئا ئێستاکە لە چێشتخانەکەماندایە و خواردنی ئێوارە ئامادە دەکات. ئەو دەڵێت خواردنێکی فەرەنسی لێدەنێم. بەم زوانەش یۆرگن لە وەرزشی ڕاکردنەکەی دێتەوە کە خۆی ناوی ناوە 'ڕاکردنی ڕۆژی شەممان' و مەریەمیش خەوتووە. ئەمرۆ 17ی مانگی یانزەیە و تەنها پێنج حەفتەی ماوە بۆ جەژنی لەدایکبوونی مەسیح.

چەند پرسیارێکی سەرنجراکێشت دەربارەی تەلیسکۆبەکەی هۆبڵ لێکردبووم، لەڕاستیدا هێندە نابێت من پڕۆژەیەکی تایبەتی گەورەم لەسەر ئەو تەلیسکۆبە نوسیووە!!!

لێرەدا دەمەوێت نهێنیەکی گەورەت بۆ بدرکێنم؛ پێموابێت دەزانم چ دیاریەکم لە جەژندا دەدەنێ! یۆرگن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ چەند شتێک کرد، بەلایەنی کەمەوە چەند وێنەیەکی نایابی ناو ڕۆژنامەیەکی نیشاندام.. بەکورتی بیڵێم؛ سوکە گومانێکم هەیە کە تەلیسکۆبێکم بەدیاری بۆ دەکڕن! گەر وابێت، هەر زۆر زۆر خۆشدەبێت. یۆرگن خۆی هەرچەندە کە باوکی ڕاستەقینەشم نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرۆژەکەمی خوێندەوە، لەڕاستیدا دوو جاریش خوێندیەوە و وتی شانازیت پێوەدەکەم. وابزانم منی هێندەی مەریەم خۆشدەوێت، یان بەلایەنی کەمەوە تاڕادەیەک وەک ئەو منیشی خۆشدەوێت، بەڕاستیش بیڵێم من لەوەندە زیاتر داوای چی لێبکەم. منیش لەلای خۆمەوە تاڕادەیەک هەروەک باوکی ڕاستەقینەی خۆم ڕێزی لێدەگرم.

ئەگەر بۆ دیاری جەژن تەلیسکۆبێکم بۆ بکڕن، ئەوا لەگەڵ خۆمدا دەیبەم بۆ "فێلستیۆلن"، چونکە ئەم پانتاییەی ئێرە وەک ئەستێرەناسەکان دەڵێن حاڵەتێکی زۆری 'پیسبوونی بینایی' تێدایە. من هەر لە ئێستاوە ناوێکم بۆ تەلیسکۆبەکە دۆزیوەتەوە. ناوی دەنێم تەلیسکۆبی 'یان ئۆلاو'! بێگومان بەلای یۆرگنەوە ناوێکی سەیر دەبێت، بەڵام ئەگەر بیەوێت وەک دوو برادەر بمێنینەوە، ئەوا ناچارە بەو ناوە ڕازیبێت.

کاتێک کە مانگە شەو نابێت ئاسمانی "فێلستیۆلن" پڕدەبێت لە ئەستێرە، هێندە زۆرن کە ڕەنگە پرسیارمان لادروستبکەن و بڵێین ئەرێ بەڕاستی ئێمە چ پێویستیەکمان بە تەلیسکۆبێکی ئاسمان بوو؟ بەڵێ، بەڵێ، بابە، لەڕاستیدا کەسێکی بێ ئەقڵ نیم. من دەزانم کە ئەستێرەکانی گەردوون نادرەوشێنەوە! بەڵام جارجارێک خۆشە بۆ ماوەی یەک دوو چرکەیەک لەژێر ئاوی مەلەوانگەیەکدا پاڵکەویت و

تەماشای سەرەوەی ئاوەکە بکەیت. شتێک هەر دەبینین، بێگومان دەشتوانین ئەو شتە هەڵبێنین کە بەسەر ئاوەکەوە دەجولێتەوە. بەهەرحاڵ تاراپادەیەک بەرونی چالو چۆڵیەکانی سەر مانگ دەبینرێن، هەروەها مانگەکانی 'جوپیتەر' و بازنەکانی چواردەوری 'مارس'یش دیارن. ئێ ئیدی هەر ئەوەندە ماوەتەوە کە لەداهاتوودا سواری کەشتیەکی ئاسمانی ڕاستەقینەببم!
سلاوی خۆشەویستانە جۆرج کە تا ئێستاکەش هەر لە 'هوملەفای'دا دەژی و دەزانێت کە شتێکی نایابی لەباوانەوە بۆماوەتەوە و لەسەر ڕێڕەوی بابی دەڕوات.

تێبینی؛ پاشئەوەی کە نامە دورودێژەکەتم خوێندەوە، هەستدەکەم بوێرم لەماوەی داهاتوودا کەمێک کچەی کەمانچەژەن بدوێنم. ڕەنگە هەر ئەم دووشەمەیە قسەی لەگەڵدا بکەم. بەلایەنی کەمەوە ئێستاکە چەندەها بابەتی گەورەم پێیە کە لە سەریان بدوێم. لەوانەشە کەمانچەکەیم نیشانبدات.

وا دایکمم بانگکرد و هاتە ژورەوە بۆ لام. هاوکات لەگەڵ نوسینی ئەم دێڕەدا، نامەکەی باوکمم دایە. نوسراوە کۆنەکەم پێبەخشی و وتم؛ "ئێستاکە دەتوانیت نامەکەی باوکم بخوێنیتەوە"
بۆ کتێبەکەش کە لەگەڵ باوکمدا نوسیومە، گەر بیەوێت دەتوانێت ڕۆژێکی تر بیخوێنێتەوە. بەلایەنی کەمەوە دەبێت تا دوای جەژنی لەدایکبوونی مەسیح چاوەڕوانبێت، وە ئەوەش بەو مەرجەی کە تەلیسکۆبێکم بەدیاری بۆ بکرن، خۆ من هەر لە ئێستاوە ناوی تەلیسکۆبەکەی 'یان ئۆلاو'م لە چیرۆکەکەدا نوسیووە.

کەمێک لەوە دەترسم کە نهێنی کچەی کەمانچەژەنیان بۆ دەرکەوێت، بەڵام هێندە زۆر نا. کەمێکیش لەوە دەترسم کە دایکم و یۆرگن دەربارەی ئەو شەوە بخوێننەوە کە لە ژوری نوستنەکەدا دەستبازیان دەکرد. بەڵام تەنها کەمێک دەترسم.

دایکم نامە کۆنەکەی باوکمی برد و لەسەر قەنەفە چەرمە زەردەکە دانیشت. وتی 'دەمەوێت بەرلەوەی یۆرگن لە ڕاکردنەکەی بێتەوە چاوێکی پێدا بخشێنم'. منیش پەیمانم پێدا کە لە چواردەوری بم، ئائێستاکە دەتوانم لە درزی دەرگا کراوەکەوە ببینم. جارجارێکیش گوێم لێیە لوشکەلوشکێکی بۆ دەکات. بەلای منەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە هێشتا بەتەواوەتی 'یان ئۆلاو'ی لەیاد نەکردووە.
بەڵام هێشتا هەر دەنوسم، چونکە تێبینیەکم ماوە و دەمەوێت ئەویش بنوسم، ئەم تێبینیە بۆ تۆشە کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە. تەنها تێبینیەکی بچکۆلەیە و هیچی تر؛
لەدایک و باوکت بپرسە و بزانە بە چ شێوەیەک کاتی خۆی یەکتریان دیووە. ڕەنگە لەو بارەیەوە چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشت بۆ بگێڕنەوە. بەڕاست.. باشترێکە لە هەردووکیان بپرسیت، چونکە مەرج نیە کتومت هەمان چیرۆکت بۆ بگێڕنەوە.
سەریشت لەوە نەسوڕمێت گەر لە ناکاودا شەرم دایانبگرێت، وابزانم ئەوە شتێکی هەر زۆر ئاساییە. قەت ڕێناکەوێت ئەو جۆرە چیرۆکانە پڕاوپڕ وەک یەکبن، بەڵام وامن خەریکە هێندە تێدەگەم کە ئەو جۆرە چیرۆکانە کەم تازۆر چەند یاسایەکی هەستیاری هەیە و ڕەنگە قسەکردن لەسەریان هێندە ئاسان نەبێت. لەوانەشە وا باشتربێت کە هێندە زۆر لەو یاسایانە نزیکنەبیتەوە. هەمیشە هەروا بەئاسانی

ناتوانین بە وشە دەریانببڕین، بەدەرلەوەش شتێکمان هەیە کە پێی دەڵێین "ڕاگرتنی هەست و نەستی خەڵکانی تر".
من وای بۆ دەچم هەتاوەکو وردەکاری لەو چیرۆکانەدا زۆرتریک بێت، زیاتر و زۆرتر بە پەرۆشەوە گوێی بۆ شلبکرێت، چونکە گەر تەنها شتەکان کەمێک جیاوازتربوونایە لەوەی کە ڕویداوە، تۆ قەت لەدایک نەدەبوویت! گرەودەکەم بە هەزاران شتی بچکۆلە هەیە کە دەکرا ببێتە هۆی ئەوەی هەموو شتێک بەشێوەیەکی جیاوازتر ڕوویبدایە، هێندە جیاواز کە تۆ بەهیچ جۆرێک شەنسی ئەوەت نەدەبوو کە لەدایک ببیت.
یان هەروەک حیکمەتەکەی باوکم دەڵێت؛ ژیان یانسیبێکی گەورەیە و تەنها ژمارە براوەکانی لەبەرچاون.
تۆش کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، ژمارەیەکی براوەی ئاوهایت. چەندە بەختەوەریت!